# یاساکانی ژیان

بۆ دوورکەوتنەوە لە دوودڵی و دەستکردنەوە بەژیان





نوسینی: دیل کارنگی

وەرگێرانی: هیوا محەمەد

DALE CARNEGIE

چاپی سێیەم

2014

# یاساکانی ژیان

## بۆدوورکەوتنەوە لە دوودڵی و دەستکردنەوە بەژیان

نوسینی: دیل کارنگی

وەرگێڕانی: هیوا محمد



چاپی سێیەم

٢٠١٤

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە(١٤٩)

**ناسنامەی کتێب**

- ناوی کتێب: یاساکانی ژیان
- بابەت: دەروونی
- نوسینی: دیل کارنگی
- وەرگێڕانی: هیوا محمد
- دیزاین و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤ سلێمانی
- نۆرەی چاپ: چاپی سێیەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١٤٧٦)ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە

ناونیشان: سلێمانی ــــ بازاڕی سلێمانی ــــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

## پێشەکی نووسەر

## بۆچی ئەم کتێبەم نووسیو بۆچ کەسانێک؟

نزیکی سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە ناو هاوڕێیاندا بە یەکێک لە نائومێدترین و خەمبار ترین کەس دەژمێردرام. چونکە تەنیا ئۆتۆمبیلەکەم شک دەبرد، ئەویشم بۆ گوزەرانی ژیان فرۆشتبوو. لەگەڵ ئەوەدا کە شارەزاییەکی زۆرم لە شۆفێریدا نەبوو،نەمدەتوانی بەباشی لێ بخورم نازانم چ هۆیەکی هەبوو بەردەوام دەمویست جارێکی تر هەمبێت. کارێکی زۆر باشم نەبوو، لەم ڕووەوە لە یەکێک لە گەڕەکە هەژار نشینەکانی شارو لە خانوویەکی هەژارانەدا دەژیام کە لە شەقامی ٥٦ی ناری نیۆیۆرک هەڵکەوتبوو. خانوویەک کە شەوانەم بە هێرشی قالۆنچەکان دەگەیاندە بەیانی. باش لە بیرمە هەرگیز نەمدەتوانی جلەکانم بە ئاوێنەی سەر دیوارەکەدا هەڵواسم، چونکە دەترسام قالۆنچە بچێتەناوی. لەوانەیە بەلاتانەوە سەیربێت و بڕوام پێنەکەن، بەڵام هەموو ڕۆژێک بەیانی کەدەچووم بۆ ئیش یەک دوو دانە قالۆنچە لە جل یاله پێڵاوەکانمدا نەدۆزییەوە.

بەهۆی ژیانی کولەمەرگی و بێ توانایی لە کڕیندا هەمیشە خواردنی هەرزان باییم دەکڕی و دەمخوارد یا خود لە ڕیستۆرانتە هەرزانەکان نانم دەخوارد. شوێن گەلێک کە دیسان لەوێش هاوڕێی مێش و مەگەز بووم.

بەم بارو دۆخەو بینینی ئەم وەزعە هەمیشە خەمبارو بێ تاقەت بووم و کاتێک دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە لە تاو بێ تاقەتی و نائومێدی لە ژیان تووشی ژانە سەر دەهاتم. ژانە سەرەکانم بەهۆی هیوا بێ ئەنجامەکان، نیگەرانیی داهاتوو وئەو بەدبەختی و سەختییەوە بوو کە تووشی بووم.

لەڕاستیدا دەشێ بگوترێت بەد بەختێکی تەواو بووم و ژیانی من داستانێکی خەماوی هەبوو کە ئاواتم دەخواست خۆزگە دیسان دەگەڕامەوە بۆ دەورانی خوێندن تاکو شەوانی خۆشی ڕابردووم هەبێت. بەو حاڵەوە بارو دۆخم بە جۆرێک بوو کە ئاواتی ئەو ڕۆژانەم دەخواست. بەردەوام نەفرەتم لە خۆم دەکرد گەر ئائەمە ناو بنێم

ژیان؟ ئایا من دەبێ شایستەی ئەم ژیانە بم؟ ژیان بۆ من مانایەك لە بەدبەختیو سەختی زیاتری نەبوو. تەنیا دەمزانی دەبێ وەكو ئامێرێكی قورمیش كراو یان رۆبۆت كار بكەم تاكو بتوانم لەسەر پێی خۆم راوەستم. ژیانی هەژارانە لەگەڵ دەعباو مەلو مۆر، خواردنێكی سادەو تەنها چاوەڕوانی داهاتوو. هەمیشە نیگەرانی ئەوە بووم داهاتوومو رۆژانی دواییم چۆن دەبێت... لێرەوە بوو كە بڕیارمدا بۆ زاڵ بوون بەسەر بێ تاقەتیو نیگەرانیەكانمدا بەسەر هاتی خەمباری خۆم بنوسمەوە. دەستم كرد بە نوسینو هەروەك بڵێی گەڕابێتمەوە بۆ دەورانی ڕابردووم...

لەبیرمە هەموو شتێكم دەویست، بەڵام هیچم بەدەست نەدەهێنا، بەڵام بەهەر حاڵ هیچم لەدەست نەئەدا. بە دەست پێكردنی نوسین گۆڕانێك لە ژیانمدا دروست بوو، ماوەیەك سەرەڕای نەداریو هەژاریم بەورەوە دەچوم بۆ ئیش. دەرماڵەیەكی زۆرم نەبوو، بەو حاڵەوە ئاواتەكانم زۆر بوون. لە ماوەیەكی كەمدا شوێنم گواستەوە چوم بۆ گەڕەكی ڕابیكۆن. خەڵكی ئەوێ وادیار بوو گەلێكی تازە پیگەیشتوو بوونو دەیان ویست شێوازێكی نوێ لە ژیاندا بنەخشێنن. بەم بارودۆخەوە بڕیاری كۆتایی خۆم دابوو. بڕیارێك كە دەیتوانی هەڵبژاردنێكی گرنگ بێت لە دارشتنی ژیانی داهاتوومدا. ئەو شتەی لە بیرم بوو ئەوە بوو كە لە ماوەی سیوپێنج ساڵی ڕابردوومدا بەردەوام كارم كرد، ژیانێكی زۆر سەختو هەژارانەم هەبوو، بێ ئومێدیش بە تەواوی هێزەوە تەونە جاڵجاڵۆكەییەكانی خۆی بە سەر ژیانو گوزەرانی ڕۆحیو دەرونی مندا كێشایەوە. دەمویست خۆم بگۆڕمو خۆم بدۆزمەوەو لەم ژیانە ڕزگارم بێت. بڕیارەكەم ئەمەبوو: دەبێ كارێكی نوێ بدۆزمەوە. لانی كەم كارێك كە بتوانێت تێكەڵ بە كاری فەرهەنگو لێكۆڵینەوە بێت چەند سەنتێكیش دەرماڵەكەم زیاد بكات. چوار ساڵ خوێندنی باڵام هەبوو، دەبوایە بەهرە لەو زانستە وەربگرم.نامەم نوسی بۆ فێرگەكانی وار نزبۆرگو میسوریو داوای كارم كرد. بڕیارم وابوو سەرەڕای كاری ڕۆژانە لە خولەشەوانەكان بۆ گەورە تەمەنەكاندا بەشداری بكەمو وانە بڵێمەوە. بەم حاڵەوە هێشتا دەرفەتم هەبوو چەند كاتژمێرێك لە ڕۆژ یان لە هەفتە بۆ نوسین تەرخان بكەم. بە دەسكەوتنی دەرماڵەیەكی زیادەو كاری نوێ توانیم كاری پەروەردەیی بگرمەبەر. لەكاتی وانە كانمدا وتاربێژیی سەربەخۆم دەكردو كورتە چیرۆكیشم دەنووسی. چیتر دەمویست ژیانێكی جیاوازم هەبێت جۆرێك ژیان هاو هەنگاوبێت لەگەڵ نوسین.واتە

له ڕاستیدا: (( ژیان به نووسین و نووسین له ژیاندا)) ببوه سەر مەشقی من. لەوانەیە ئەم پرسیارەتان لادروست بێت لە فێرگە شەوانەکاندا وانەی چیم دەوتەوە. من لەڕاستیدا گەڕابومەوە بۆ ڕابردوو، هەرچی لە زانکۆ فێربووبووم بۆ ئەوان باسم دەکرد. لە ماوەی ئەم کاروهەولانەدا بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێك ڕاستی ژیان کەخۆم ئاگاداریان بووبووم، بەلام نەمگرتبوونە بەر، کوت و پڕ بەرەو ڕووی بارو دۆخێك بوومەوە کە بۆ من خاڵی وەرچەرخان بوو. من قسەم بۆ خەڵك دەکرد، ئامۆژگاریم دەکردن، باسم لە ڕێگە سادەکانی بازرگانی دەکردو هەموو ئەو شتانەی فێریان ببوم لە ژیاندا هەستم پێکردبوو، بۆ فێرکارەکانم باس دەکرد. لە ڕاستیدا هەنگاوێکی سەرنج ڕاکێش و لە هەمان کاتدا هەژێنەرم لە دنیای زانستی ئەزموونکاری و زانستیدا هەڵدەگرت.

لەم بارو دۆخەدا بووم کە پرسیارم لە خۆم کرد: بۆچی؟ بەڵێ، خۆ کەوتبووم و چیتر دەمزانی ئەو شتانەی بۆ خەڵکی دەگوێزمەوە دەتوانم لە ژیانی خۆیشمدا سوودی لێ وەرگرم. بە شێوەی باو فێربووین کەسانی تر کاریگەریان لە سەرمان هەبێت و ئەو شتەی پێیان دەڵێن، بیکەینە کار. لە حاڵێکدا زۆرێك لەم ئەزمونانەمان لە ژیانی خۆماندا تەجرەبە کردووە و توانای فێربوونیانمان هەیە. تەنیا دەبێ تۆزێك داهاتوو بین بین و بڕوامان بەو شتە هەبێت کە هەمانەو بیخەینەکار. بڕیارم دا ژیانم بگۆڕم. بەم جۆرە توانیم سنورو توانای ژیان دیاری بکەم و هەروەها سنووری تواناکانی خۆیشم هەڵسەنگێنم.

بە گشتی هەر لەم خاڵەوەیە بیرو بۆچونی نوێ وەکو ئەستێرەیەکی خێرا کە لە یەك ساتدا دەبینرێت و گوم دەبێت، خۆی لە ئاسمانی عەقڵی مرۆیدا پیشان ئەدات.

کارەکانی ترم ئەوەندە کاریگەر بوو، لایەنگرانێکی باشم پەیدا کرد لە فێرگەکانی تریشدا داواکاریم پێگەیشت. لەم ناوەدا لە لایەن زانکۆی کۆلۆمبیا و نیویۆرکەوە بانگهێشت کرام، بەلام نەمدەتوانی بچم بۆ ئەم زانکۆیانە، نە لە بواری ڕێگەوەو نە لە بواری بارو دۆخی کارو ڕادەی خوێندنەوە توانای مانەوەم لەو هەل و مەرجانەدا نەبوو. لەوانەیشە هەمبوو بێت، بەلام شەهامەتی ئەوەم نەئەدا بە خۆم، تا ئەوەی بەڵێنی باشیان لە یارمەتیدانمدا پێدام.

بەڕاستیش وتەی گەورەکان باش جێی خۆی دەگرێت کە :((کاتێك بێ هیوایت و هەست دەکەیت تەواوی دەرگاکان بە ڕوتدا داخراوە، خودا دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆی بە ڕووی بەندەکانیدا دەکاتەوە)). بەم حاڵەوە کە داوا کاری زۆرم هەبوو لە خوێندنگەی شەوانەی YMKA وەکو مامۆستا دامەزرام.

لە هەندێك لە کۆنسێرتەکان و کۆڕەکاندا داوا لەمن دەکرا سەبارەت بە بابەتی کۆمەڵایەتی و بڕوابەخۆ بوون قسە بۆ خەڵك بکەم. ئایا بەڕاستی ئەم هەل و مەرجە جێی سەرنج نەبوو! زۆرێك لە فێرکارەکانم تەمەن گەورە بوون و دەیان ویست لە ڕێگایەکدا کە هەڵیان بژاردووە سەرکەوتوو بن و بەشێك لەوان بەڕاستی باری کۆمەڵایەتی باشیان هەبوو. زۆربەی ئەوان دەیانوت لە ژیانیاندا کێشەو نیگەرانی گەلێکیان هەیە کە بە قسەکانی من دەتوانن ڕێگەی زاڵ بوون بەسەر بێ ئاسوێیی و نیگەرانیەکانیاندا بدۆزنەوە. تەنانەت کار گەیشتبووە ڕاددەیەك کەوانەکانی من ببو بە هۆڵی کۆڕو کۆبوونەوە و زۆرێك لە خوازیاران بە پێوە گوێیان بۆ قسەکانم ڕادەگرت و تەنانەت هەندێك پێیان خۆش بوو چەند خولەکێك لە گەڵ مندا دیدار بکەن. تەنانەت بارو دۆخەکە گەیشتبووە ڕادەیەك کە کاتی کاری خۆم لە ڕۆژدا بەسەر سێ بەشدا جیا کردبۆوەوە و لەملاولا وتار بێژیم دەکرد.

زۆرێك لە کەسانی شارەزاو سەرکەوتوو لە بازرگانیدا داوایان لە من دەکرد چەند خولەکێك لە گەڵیاندا قسە بکەم. لە ڕاستیدا دەبێ دانی پیانێم کە بارو دۆخ و ژیانی من بەرەو پێش چوو بوو، لە قۆناغێکی تردا هەنگاوم هەڵدەگرت. وەکو ڕابەرو ڕێنمای ڕاستییەکانی دنیای بازرگانی ناوبانگم دەرکردبوو. زۆرێك لە بنەماڵە ناسراو و دەوڵەمەندەکانیش داوای کاتی دیداریان دەکردو بە پارەیەکی باش و بەر چاو پێیان خۆش بوو لە بەر دەستیاندا بم. ئەگەر چی دەرماڵەیەکی باشم هەبوو بەڵام زەنگین و خەنی نەبوو بووم. بەو حاڵەوە وەکو ڕابردوو کێشەیەکی تایبەتیم نەبوو بارو دۆخی ڕابردووم لە خۆم دوور خستبووەوە. هەرچی دەمویست دەمکڕی و دەمخوارد.

لە پاش ماوەیەك وەکو مامۆستاو فێرکارێکی لێهاتوو شاگردانێکیشم هەبوو. ئێستا لە ڕاستی ژیان تێگەیشتم.بەوەی کە دەبێ هەوڵ بدەین و فێر ببین و ئەو شتەی فێردەبین بیخەینە کار. من ببوومە مۆدێلێکی دیارو بەر چاوی فێرکارەکانم. یارمەتی ئەوانم ئەدا بەسەر بێ هیوایی و نیگەرانیەکانیاندا زاڵ بن. ڕێگەی ژیان و مانەوەو

دەوامی خۆمو ئینسانەکانم فێردەکرد. کارێکی خۆشم هەبوو، خۆشم دەویست. زۆرێك لە کەسانی ناسراو و زەنگین یان بازرگانانی سەرکەوتوو بە پارەیەکی باشو بەرچاو دەرسیان لە من وەردەگرت. وانەکانم لە هەر شوێنێك بەرپا دەبوو، هۆگران لە وانەو کۆنفرانسەکاندا بەشداریان دەکرد. لەماوەی سێ دەورەدا بوو کەکرێاری تایبەتم دۆزییەوە و لەم نێوەنەشدا YMCA بۆ ئەوەی من لەدەست نەدات بۆ هەر وانەیەکی شەوانەی پێنج دۆلاری ئەدا بە من. زۆری پێ نەچوو ئەم برە بۆ سێ دۆلار لەشەودا زیادی کرد. ئەم برە لەو کاتەدا دەرماڵەیەکی زۆر باش بوو.لەهەمان کاتدا دۆستانو کەسانی دەست ڕۆیشتووم پەیدا کردبوو.دەستم کرد بەنوسینی ووتارەکانم و چەند کتێبێکم چاپ کرد. یەکەم کتێب کەنوسیم ناوی (( چۆن لەلای هاوڕێیان گرنگ بینو لەسەر خەڵك کاریگەربین)) بوو.

لە پاش ماوەیەك کە ئەم کتێبە فرۆشراو مەلزەمەکانیش لە وانەکاندا فرۆشران، چیتر هەموان ئارەزوو مەند بوون کتێبەکانم بە دەست بێنن.

بە جدییەتی تەواوەوە خەریکی نووسین بوومو لە ماوەیەکی کەمدا چوار کتێبم نووسی. کتێبەکانم لە کەناری ڕۆمانو کتێبە دراماتیکەکاندا بە باشی دەفرۆشرا. ئیتر ببووم بەکەسێك کە ژیانم لە ڕێگەی پارەی نووسینەکانمەوە بەباشی بەڕێوە دەچوو. بووبوومە نوسەرێکی بەناو بانگ.چەند ساڵێك ڕابوورد، تاکو سەر ئەنجام گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ئەزموونی ژیانی خۆم بۆ خەڵك بنووسمەوە. بەڕاستی ئەرکی مرۆیی من بوو سەبارەت بە نیگەرانی شتێك بنووسم. نیگەرانیو دڵە ڕاوکێ بەشێك بوون لە ژیان کە دەبوا سەبارەت بەوە قسەم بۆ ئارەزوو مەندانو فێرکارانم بکردایە.

سەرەتا ئەوەم وەکو دیاردەیەك لە بەرچاو گرت، بەوردی بیرم لێ کردەوەو دەستم کرد بە نوسینی. زۆرێك لە ژنانی خێزانداراو زۆربەی سیاسەتمەداران شۆڕشگێڕان پێویستیان بەوە بوو ڕێگاکانی زاڵ بوونو سەرکەوتن بەسەر نیگەرانیدا بدۆزنەوە. ئەوە بوو کە بە گەشت بۆ نیۆیۆرك بڕیارمدا بە وردی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە بکەمو کاریگەری پێویست بخوڵقێنم. ئەم جارە گەشتی من بۆ شەقامی ٦٥ نەبوو، بەڵکو دەمتوانی لە شەقامی ٤٢ بژیمو دووری خۆم لەگەڵ کتێبخانەی نەتەوەیی شارەکە لە شەقامی ٥ بوو بگەیەنمە کەمترین دووری. لەم ناوەدا ڕابردووی خۆم فەرامۆش نەدەکرد. لەو پەڕی نەهاتیو داماوییەوە گەیشتبوومە لووتکەی ڕەحمەتو

ئەركی خۆم بوو ئەو شتەی خۆم تەجرەبەم كردووە كەسانی تریش فێر بكەم. كاتێك لە كتێبخانە سەرگەرمی لێكۆڵینەوە بووم نزیكی بیست كتێب لە بواری نیگەرانی و دڵەڕاوكێدا نووسرابوون و هەڵگیرا بوون. گرنگترین كتێب كە سەرنجی منی ڕاكێشاكتێبی (( نۆ كرمی بچوك بەڵام كاریگەر لە دروستبوونی نیگەرانیدا )) بوو. لەم كتێبەدا ئاماژە بۆ بابەتە سەرەكییە نیگەرانی سازەكان كراوە. ئەو شتەی لە ژیانی خەڵكدا دەركەوتبوو، دەبووە هۆی ئازاری مێشكی ئەوان، شتانێكی هەست پێكراوی ناو ژیان بوو. لەم ڕووەوە بیرم لەم بابەتانە كردەوەو ئەم كتێبەی بەر دەستم نوسی. سەرەتا ناوی ئەم كتێبەم بە (( چۆن بەسەر نیگەرانیدا زاڵ بین )) هەڵبژارد، بەڵام بە ڕاوێژ لەگەڵ ناوەندی بڵاو كردنەوەكەی لە نیۆیۆرك ئەم ناوەم هەڵبژارد.

هیوادارم ئەم كتێبە كە خاڵی تایبەتی سەبارەت بە تەوەرەكانی ژیان تیایەو دەتوانێت ڕەهەندی كێشەكانی ئێوەی خوێنەر بێت، وەكو هەموو كتێبەكانم سەركەوتوو بێت. بە ئاماژەی زانای فەلسەفە (( والیری )) فەرەنسی كە دەڵێت: ((زانست كلیلی دەرگاكانی سەركەوتنە، بەڵام تاقیكردنەوەش ئاڵو گۆڕێكی زانستییە لە سەركەوتن و بەدەستهێنانی )).

ئێوەیش لە ژیانی خۆتاندا لە پەنای دەسكەوتنی زانست لە ڕێگەی كتێبەوە. بە پاڵپشتی ئەزمونەكانتان ئاڵ و گۆڕی پێویست لە دەستخستنی سەركەوتندا دروست بكەن و لە ژیاندا هەمیشە شادمان، پڕ ووزەو كاریگەربن بۆ خۆتان و كەسانی تر.

لەوانەیە ئێوە بەخوێندنەوەی ئەم كتێبە دایخەن و لایبەن، بەڵام پاشان سەیری قۆناغەكانی ژیان و ئەو كاریگەریانەی هەی بووە بكەن. لە هەر حاڵدا ئەمە دیارە كە دەتوانێت بە سوود بێت بۆتان. ئەگەر لە سەرەتاوە حەزتان لە خوێندنەوەی ئەم كتێبە نیەو بۆتان تاقەت پڕوكێنە،پێشنیار دەكەم بابەتی پێنجەم لە بەشی دووەمی كتێبەكە بخوێننەوە. ئەو كاتە بۆتان ڕوون دەبێتەوە ئەم كتێبە بەدوای چییەوەیەو چۆن دەتوانێ بەسوود بێ بۆتان.

من بڕوام هەیەو هەست دەكەم بەخوێندنەوەی ئەم كتێبە هێزێكی نوێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی گرفتەكانی ژیان لە خۆتاندا هەست پێدەكەن و ژیان بەتەواوی نیشانەكانییەوە بەشێوەیەكی نوێ بەرچاوتان دەكەوێت.

ئێوه بەرەو بارودۆخێك هان ئەدات كە دەڵێی تازە لە دایك بوون و توانای ئەوەتان هەیە بە نیگەرانی بڵێن: بووەستەو! چێژی ژیان هەست پێبكەن. كەواتە تا دەتوانن ئەم كتێبە بە وردی بخوێننەوە، لەوانەیە تەواو بۆتان نەیەتە پێش، بەڵام بە سوود دەبێت و پێشنیار دەكەم بۆ كەسانی تریشی بكەنە دیاری.

دیل كارنگی/ نیویۆرك

ژووەنی ١٩٤٨

# بابەتی یەکەم

## ژیان لە (( خانەی ڕۆژی بەدبەختیدا))

لەبەهاری ساڵی ١٨٧١دا پیاوێکی لاوکتێبەکانی هەڵگرتو بیستو یەك ڕستە لەو کتێبەی کاریگەری زۆری لەسەر ژیانی داهاتووی هەبوو، خوێندەوە. ئەو خوێندکاری بەشی دەرمان سازی زانکۆی زانستەپزیشکیەکانی شاری مۆنترالْ بوو، دەیویست تاقیکردنـەوەکانی کۆتـایی بەسـەر کـەوتوویی بپڕێـت، بـەڵام لـە ئـەنجامی ئـەم تاقیکردنەوانە نیگەران بوو. ئەوی نیگەران چی بکات و بۆ کوێ بچێت، چۆن ڕاهێنانی وانەکانی بکات تا بتوانێت لەو ژیانەی هەیەتی سەرکەوتووبێت.

ئەم پیاوە لاوە بە بیستو یەك ڕستەی گرنگو کاریگەر لە کتێبەکەدا کە لە ساڵی ١٨٧١دا خوێندیەوە توانی یارمەتییەکی گەورە لە ڕێگەیەکدا کە دەستی پێ کردبوو وەربگرێتو لەبەشی دەرمان سازیدا بووە یەکێك لە ناوازەترین میدیستەکان. ئەو هەر ئەو کەسەیە کە کۆلێجی دەرمانسازی جان هایکینزی دامەزراند کە ناوبانگی جیهانی هەیە. ئـەو هـەر ئـەو کەسـەیە کـە فـەخریی ((پڕۆفیسـۆر))ی لـە زانکـۆی ئۆکسفۆرد وەرگـرتو تـوانی ببێتـە ئەنـدامی چالاکی ئەنجومـەنی زانسـتیو پزیشـکی پادشایی بەریتانیا. ئەو تا پلەیەك بەرزبووەوە کە کەوتە بەر کەرەمی شاژنی بەریتانیا. کاتێك کۆچـی دوایـی کرد دوو کتێبـی گـەورە کـە ١٤٦٦لاپـەڕە بـوو بـۆ ژیـانی ئـەو نووسراو ژیانی ئەوی لەخۆ گرتبوو.

ناوی ئەم کەسە ناوداره (( سێر ویلیام ئوسلەر )) بوو. کتێبێك کە ئەو لەکاتی لاوی لـە بـەهاری سـاڵی ١٨٧١دا خوێندییـەوە کتێبـی (( لـە بەرامبـەری نیگـەرانیو دڵـە ڕاوکێکاندا چۆن بگەینە ژیانی سەر بەستانە)) بوو کە تۆماس کارلیل نووسیبووی. ئەو لەم کتێبەدا ئامارەی بە ڕستەیەکی زۆر گرنگ داوەو دەڵێـت: (( هـەڵسو کەوتو ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ئێمە ئەوە نییە بزانین درۆ وردو بچوکەکان دەتوانن بەینێکی

زۆر لە نێوان ئێمەو ڕاستییەکانو خەڵکدا دروست بکەن؛ بەڵکو ئەوەیە کە هەوڵ بدەین بەدرۆچوون خۆمان بشارینەوە.))

بەشێوەیەکی تر، هەوڵ ئەدەین بە درۆکردن شتێك کە لەگەڵ ڕاستیدا هاوتەریبە بشارینەوە و بەتەواوی لەدنیای ڕاستی دووری بخەینەوە، لەحاڵێکدا یەك درۆی بچوكو بێ مانا دەتوانێت شادەماری سەرەکی بێت لە دوور خستنەوەی ئێمە لە ڕاستیو ئامانجەکان. نزیکەی چلو دوو ساڵ دوای ئەوە لە شەوێکی ساماڵو خۆشی بەهاریدا کاتێك ((سێر ویلیام ئوسلەر)) لە کەمپی زانکۆدا دەیویست مەدالیای زانکۆیی یالە وەربگرێت، هیچ لەو ئەندێشەدا نەبوو ڕۆژێك دەتوانێت وەکو مامۆستای ئەو زانکۆیە کار بکاتو کتێبە زۆر پرفرۆشو ناودارەکانی ئەو دەتوانن مێشكو فیکری مرۆڤەکان بۆ باش بیرکردنەوەو باش ژیان کردن بگۆڕنو کاریگەربن. ئەو حاڵەتو بارودۆخێکی نەبوو کە ڕاستییەکانی دەروونی دەربڕێت. بە وتەی خۆیی و هاورێکانی ئەو ڕواڵەتو حاڵەتو شێوەی قسەکردنی ئاسایی هەبوو کە هەرتاکێك خاوەنی کەسایەتییەکی ئاوایە.

کەواتە چ شتێك لەسەرکەوتنی ئەودا ڕۆڵی هەبووەو وەکو نهێنی دەژمێردرا؟ تەنیا شتێك ئەو هەیبوو؛ خۆی دیلو بەندکراوی ژیانی بەدبەختانەو بەکورتی (زیندانی بەدبەختی) نەکردبوو. لەوانەیە ئەم ڕستەیە بە لاتانەوە سەیر بێت بەڵام ئەو خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: (بیهێننە بەرچاوتان کە لە ناوەڕاستی دەریادا بە پاپۆڕ سەفەر دەکەن. لەم گەشتەدا ئێوە ژورێکتان هەیە کە لەنهۆمەکانی ژێرەوەی پاپۆڕەکەدایە. لەپاش ماوەیەك دەکەونە بیری ئەوەی لەوانەیە پاپۆڕەکە نقوم بێت. ئەو کاتە چی دەکەن؟ ئایا بیر لەوە دەکەنەوە ڕێگە چارەیەك لەو ژورە یان لەو بەشەدا بدۆزنەوە، یان ئامێرێك هەڵبژێرن کە بتوانن بەهۆیەوە ڕێگە نەجاتێك لەسەر ئاوەکان پەیدا بکەن؟... ئاشکرایە کاتێك مرۆڤ پشتی بەهەمان شتانی دەوروبەری خۆی گەرم بێت تەنیا لەو شتە کەمانە بەهرەمەند دەبێت. لەوانەیە ئەو ئامرازانە بتوانن ئەو لەچەند قۆناغێکدا سەربخەن، بەڵام ئەگەر کەسەکە بەرەوڕووی دەرگای ئاسن بووەوە ئەو کاتە دەبێت چی بکات؟... با بەجۆرێکی تر بابەتەکە هەڵسەنگێنین. ئەوەی کە کەسەکە لەناو ژوورەکەی لەنهۆمی خواروی پاپۆڕەکەدایەو نیگەرانی ئەوەیە لەوانەیە پاپۆڕەکە نقوم ببێت. بەڵام بێدەگو بێ کار دانانیشێت. سەیری ئەم لاولا دەکات، بە پێپلیکانەکاندا

سەردەکەوێت. دەرگا جۆراوجۆرەکان و ڕێگەکانی دەرباز بوون و شوێنە ناقایمەکان و قایمەکانی پاپۆڕەکە هەڵدەسەنگێنێت و هێزو توانای خۆی لەبەرامبەری ئەم ئیمکاناتەدا هەڵدەسنگێنێت... ئەم کارەی ئەو بینینی دوا ڕۆژو نە بوونی ترس و چاودێری داهاتووە. لەروبەڕوبونەوەی پێشهاتەکانیشدا دەبێت ئاوا هەڵس وکەوت بکەین، نابێت داهاتوو بە بەیانی بزانین، داهاتوو ئەمڕۆکەی ئێمەو چەند سات دوای ئێستایە، دەبێت رابردوو لەبیر بکەین. کاتێك دەمانەوێت سەرکەوتوو بین دەبێت لەهەر هەل ومەرجێکداین ئەوە بە زەمینەی داهاتوو بزانین و بەسود وەرگرتن لەئیمکانات خۆمان لەگەڵ دۆخەکەدا هەڵبسەنگێنین. لەوەها حاڵەتێکدا بە ئاسانی دەرگا ئاسنەکان لەبەرامبەرماندا دەبن بە دەرگای دارو ئاوریشم و ئێمە توانای تێکشکاندنیان و تێپەڕبونیانمان هەیە. ئایا دکتۆر ئوسلەر بەم وتەیەی دەیەوێت بە ئێمە بڵێ لەبەرامبەری دروستکردنی قووڵی داهاتووی دووردا بێ دەربەست بین؟ نا، بە هیچ جۆرێك وا نییە. بەڵکو ئەو ناونیشانێکمان ئەداتێ کە بەئاسانی دەتوانین داهاتوو بناسین و خۆمان ئامادە بکەین. ئەو بڕوای وایە تەواوی ئەو بارودۆخەی ئێستا خۆی دەتوانێت ئامرازی رۆیشتن بەرەو داهاتوو بێت و لەوانەیە هەر ساتێکی ئێستامان ئێمە بەرەو دەستکەوتنی داهاتوو یارمەتی بدات.

سێر ویلیام ئوسلەر لەزانکۆی یالە بە خوێندکارانی خۆی دەوت رۆژی خۆیان بەناوی عیسای مەسیح و خوداوە دەست پێبکەن و پێی وابوو دەستپێکردنی رۆژ بەناوو یادی خواوەندو عیبادەتی ئایینی بەجۆرێك وەکو خوگرتن بە خواردنی نان و ئاوەوە. هەروا کە مرۆڤ بۆ ڕێگرتن لەبرسێتی خۆی عادەت دەدات بەخواردن، دەبێت عیبادەتیش بەجۆرێك خواردنی رۆژانە بزانێت. ئەو بڕوای وابوو غافڵبوون لەپێویستی رۆژانە کە هەمان عیبادەتە، دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ لەکاتی برسێتیدا لەجیاتی ئەوەی بیر لەعادەتی خۆی بکاتەوەو هەڵی سەنگێنێت و حەسرەتی رابردوو بخوات. لەڕاستیدا بەباوەڕی ئەو گۆڕانکاری کەسایەتی مرۆڤ هەموو رۆژێك بە گوێرەی عادەت (پەروەردەکردنی کەسایەتی، بڕوا بەخۆ بوون، ناسینی خۆی و دەوروبەری).. بێت تاکو هەر ساتێك لە ئەمڕۆی خۆی بکاتە داهاتوویەك و ئامادەتر بێت. نەك ئەوەی بە جۆرێك هەڵس و کەوت بکات کە بکەوێتە بەرامبەری کاری کراو وبەسەختی بتوانێت

تەحەمولی بکاتو بیر لە ڕابردوو بکاتەوە کەشتی باشی هەبوو، یان هۆکارێك بووە کە بووەتەهۆی ئەوەی ئەم هەڵو مەرجەی ئێستا بێتە پێشەوە.

بۆ نموونە ئەو ئەم دوعایە باس دەکات: (خودای گەورە، ئەو شتەی هەمیشە جێی شوکرانە بژێرییە.ئەگەر بۆ ساتێك ڕووی ڕەحمەتت لە من وەرگێڕی چەندە بەدبەخت ئەبم، لە ڕابردوو هەژارتر ئەبم. ئەگەر ئەم کارەی هەمە لە دەستم بچێت ئەو کاتە چی بکەم؟) ئەو بڕوای وابوو ئەم جۆرە ڕووبەڕوو بوونەوەو دۆعا کردنە عاقلانە نییە. ئەو ئەم جۆرە بیرکردنەوەی بە جۆرێك تەسلیم بوون بۆ بەد بەختی ئێستا دەزانیو بڕوای وابوو ناتوانێ فاکتەرێکی بزوێنەر بێت بۆ ڕۆیشتن بەرەو داهاتوو. لەم ڕووەوە دەیوت ئەگەر بەڕاستی دەمانەوێت خۆمان لە زیندانی باوەڕی بەدبەخت دوور بخەینەوەو سەر بەستانە بژین، دەبێ بە جۆرێکیتر لە گەڵ خودامان گفتو گۆ بکەین. دەبێ بڵێین: (خودایە ئەو شتە بە منت بەخشیوە ڕەحمەتی تۆیە. نانو نیعمەتی ئەمڕۆکەم بۆ ئەمڕۆمە. خودایە تواناو تێگەیشتووییەکی قووڵ بە من عەتا بفەرموو تاکو بتوانم ئەو شتەی نیمە بەدەستی بێنمو ئەو شتەی نایزانم بیزانم.)

لەوانەیە وا بەر چاو بکەوێت لەم دوعایەدا جۆرێك تەماع هەیە، بەڵام هیچ وانیە، چونکە مرۆڤ جووڵەو حاڵەتێکی دینامیزمی تایبەت بەم جۆرە باوەڕە لە خۆییو ژیانیدا هەست پێ دەکات. بڕوا دەکات ژیان تەنیائەمڕۆکە نییە کە ناچاربە تەحەمولی بێتو ڕابردوویەك نیە کە لە دەستی دەرچووە. بەڵکو ژیان هەمان داهاتوویەکە کەوەکو گەشتیارێك دەبێ درێژە بە ڕێگاکەی بداتو بگاتە مەبەست.

بەشێك لە خەڵك پابەندی ئەم وتە ئایینیو مەعنەوییەی عیسا بوونو باوەڕیان پێیەتی:(نابێ بیر لە بەیانی بکەیتەوە.) ئەم جۆرە کەسانە لە ڕاستیدا ڕوانینی داهاتوویان لە خۆیان داماڵیوەو داهاتوو و ئاسۆی ڕوونی دوا ڕۆژ بە پێویست نازانن. لە حاڵێکدا ئەم ڕوانگەیە نەك هەر پەسەند کراو وعاقڵانە نییە، بەڵکو جگە لە ڕۆژئاوا لە هیچ شوێنێکی دنیا پابەندی نین. سەیر ئەوەیە کە لە باوەڕە

ڕۆژ هەڵاتییەکاندا خۆ دوورگرتن لە ڕوانینی داهاتوو بەجۆرێك نەزانیو بێ عەقڵی دەزانرێت. ئەر فەرموودەی عیسا بە وردیو بە قووڵیو ئەندێشەوە هەڵبسەنگێنین دەبینین عیسا بەوتنی ئەوەی (( نابێ بیری بەیانی بکەیت)) مەبەستێکی تایبەتی کۆمەلایەتی هەیە. ئەو دەڵێت:( ئەو شتەی لە دەستو توانای تۆ بەدەرە، بەرنامەی بۆ

دامەڕێژە تاکو خۆت و خێزانەکەت توشی نیگەرانی و کێشە نەکەیت.) بۆ تێگەشتن لەم بابەتە نموونەیەك دێنمەوە:

وای دابنێین دەرماڵەیەکی کەممان هەیە.لەهەمان کاتدا بەم دەرماڵەوە دەتوانین تەنیا یەکەیەکی نیشتەجێ بوون لە شوێنێکی مامناوەندی شار بکڕین. ئەگەر بەم توانا و دەرماڵەوە بمانەوێت لە باشترین شوێنی شارداخانوو بکەین پارەکەی گەلێك زیاتر بێت لە دەرماڵەکەمان و بەو هیوایە کەلە داهاتوودا بەرنامەی بۆ دابڕێژین و لە وانەیە دەرماڵەیەکی تایبەتمان ببێت تا بتوانین پارەکەی دابین بکەین، ئەم جۆرە ڕوانگەیە جۆرێك مەترسیە کەدەکرێت بە خەون و خەیاڵ و ئەندێشەی بلّقی سەر ئاولە قەڵەمی بدەین.

باشە! ئەڵبەت هەر کەسێك خەون و ئاواتی هەیە، بەڵام ئەگەر ئەم خواست ئارەزووانە لەگەڵ وەزعی دەرامەت و مەعنەوی کەسەکەدا گونجاو نەبێت، نەك هەر نابێت بەڕاستی، بەڵکو توشی گەلێك گرفتی ئەکات و نیگەرانی و دڵە ڕاوکێ ساتێك ئاسوودەی ناکات. بەڵێ! ڕوانین بۆ داهاتوو گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە جۆرێك بەرنامە داڕشتنە بۆ داهاتوو. بەفیکرەی سەیری بەیانی نەکەین و تەنیا ئەمڕۆ ببینین مانای کەسایەتی مرۆییمان بە گاڵتە گرتووە و خۆمان بێنرخ دەنوێنین. ئاشکرایە پێغەمبەری خودا کەبۆ بەرزکردنەوەی کەسایەتی مرۆڤەکان هەڵبژێردراوە هەرگیز هەوڵی ئەوە نادات مەزنایەتی مرۆیی لە کەدار بکات و ئەو کەسێك نییە بەها ڕاستەقینەکانی مرۆڤ لە بەرچاو نەگرێت. کەواتە دیمانەی ڕوکاری وتەکەی عیسا دیمانەیەکی هەڵە ئامێزە.

پلان داڕشتن بۆ داهاتوو نەك تەنیا مرۆڤ لە نائومێدی ڕزگار دەکات، بەڵکو مرۆڤ بە باوەڕی پتەوو ئیرادەی پۆڵایین بەرەو داهاتوو هان ئەدات.

مرۆڤ لە داڕشتنی بەرنامەو ڕوانینی بۆ داهاتوو دەتوانێت ئەندازەی تواناکانی خۆی لە پاڵ خاڵە لاوازەکانیدا بزانێت و بە ڕوانینێکی ورد بگاتە ئەو ئەنجامە کە بە چ کردەوەیەك سەربەرز دێتە دەرەوەو لە سێبەری چ کارێکدا سەرکەوتن لە گەڵ ئەوە. لە وەها هەل و مەرجێکدا حەقیقەت بینی ئەو دەبێ بە حەقیقەت گەرایی لەودا. لە سێبەری ئەم حەقیقەت بینییەدا هەر جۆرە مەترسیەك لە خۆی دور بخاتەوەو بێ نیگەرانی و دڵە ڕاوکێ بەرەو پێش دەچێت.

لێرەدا ئاماژە بە بۆچوونی کاپتن (( ئێرنست جی کینگ)) لەهێزی دەریایی ئەمریکا دەکەم، کە لە یەکێك لە شەڕەکانیدا گەیشتووە بەو ڕاستییەو ئەوەی بۆ مەلەوانان و کادێرانی ژێردەستی خۆی دەرکاندوە. ئەم خاڵە ئەوەندە بە پیت و پڕمانایە کە دەم بە دەم تائەمڕۆ گەیشتووەو بووەتە وێردی سەر زاران. ئەو دەڵێت:

(( کاتێك ئەرکێکیان پێ سپاردن بەپەلە مەڵێن دەتوانم ئەنجامی بدەم. سەرەتا بیر لەوە بکەنەوە ئەو پاپۆڕەی پێی بەڕێ دەکەون و ئەرکەکانتان ڕادەپەڕێنێت ئایا توانای وەڵام دانەوەی خواستەکانی فەرمەندەکەتانی هەیە یان نا. مەڵێن ئەگەر بوەستم یان سەرپێچی بکەم سزام ئەدەن، ئێوە بەم گوێڕایەڵیە کوێرانەوە ڕێگەی بەیانی تاریك دەکەن و کێشەی تریش دێننە ڕێ. بەهێزەوە لە ئەرکەکە تێبفکرن، بەلام بە قووڵی شی بکەنەوەو بزانن تاچ ڕادەیەك و چەندە سەرکەوتنتان دەست دەکەوێت. لە کاتی ئاوادا پێشنیارەکانتان دەرببڕن کە ئەمە خۆی توانای ئێوەو هاوڕێکانتان زیاد دەکات و ئەو کاتەیە کە داهاتوو لە گەڵ ئێوە دەبێت.)) بە ڕاستی ئەمە باشترین هەڵبژاردنە بە شێوەیەك کە عیسا لەوکاتانەیدا ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە کردوەو دەفەرموێت

(( ئەو شتەی دەیتوانی، چرای ڕووناکی بەخشە.))

(( هەنگاوەکانت ڕاگیراو هەڵبێنەو بۆ هەر پرسیارێك وەلامێك بدۆزەرەوە

(( هەرچەندە ئەندێشەت بە پشت بەستن بە ڕاستییەکان ڕوونتر ببێتەوە هەنگاوەکانت پتەوتر هەڵدەگریت.))

بۆ تێگەیشتن لە باسەکە نموونەیەك دێنمەوە کە خۆم شایەتی بووم:

ڕۆژێك لە گەڵ یەکێك لە هاوڕێیانم لە شەقامی ژمارە ٥٧١٦ی نیو هۆڵم لە گەڕەکی بالتیمۆر لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستمدا بە ناوی ((تێد بینگر مینۆ)) گەشتمان دەکرد. شۆفێری ئوتومبیلەکە نەقیب ((ئالبێرت نیومەن)) بوو. ئەو کەسێکی کارامەو ئاواتە خوازی شەوق و شادی بوو. شۆفێریی ئەو باسی ناو باسان بوو. سەرەڕای ئەوەی دەترساین لە گەڵ ئەو بەڕێ کەوین بەلام چارمان نەبوو، چونکە دەبوایە بچم بۆ نەخۆشخانەیەکی سەربازی و ئەحواڵ پرسی یەکێك لە نەخۆشەکانم بکردایەو لە بواری دەروونییەوە دەرمانم بکردایە.

لە ناو جادەدا بەڕێز ئالبێرت ئوتومبیلەکەی بە خێراییەکی سەرسامەوە لێدەخوڕی و ئێمە لەسەر کورسیەکان چەقیبووین. ئەو هەر ئەندازە ترس و نیگەرانی

ئێمەی ئەبینی زیاتر دەهاتە سەر شەوق و خێراتر دەڕۆیشت. ئەگەر چی بەڕێز تێد چەند جار پێی وت نابێ بەو خێراییە بڕوات، بەڵام ئەو گوێی بەم قسانە نەدەداو بە هیچ جۆرێك گوێی بۆ ئەم ڕاستیانە نەدەگرت.

بە ناو ڕێگەدا بۆ چا خواردنەوە وچانێك لاماندا. بەڕێز تێد بەڕەخنەوە لە درێژەدان بە گەشتەکە پاشگەز بووەوە و نەقیب بیومەن بۆ ئەوەی ئەو ڕازی بکات بەڵێنیدا هێواشتر لێخوڕێت، بەڵام تێد بڕوای نەدەکرد و قسەیەکی کرد کە زۆر بەلامەوە سەرنج ڕاکێش بوو. وتی:

(( من دەزانم تۆ ئاواتە خوازی زوتر بگەیتە مەبەست و لە لایەکیشەوە لێخوڕینی خێرات پێ خۆشە، بەڵام ئایا بیرت کردۆتەوە توانای ئۆتۆمبیلەکەت چەندە؟ ئایا بڕوات بەوە هەیە بەو گوشارەی دەیخەیتە سەر بزوێنەری ئوتومبیلەکە، بزوێنەرە کە وەڵامدەر ئەبێت؟ ئێستا بیر لە بابەتێکی تر بکەینەوە. ئایا دڵنیایت بەو خێراییەی لێ دەخوڕی کتوپڕ چاڵێك لە سەر ڕێگاکەت نابێت؟ یاخود بەردێکی بچوك لە سەر جادە نابێت؟ ئەگەر بیر لەم شتانە بکەیتەوە خۆت ناخەیتە مەترسییەوە.

ئەگەر تەواو دڵنیا بیت و لە سەدا سەد ئاگاداری جادەکە بیت کە بێ عەیبە و وەکو پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل هیچ لەمپەرێك لە سەر ڕێگەکەت نییە، ئەو کاتە حەقی خۆتە و دەتوانی بە خێرایی لێخوڕی. بەڵام تۆ لەم شتانە دڵنیا نیت.کەواتە چۆن بێ ئەوەی ئاگاداری داهاتووی چەند هەنگاوی پێش خۆت بیت خۆت دەخەیتە مەترسییەوە؟))
بە ڕاستی ئەم وتە بەنرخە بۆ هەمووومان ڕاست دەبێتەوە. ((جادەی پڕ لە بەرزی و نزمی پڕە لە لەمبەرو کەم و کووڕی)). بۆ ئەوەی خۆمان لە دەستی هەر دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەك ڕزگار بکەین و بێ ئەوەی زەمینەی بێ تاقەتی و پەشیمانی فەراهەم بکەین چی باشترە بەفیکرو دوور ئەندێشی و بەرنامەڕێژی لەجادەی ژیاندا بەرەوپێش بچین. با دڵنیابین لە هەل و مەرجێکی ئاوادا سەرکەوتوو دەبین.

لە درێژەدان بۆ شیکردنەوەی زیاتر لەم بارییەوە ئاماژە بۆ یەکێك لە بیرەوەریەکانم دەکەم: بەهاری ساڵی ١٩٣٨بوو کە لە ورسای میسۆری لە قوتابخانەیەکی فەقیرانە خەریکی وانە وتنەوە بووم. ڕێگەی هاتوو چۆم زۆر خراپ بوو، ئۆتۆمبێلی کەم لەم ڕێگەیەوە هاتو چۆیان دەکرد و من ناچار زۆر تر بە پێ دەڕۆیشتم. هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بتوانم خۆم لەم کێشەیە ڕزگار بکەم. هەرچەندە زیاتر بیرم دەکردەوە

بێ هیواتر دەبووم. چونکە ئەو دەرماڵەی هەم بوو بەسەختی بەشی ژیانی دەکردم و لە داهاتووی خۆم دەترسام. هەموو ڕۆژێک بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستام ڕوخساری تاڵو دزێوی ژیانم لە پێش چاومدا دەبینی. هەستم دەکرد ژیانم هیچ مانایەکی نییە. لە هەموو شتێک دەترسام. ئاواتەکانم دەهێنایەوە یادو بە بیرکردنەوە لە ڕاستییەکان دەلەرزیمو ڕێگەم نەئەدا ڕاستی ئاواتە کوێرەوە بووەکانم لێڵ بکات. پشتم بە داهاتوو دەبەست. خواردنم کەم دەخوارد چونکە پارەم زۆر نەبوو. دەترسام ئەگەر ڕۆژێک نەخۆش بکەوم چۆن خەرجی دکتۆر بدەم. خووشکێکم هەبوو کە ئەویش پێی دەنایە تەمەنو پێویستی بوو پشتگیری بکەم.داهاتووی ئەویش زیاتر لە هەرشتێک نیگەرانو بێتاقەتی دەکردم.دەرماڵەکەم ڕێگەی نە ئەدا بیر لە هەر شتێک بکەمەوە. بۆ خۆمم دەقەبلاند ڕۆژێک پیاوێک دەردەکەوێتو دەستم دەگرێت. ئەمە ئاواتی من بوو وەکو ئەو کچە داماوانەی لە ئاواتی شازادەی سوار بە سەر ئەسپی سپییەوە، منیش لە هەوڵو ئاواتی پیاوێکدا بووم کە دەستی یارمەتیم بۆ درێژ دەکات. هەر ڕۆژێکم بەم باوەڕەوە دەبردە سەر، تا سەر ئەنجام ڕۆژێک بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەکو چەند دێڕ شیعر لەوەدا ڕاستی لە پێش چاومدا ڕوونتر بووەوەو ڕوخساری ژیان کراوەتر بوو لەلام. شیعرەکە بەم جۆرە بوو:

پیاوێکی شاد، شاد تر لە هەر شتێک

دەیوت ئەمڕۆکەم سەرمایەی ئاواتەکانمە،

ئاواتەکانم سەر مایەی بەیانین،

بەیانی بە تەماعەوە بە تەناف ڕادەکێشمو دەمەوێ بۆ گەیشتن بە بەیانی ئەمڕۆکە بە پەلە بەجێ بهێڵم ....

بەڵێ، ئەگەر بیر لە قوڵایی ڕستەکان بکەنەوە حەق ئەدەن بە من. شاعیر لەم شیعرەدا ئەو شتەی من لێی خافڵ بووم هێنابوویە سەر زمانو دەمزانی تا ئەو ڕۆژە منداڵێکی بچووک بوومو گەورە نەببووم. لەوانەیە بەجەستە گەورە ببوم بەڵام لەبواری دەروونیو ڕۆحییەوە هێشتا نابالق بووم. ئێستا تێڕادەمێننو من بۆتان شی ئەکەمەوە.

بیهێننە بەر چاوتان من دەرماڵەیەکی کەمم هەبوو، بەڵام بەم دەرماڵەوە هیچ هیوایەکم نەبوو قەناعەتم بەخۆم کردبوو، بۆ ئەوەی توشی گرفتی ئێستا نەبم لە هەر شتێك دەترسام. داهاتووم لە کۆڵانێکی بەر تەسکدا ئەبینی و چوونە ژوورەوەیم لە خۆمدا نەئەدی. لە حاڵێکدا شاعیر منی بە ئاگا کردبۆوە. ئەو داهاتووی بەو شێوەیە بەیان نەکردبوو. من بە خوێندنەوەی ئەم شیعرە یەکەم ڕستەی بە مێشکمدا هات ئەوە بوو کە هاوسەرگیریی دەکەم و ئەمە خۆی بروسکەیەکی هیوا بوو بە مێشکمدا هات.

بێ پەردە بڵێم، لە بەر نیگەرانیم ئیرادەی خۆم لە دەست دابوو.بیرم لەم بەیانییەی ئێستا کە بەرەو ئێوارە دەڕۆیشت دەکردەوە.لە حاڵێکدا نەدەبوا ئاوا بووایە. گەیشتبوومە ئەو خاڵە لە جوڵەی تەمەنم کە بۆ ڕزگار بوون لە ترس و نیگەرانی باشتر وایە بە چاویلکەیەکی نوێوە لە داهاتوو بڕوانم. لە پاش ئەم فیکرە تێگەیشتم ئەو شتەی من لە سەری بووم هەڵە بووە. دەبوایە داهاتووم بدیایەو سەرمایە گوزاریم بۆی بکردایە. لە وانەیە سەرمایە گوزاری مادی لە توانامدا نەبوایە، بەڵام دەمتوانی هەنگاو بنێمە کۆڵانی داهاتوو. بڕیارمدا درێژە بە خوێندن بدەم، ئەگەر چی بۆم سەخت بوو، لە ڕابردوو نەدارتر دەبووم و ژەمێکم لە بەر نامەی خۆراکم کەم دەکردەوە، بەڵام ئەمە جوڵەیەکی نوێ بوو.

لە پاش چەند هەفتە گۆڕانکارییەکی تایبەتم لە خۆمدا هەست پێ کرد، شاد ببووم و چیتر داهاتووم لە قووڵایی تاریکیدا نەئەدی. لانی کەم دەورانی دوای تەواو بوونی خوێندنم ڕونتر ئەدی و داهاتووی لەوە زیاتریشم لە سێبەرێکدا دەبینی.

بەم جۆرە بوو کەژیانم ئاڵ و گۆڕی بە سەرداهات و بە ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە بەرەو پێش چووم. بێ ئەوەی بیر لە شتێکی تر یان ڕێکەیەکی هەڵە بکەمەوە عەقڵم کردە حاکم و ئاسانتر ڕێگەی ژیانم بە سەرکەوتوویی دەبڕی. داهاتوو ئەوەندە لەلام شیرین ببوو کە بە وتەی شاعیر بە تەناف ڕامدەکێشا و دەمویست هەرچی زووتر بگەمە بەیانی. بێ ئەوەی نیگەران بم.ئەنجامی ئەم باسە لەم بەشەدا ئەوەیە کە دەتوانین بەرنامە بۆ داهاتوو دابڕێژین و دەستپێکردنی کارەکە لە پێنج قۆناغدا بگرینە بەر:

١- سەرەتا پرسیار لە خۆتان بکەن چین، چیتان هەیە، دەتوانن چی بکەن و لە دەفتەرێکدا بینوسن.



 

٢- بۆ وەڵامی ئەم بابەتانە سەرەتا بیر بکەنەوەو پرسیار لە خۆتان بکەن لە چ بارو دۆخێکدا دەژینو چ توانایی گەلێکتان هەیە؟ ئایا ئاواتەکانتان پڕو پووچە یان بواری بوون بە ڕاستی هەیە؟ ئایندە بە ئارەزووە کانتانەوە بە هەشتێکی سیحراوی دەبێت یان باخێك دەبێ کە ڕاستەقینەیە؟

٣- ئەو شتەی وەکو توانای مادیو مەعنەوی هەتانە بیری لێ بکەنەوە. بزانن ڕابردووتان چۆن بەجێ هێشتووەو داهاتووتان بەچ بەرنامەیەکەوە لە پێش دەمدایە. ئایا لە ڕابردووی خۆتان شادمانن یان پەشیمان؟ ئەگەر شادن، ئایا دەتانەوێ بەیانیشتان وەکو ئەوە بێت یان باشتر لەوە. ئەگەر پەشیمانن بەرنامەتان بۆ داهاتوو چییە؟

٤- ڕۆژەکانو تەمەنتان هەڵبسەنگێنن ٢٤ کاتژمێری ڕۆژانە بە وردی هەڵبسەنگێنن کە چی بکەن بۆتان پڕ سوود بێت؟

٥- ئەمڕۆتان باش بردوەتە سەر یان نا؟ بەیانی باش دەبێ یان نا؟ بیر بکەنەوە چۆن بکەن بەیانی خۆشەویستتر بێت بۆتان؟ کاتێك جوڵە بۆ بەیانیو داهاتوو لە گەڵ ئیرادەو بڕیارو بەر نامە بێت هەفتەکانی داهاتوویش بەرنامە ڕێژی بکەن....ئەمەیە بەیانی.... ئەمەیە ئەنجامی کاری ئەمڕۆکە....



 

بابەتی دووەم

## ڕێگە چارەیەکی سیحراوی بۆ ناکاریگەرکردنی بارو دۆخە نیگەران کەرەکان

ئایا دەتانەوێت شێوازێکی خێراو متمانە بەخش بۆ زاڵ بوون بەسەر بارو دۆخە نیگەران کەرەکاندا هەبێت، تەکنیکێك کە خێراییەو بەبێ پێویستی بە خوێندنەوەی لاپەڕەکانی دوایی ئەم کتێبە لێرەدا هاتووە:

کەواتە وەرن بەو تەکنیکیەی (( ویلیز کریر))، داهێنەری بەناو بانگی پیشەسازی هەوا بەر (ساحیبە)و بەڕێوەبەری کۆمپانیای بەناو بانگی (( سیراکۆس))ی نیویۆرك دای هێناوە ئاشنا ببین.ئەم ڕەوشە یەکێکە لە باشترین میتۆدەکانی چارە سەر کردنی کێشە نیگەران کەرەکان و من خۆم ئەوە لە کاتی خواردنی نیوەڕۆ لە یانەی ئەندازیارانی نیویۆرك لەوەوە فێر بووم.

ئەو دەڵێت:((کاتێك گەنجتر بووم بۆ کۆمپانیای بوفالۆفۆرگ لە بوفالۆی نیویۆرك کارم دەکرد. ئەرکم دامەزراندیی ئامێری پالآوتنی گازەکان بوو لە یەکەیەکی پیشەییدا کە هی کۆمپانیای گلاس پلیت پیتز بۆرگ لە کریستاڵ سیتی میسۆری بوو. هەر یەکەیەکی پیشەیی ئەم کۆمپانیایە ملیۆنەها دۆلاری تێچوو بوو.

مەبەست لە دامەزراندنی ئەم ئامێرە، پاکژ کردنەوەی پیسبوونی گازیی بوو بۆ باشتر کار کردنی مەکینەکان بە بێ زیان پێ گەیشتنیان. ئەم شێوازەی پالآوتنی گازەکان تەواو نوێ بوو، تەنها یەك جارو لە بارو دۆخی جۆراو جۆردا تاقی کرابۆوە. لە کاتی ئەرکەکەمدا لە کریستاڵ سیتی میسۆری ڕووبەڕووی کێشەی چاوەڕوان نەکراو بووینەوە. ئەم شێوازە کارە کارامە بوو، بەڵام زۆریش جێی ڕازی بوون نە بوو کە شایانی ئەم گەرەنتیە بێت کە کردبوومان. ئەم سەرکەوتنە کاسی کردبووم. وەکو ئەوەی کەسێك سەرمی بە شتێك شەتەك دابێت. لە ناو سکمدا پێچ و ژانێکی پڕ ئازارم هەست پێ دەکرد. ئەوەندە نیگەران و پەشێو بووم کە تەنانەت خەو و خۆراکی باشم

نەبوو. سەر ئەنجام بە یارمەتی عەقلی سەلیم بۆم دەرکەوت نیگەرانی سوودی نییە، کەواتە شێوازێکم داڕشت کە کێشەکەم بەبێ دڵە ڕاوکێ چارەسەرکەم. ئەنجامەکەی بێ وێنە بوو. شێوازێکی سادە کە هەر کەسێك دەتوانێ بە ڕێوەی بەرێت. ئەم ڕەوشە سێ قۆناغی هەبوو.

قۆناغی یەکەم: بارو دۆخی خۆمم بوێرانە شی کردەوەو خراپترین دەرئەنجامەکانی ئەم کێشانەم هەڵسەنگاند. بێ گومان کەس من بەهۆی ئەم شکستەوە زیندانی یان لەسێدارە ناکات. لە ڕاستیدا دوو حاڵەت هەبوو، پلەو پایەکەم لە دەست دەچوو، یان فەرمان بەرەکانم بە ناچاری ئەو ئامێرانەی کڕیبوومان ئەیاندایەوەو لەم حاڵەتەدا بیست هەزار دۆلارمان لە دەست دەچوو کە سەر مایە گوزاریمان کردبوو.

قۆناغی دووەم: لە پاش دیمانەکردنی خراپترین هەل و مەرجی شیمانەکراو خۆم ڕازی کرد لە حاڵەتی پێویستدا قبووڵی بکەم. لەوانەیە ئەم شکستە هەڕەشەیەك بێت بۆ بارو دۆخەکەم و تەنانەت کارەکەم لە دەست بدەم، بەڵام دیسان لە حاڵەتی ڕوودانی وەها شتێکیشدا دەتوانم کارێکی تر پەیدا بکەم.

هەل و مەرجی لەوە خراپتریش دەیتوانی ڕوو بدات کە لەو حاڵەتەدا بەر پرسان بۆیان دەردەکەوێت و پرۆژەکە دەوەستێنن و بودجە تەرخان کراوەکە ( بیست هەزار دۆلار ) بۆ لێکۆڵینەوە تەرخان دەکەن.

لە پاش ناسینی خراپترین حاڵەتی شیمانەکراو و وەرگرتنی، ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا. خێرا ئۆقرەییەك لە دەروونمدا دروست بوو کە لەوە پێش نەمبوو.

قۆناغی سێهەم: لەو کاتەوە تا ئێستا بەئارامی کامڵەوە وزەی خۆمم بۆ هەوڵدان بۆ چاککردنی خراپترین عەقڵیەت کەلەوەپێش هەمبوو خستەگەڕ. ڕەوش و کەرەستەی جۆراو جۆرم داڕشت تاکو بەر لە خەسار بوونی بیست هەزار دۆلارەکە بگرم. تاقیکردنەوەی زۆرم ئەنجامداو سەر ئەنجام بۆم دەرکەوت ئەگەر پێنج هەزار دۆلاری تر بۆ کەرەستە لاوەکیەکان خەرج کەین کێشەکانمان چارەسەر دەبێت. بەم ڕەوشە لە جیاتی بیست هەزار دۆلار زەرەر پانزە هەزار دۆلار سوود دەست کۆمپانیا کەوت.

بێ گومان بەبێ زاڵ بوون بەسەر نیگەرانیەکەمدا هەرگیز سەرکەوتوو نەدەبووم، چونکە یەکێك لە خراپترین تایبەتمەندییەکانی نیگەرانی لە ناو بردنی توانای تەرکیزی عەقڵە.کاتێك فیکرمان لەملاو لایەو لەهەر شوێنێکی تر سەرگەردانە، هەموو توانای بڕیاردانمان لە دەست ئەدەین. بەڵام لە پاش ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ خراپترین بارو دۆخەکان و تەنانەت وەرگرتنیان تەواوی دیمانە نا ڕوونەکان لە ناو دەبەین و خۆمان ئامادەی ڕوو بەڕوو بوونەوە لە گەڵ دۆخەکەو پێداگیری لەسەر کێشەکە دەکەین.

ئەم ڕووداوە چەندین ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا. ڕێگە چارەکەی سەرەوە ئەوەندە کارامە بوو کە من لەو کاتەوە تا ئێستا گرتوومەتە بەرو لە ئەنجامدا کەم و زۆر ژیانێکی دوور لە نیگەرانیم بەڕێکردووە .

بەراستی هۆکاری وەها کارامەیی و بەنرخ بوونی ڕێگە چارەی ((.کریر)) چییە؟ لەوانەیە ئەم ڕێگەچارە سیحراوییە بەر لە پێش چوونی کوێرانەی ئێمە لە ناو تەم و مژی نیگەرانی دەگرێت و وەکو ڕێگەیەکی نەجات پێگەو ئامانجمان پیشان ئەدات و هەنگاوەکانمان لە سەر زەوی قورس و ڕاگیراو دەکات. لە حاڵێکدا ئەگەر ئەم زەوییە سەختە لە ژێر هەنگاوەکانماندا نەبوایە چۆن دەمان توانی بیربکەینەوەو بەرەو پێش بچین.

پرۆفیسۆر (ویلیام جیمز) باوکی دەروونناسی نوێ ٣٨ساڵ لەمەوبەر مرد، بەڵام ئەگەر لە ژیاندا بوایەو ئاگاداری ئەم ڕێگە چارەیە بۆ لە ناو بردنی نیگەرانی بوایە لە دڵەوە پەسەندی دەکرد، چونکە هەمیشە بە خوێنکارەکانی دەوت (( کێشە هەر بەو جۆرەی هەیە وەربگرن، چونکە وەرگرتنی هەر ڕوداوێك یەکەم هەنگاوە لە زاڵ بوون بەسەر دەرئەنجامە ناخۆشەکانیدا)). هەر ئەم بۆ چوونە لە کتێبێکی پرفرۆش بەناوی ((گرنگی ژیان)) لە نووسینی ((لین یوتانگ)) هاتووە. ئەم فەیلەسووفە چینیە لەم کتێبەدا دەڵێت:

(( ئۆقرەیی مێشك ئەنجامی وەرگرتنی خراپترین ڕووداوەوە شیمانە کراوەو من پێموایە ئەمە لە ڕوانگەی دەرونییەوە جۆرێك خۆخاڵی کردنەوەیە. کاتێك خراپترین حاڵەت قبووڵ دەکرێت چیتر هیچ شتێك بۆ لە دەست چوون نامێنێتەوە.))

ویلیز کریر دەڵێت: لە پاش ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵخراپترین حاڵەت ئەم فیکرە لە خۆیەوە دێتە ناو مێشکم کە چیتر هیچم بۆ دۆڕاندن نییەو هەر ئەم فیکرە خێرا دەبێتە هۆی جۆرێک ئۆقرەیی و ئاسایشی مێشکم و لەوە بەدواوە ئاسوودەتر دەتوانم بیربکەمەوە. ڕوونە، وانییە؟

ئێستاش ملیۆنەها مرۆڤ ژیانیان لە پەرێشانیدا بە فیڕۆداوە، چونکە ئامادە نەبوون ڕاستی وەربگرن و حەزیان لە باشتربوونی بارودۆخیان نەبووە تاکو خۆیان لە مەترسی لە ناوچوون ڕزگار بکەن. ئەوان لە جیاتی دروستکردنەوەی داهاتوویان کاتیان بۆ بەرەنگاربوونەوەیەکی تاڵ و توند تەرخان کردووە کە دەبێتە هۆی خەمۆکی بەردەوام یان ماخۆلیای ئەوان.

ئایا پێتان خۆشە کەسێکی تر بناسن کە سوودی لە ڕێگە چارە سیحراویەکەی ویلیز کریر وەرگرت و کێشەکەی چارەسەر کرد؟ ئەم نموونەیە دەربارەی بازرگانێکی نەوتە لە نیۆیۆرک کە زەمانێک خوێنکاری من بوو. ئەو دەڵێت:

بڕوام نەدەکرد لە دنیای دەرەوەی فیلمیشدا شتێکی ئاوا بۆ من بێتە پێشەوە. بەڵام من بەڕاستی ببومە قوربانی باج گیرییەك. داستانەکە بەم شێوەیە بووکە کۆمپانیاکەی من کۆمپانیایەکی گواستنەوە بوو. ژمارەیەك لۆری و ژمارەیەك شۆفێرم لە بەردەستدا بوو. ئەو کاتانە ئێمە ناچار بە لەبەر چاوگرتنی یاسای OPAبووین و ئەو ئەندازە نەوتەی ئەماندا بە موشتەرییەکان ئەندازەی هەبوو. هەندێك لە شۆفێرەکانم ( بێ ئاگاداری من) لە بەشی موشتەرییەکانیان ئەدۆزییەوە و بە کورتی کەم فرۆشیان دەکرد. یەکەم ڕاپۆرتی ئەم کەم فرۆشیە لەلایەن چاودێرێکی حوکمییەوە گەیشتە دەستی من و بۆ بێدەنگ بوون داوای پارەی کرد. چونکەبەڵگەی لەم کەم فرۆشیە بە دەستەوە بوو هەڕەشەی پیشاندانی بەڵگەکانی بە دواکاری گشتی پارێزگا دەکرد. ئەگەر چی خۆم پێموابوو هیچ جێی نیگەرانی نییە بەڵام بەیاسا کۆمپانیا بەرپرسی کردەوەی فەرمان بەرەکانیەتی. سەرەڕای ئەوە ئەگەر بابەتێکی ئاوا لە دادگا باس بکرایەو لە ڕاگەیاندنەکانیشدا دەنگی بدایەتەوە، من متمانەو ئابڕووی کارەکەمم لە دەست ئەدا.

من شانازیم بەکارەکەمەوە دەکرد. باوکم بیست و چوار ساڵ لەمەو بەر ئەم کۆمپانیایەی دامەزراندبوو.ئەوەندە دڵەڕاوکێم هەبوو کە هەستم بە نەخۆشی دەکرد.



 

سێ شەوو ڕۆژە خەوو خۆراکم نەبوو، لەخەیاڵە پڕو پووچەکانمدا نوقم بووم. یان دەبوایە پێنج هەزار دۆلارم بدایەو یان بەم پیاوەم بگووتایە بڕوات و پیلانە پیسەکەی ئەنجام بدات. هەربڕیارێکم ئەدا دەبووە هۆی خەونی ناخۆشی شەوانم.

تاکو شەوێك بەڕێکەوت کتێبی گیرفانی(( چۆن بەسەر نیگەرانیە کانماندا زاڵ بین)) (کە لە زانکۆ وەکو کارێکی دەرسی لە پێش چاوی هەمووانـدا خوێندبوومەوە) م هەڵگرت و بە داستانی ویلیز کریر دەستم پێکرد. داستانی ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ خراپترین حاڵەت. کەواتە پرسیارم لە خۆم کرد خراپترین حاڵەت لە ئەگەری پارە نەدانەکەداو دانانی بەڵگەکان بەدەستی داواکاری گشتی چییە؟ ئاساییە کە لە دەستچوونی کارەکەمە، ئەمە خراپترین ڕوودواە. من ناچمە زیندان، تەنها ناوبانگ و متمانەم لە کەدار دەبێت.

پاشان بە خۆمم وت کۆمپانیاکەم لە دەست دەچێت. مێشکم ئەمەیشی وەرگرت، بەڵام دوایی چی ڕووی ئەدا؟ لەم حاڵەتەدا بێ گومان دەبوایە شوێن کارێکی تر بکەوم. ئەمەیش خراپ نییە، چونکە من شارەزایی زۆرم سەبارەت بە نەوت هەبوو. زۆرێك لە کۆمپانیاکان پێیان خۆش بوو لە گەڵ من کار بکەن. هەستێکی باشترم لا دروست بوو، ئەو ترسە خەمناکەی ماوەی سێ شەوو ڕۆژ منی داگرتبوو لەکۆڵم بووەوە. هەستەکانم ڕەنگی ئۆقرەییان بە خۆوە گرت و لە کۆتایی تێڕاماندا بۆم دەرکەوت دیسان توانای بیر کردنەوەم هەیە.

مێشکم ئەوەندە ئارام بوو کە ڕوو بەڕووی هەنگاوی سێهەم کە چاککردنی خراپترین ڕووداو بوو ڕوو بەڕوو ببمەوە. لە کاتی هەڵسەنگاندنی ڕێگە چارەکاندا فریشتەیەکی تازە بەسەرما نازڵ بوو. ئەگەر تەواوی باسەکەم بۆ نوێنەری داواکاری گشتی پارێزگا باس بکردایە، لەوانەیە ئەو بیتوانیایە ڕێگە چارەیەك بخاتە پێش دەمم کە هەرگیز بە مێشکمدا نەدەهات. بڕیارمدا بەیانی یەکەم کارم دیداری پارێزەرەکەم بێت. ئەو شەوە چوومە جێگەو ئاسوودە خەوتم.

ئەم کێشەیە چۆن تەواو بوو؟ بەیانی پارێزەرەکەم پێشنیاری دیداری داواکاری ناوچەکەو باسکردنی هەموو کێشەکەی بە مندا. کاتێك چووم بۆ دیداری داواکاری گشتی و ڕاپۆرتی هەموو بەسەرهاتەکەم بە ئەودا، لەکۆتایی سەرسوڕماندا لەوم بیست ئەم باج وەرگرتنانە چەند مانگە درێژەی هەیەو پیاوێك کە دەڵێت نوێنەری ئەوە تەنیا

دەستبڕێکەو بەدوایدا دەگەڕێن. بیستنی تەواوی ئەم قسانە لەپاش سێ ڕۆژ بەرگەی ئەشکەنجە بۆ دابینکردنی پێنج هەزار دۆلار بۆ ئەم دەستبڕە منی ئارامکردەوە.

ئەم ئەزموونە بووە دەرسێکی گەورە بۆ من. لەوە بە دواوە بە کاتی ڕو بەڕو بوونەوە لەگەڵ کێشەی نیگەران کەر کە هەڕەشەی لە من دەکرد، ڕێگە چارەی کۆنی ویلیز کریرم دەگرتە بەر.

لێرەدا گوێ لەداستانی ئورل پی هێنری بگرن. ئەم بەسەر هاتەی خۆی لە ١٧ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٨ لە هوتێل (( ئیستاتلەر بۆ یتۆن)) بۆ گێڕامەوە.

لە تەمەنی بیستو هەشتو بیستو نۆ ساڵیدا ئەوەندە گرفتاری نیگەرانی بووم کە چەند برینێك دەستیان کرد بە لەبەین بردنی پێستی گەدەم. شەوێك خوێنێکی زۆرم هەڵ هێنایەوەو بەپەلە بردیانم بۆ نەخۆشخانەیەکی کۆلێجی پزیشکی (( نۆرس وێست شیکاگۆ )).

کێشم لە ١٧٥پۆندەوە گەیشتبووە ٩٠پۆند. ئەوەندە کز ببوم کە تەنانەت جوڵاندنی دەستیشم مەترسی هەبوو. سێ پزیشکی پسپۆڕو پسپۆڕێکی بە ناو بانگ ((دیارییان)) کرد نەخۆشیەکەی من بێ چارەسەر. تەنیا بە تۆزی وشكو کەوچکێکی بچووك شیرو نیوە کەوچکێك قەیماغ لەهەر کات ژمێرێکدا دەژیام. سیستەرێك هەموو ڕۆژێك لاستیکێکی دەبردە ناو گەدەمو هەرچی تیابوو دەری دەهێنا. ئەم بەزمە چەندین مانگ درێژەی هەبوو.

سەر ئەنجام بە خۆمم وت: سەیرکە ئۆرل هێنری، ئەگەر لە مەرگێکی خاو زیاتر بۆ تۆ نییە، کەواتە دەبێ لەو کاتە کە هەی بۆت ماوەتەوە کەڵك وەربگری. هەمیشە حەزت ئەکرد لە پێش مەرگدا بە دەوری دنیادا گەشت بکەیت. کەواتە ئێستا کاتیەتی.

کاتێك بە پزیشکەکانم وت دەمەوێ بەدەوری دنیادا بگەڕێمو خۆم دەتوانم ڕۆژی دوو جار گەدەم خاڵی بکەمەوە، ئەوان تێڕامان. شتیوا نابێت! ئەوان هەرگیز شتی وایان نەبیستبوو، پێیان وتم گەر کاری وابکەم بێگومان دەریاکان گۆڕی من دەبن. من لە وەڵامدا وتم نا، پاشان بەڵێنمدا بە هەموو کەسو کارم لە گۆڕستانی بنەماڵەماندا بنێژرێم. کەواتە بڕیارمدا تابووتە کەیشم لەگەڵ خۆم بەرم. من تابووتێکم دا بە

دروست کردن‌و سواری پاپۆڕم کردو پاشان له‌گه‌ڵ ئه‌و کۆمپانیا گه‌شت‌و گوزارییه‌ سه‌باره‌ت به‌ مه‌رگی خۆم قسه‌م کرد. داوام له‌وان کرد جه‌نازه‌که‌م له‌ به‌شی سارد که‌ری پاپۆڕه‌که‌دا دابنێن‌و هه‌ر له‌وێدا بمهێڵنه‌وه‌ تا ئه‌و کاته‌ی پاپۆڕه‌که‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ وڵاته‌که‌ی خۆم.

*با به‌هره‌مه‌ندی ئه‌و شته‌ بین که‌ هێشتا هه‌مانه‌،*
*له‌ پێش ئه‌وه‌ی ئێمه‌ بسپێرن به‌ خاك*
*له‌وێدا خاك له‌گه‌ڵ خاك تێكه‌ڵ ده‌بێ*
*و له‌ژێر خاكدا ده‌بێ بخه‌وین*
*بێبه‌ش له‌ چێژی ئاواز*
*بێبه‌ش له‌ كۆتایی*

کاتێك له‌ لۆس ئه‌نجلۆس پێم نایه‌ پاپۆڕی ( پرێزیده‌نت ئادامز) و به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات به‌ ڕێكه‌وتم هه‌ستێكی باشترم هه‌بوو. به‌ره‌ به‌ره‌ تۆزی ئالكاین‌و په‌مپی گه‌ده‌مم لابرد. چی تر ده‌متوانی هه‌ر خواردنێك بخۆم. ته‌نانه‌ت تێكه‌ڵه‌ نه‌ناسراوه‌كانی ناوچه‌ جۆراو جۆره‌كان كه‌ زامنی مه‌رگم بوون. هه‌رچی هه‌فته‌كان تێپه‌ڕ ده‌بوون باشتر ده‌بووم. ته‌نانه‌ت جگه‌ره‌ی ڕه‌شی كوبیم ده‌كێشا ئه‌وپه‌ڕی چێژم له‌ ژیان وه‌رده‌گرت. چیتر له‌و تۆفان‌و دێوو درنجانه‌ی منیان ده‌خسته‌ ناو تابوته‌كه‌م( ئه‌گه‌ر چی له‌تاو ترس بوو) تێپه‌ڕیبووم. كاتێك له‌ناو پاپۆڕه‌كه‌دا بووم هاوڕێیانێكی نوێم په‌یداكرد كه‌له‌گه‌ڵ ئه‌واندا سه‌ر گه‌رمی یاری كردن ده‌بووم، گۆرانیم ده‌وت‌و تا نیوه‌ شه‌و نه‌ده‌خه‌وتم. كاتێك گه‌یشتینه‌ هندستان‌و چین، ئینجا بۆم ده‌ركه‌وت ئه‌و نیگه‌ران كاریانه‌ی له‌ وڵاته‌كه‌مدا هه‌بوو له‌ چاو هه‌ژاری‌و برسیه‌تی زاڵ به‌سه‌ر وڵاتانی ڕۆژهه‌ڵاتدا هیچ نه‌بوو. هه‌موونیگه‌رانیه‌ بێ ماناكانم وه‌لاوه‌ ناو هه‌ستێكی باشترم ته‌جره‌به‌ كرد. له‌كاتی گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ ئه‌مریكا كێشم ٩٠ پۆند زیادی كردبوو، كه‌مو زۆر نه‌خۆشی گه‌ده‌مم له‌ بیر بردبووه‌وه‌. هه‌رگیز وه‌ها هه‌ستێكی باشم له‌ ژیاندا نه‌بوو. گه‌ڕامه‌وه‌ بۆ سه‌ر كاره‌كه‌م‌و له‌و كاته‌وه‌ تا ئێستا تووشی هیچ نه‌خۆشیه‌ك نه‌بووم.

من تەواوی ئەو بنەمایانەی ((ویلیز کرین)) بۆ لەناو بردنی نیگەرانیەکان باسی کردبوو ئەنجامم دا. سەرەتا پرسیارم لەخۆم کرد خراپترین ڕووداو چییە؟ وەلآم: مەرگ. دووەم، خۆمم بۆ وەرگرتنی مەرگ ئامادە کرد، چارێکم نەبوو، پزیشکەکان نەخۆشیەکەی منیان لە چارە نەهاتوو دیاری کردبوو. سێهەم، هەولّم دا بارو دۆخم بە ئەوپەڕی چێژ وەرگرتن لە تەمەنی کورتم باش بکەم....

ئەگەر لە پاش سوار بوونم بۆ ناو پاپۆڕەکە دیسان توشی نیگەرانی ببومایە، گومانی تیا نەبوو پاشماوەی گەشتە دەریاییەکەم لەناو تابووتەکەمدا درێژە پێ ئەدا. بەلآم خۆڕاگربووم و تەواوی کێشەکانم لە بیر بردەوەو ئەم ئۆقرەیی مێشکە وزەیەکی نوێی لە دەرونی مندا دروست کرد کە لە کۆتاییدا ژیانمی ڕزگار کرد. کەواتە یاسای ژمارە ٢ دەڵێت: ئەگەر گرفتێکی نیگەرانکەرتان هەیەو

ڕێگە چارەی سیحراوی ویلیز کریر بەم سێ قۆناغەی خوارەوەبگرنە بەر:

١- پرسیار لەخۆتان بکەن خراپترین ڕووداو چی دەبێت؟

٢- ئامادە بە لە ئەگەری ڕووداندا وەریبگریت.

٣- بە ئارامی و خەیاڵەوە دەست بدەرە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە.

## بابەتی سێیەم

# دڵەڕاوکێ چ بەڵایەکتان بەسەر دێنێت؟

بازرگانێك كە نازانێت چۆن بەسەر
نیـــگەرانی خۆیدا زاڵ بێت، ناچارە
بـــە مەرگی ناوادە.

((دکتۆر ئالکسیس کارل))

ماوەیەك لەمەو بەر لە کاتی ئاوابوونی خۆردا یەکێك لە دراوسێکان زەنگی دەرگامانی لێداو داوای لێکردین هەموومان بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشی ئاوڵە خۆمان بکوتین. ئەو تەنیا یەکێك لە هەزاران خۆبەخشانێك بوو کە لە شاری نیویۆرك زەنگی دەرگاکانیان لێ ئەدا. ئەو کاتە خەڵك بە ترسەوە شاڵاویان بۆ ڕیزەکانی خۆ کوتان دەبرد. وێستگەکانی خۆکوتان نەك هەر لە نەخۆشخانەکاندا بەڵکو لە بنکەی ئاگر کوژێنەوە، بنکەی پۆلیس و کارگە پیشەییە گەورەکانیشدا دەمەزرابوو. زیاتر لەدوو هەزار پزیشك و سیستەر شەوو ڕۆژ بە شەوقەوە خەڵکیان دەکوتا، بە بڕوای ئێوە هۆی ئەم هەموو شەوقە چی بوو؟ هەشت کەس لەوەپێش تووشی نەخۆشییەکە بوبون. دوو کەسیان گیانیان لەدەستدابوو. مەرگی دوو کەس لەناو ژمارەیەکی هەشت ملیۆن کەسیدا!

ئێستا ڕێك سی و حەوت ساڵە لەم شارەدا دەژیم، بەڵام هێشتا هیچ کەس دەرگای ماڵەکەمی بۆ ئاگادارکردنەوە لەنەخۆشی دەروونی نەکوتاوە. نەخۆشییەك کە لەماوەی سی و حەوت ساڵی ڕابردوودا دە بەرابەر زیاتر لەزیانەکانی ئاوڵەی دروست کردووە. هیچ کەسێك دەرگای ئەم ماڵەی نەکوتاوە بڵێت لەهەر دە کەسێك لەئەمریکا دەژی یەك کەسیان تووشی هەڵپڕژاوی دەروونی دەبێت. کەواتە بەشێك لەم کتێبە بۆ لێدانی دەرگای ماڵی ئێوەو ئاگادارکردنەوەی ئێوە دەنووسم..

براوەی خەڵاتی گەورەی نۆبڵی پزیشكی، دكتۆر ئالكسیس كارل دەڵێت: ((بازرگانێك كە نازانێت چۆن بەسەر نیگەرانی خۆیدا زاڵبێت، ناچارە بە مەرگی پێشوەخت))..

هەر ئەم ئەنجامە چاوەڕێی ژنانی ماڵەوە، پزیشكی ئاژەڵان و كرێكارانی بیناسازی دەكات. كە ناتوانن بەسەر نیگەرانیدا زاڵبن.

چەند ساڵ لەمەوبەر پشووی هاوینم بۆ شۆفێری لەتەكساس و نیومەكسیكۆ لەگەڵ دكتۆر ئیف گابر، یەكێك لەبەڕێوەبەرانی كۆمپانیای شەمەندەفەری سانتافی تەرخان كرد. ئێمە كەوتینە باس كردن دەربارەی كاریگەری زیان بەخشی نیگەرانی و دڵەڕاوكێ. ئەو دەیوت: ٧٠٪ی ئەو نەخۆشانەی سەردانی پزیشك دەكەن خۆیان دەرەقەتی دەرمانكردنی خۆیان دێن، تەنیا ئەگەر بتوانن بەسەر نیگەرانیدا ساڵ بن.

پێتان وانەبێ نەخۆشی ئەوان خەیاڵییە. نەخۆشی ئەوان بە ئەندازەی ددان ئێشەیەكی پڕئێش و جاری وایە سەد قات جدیترە. من ئەم نەخۆشییانە بە هەرس نەكردنی دەروونی ناودەبەم. بەشێك لەبرینی گەدە، نەخۆشییەكانی دڵ، بێ خەوی، ژانە سەرو چریكە هەموو ئەمانە نەخۆشی راستەقینەن. من خۆم ١٢ ساڵ ئازاری برینی گەدەم چەشتووە، كەواتە باش ئەزانم ئەڵێم چی..

ترس دەبێتە هۆی نیگەرانی و دڵە ڕاوكێ. نیگەرانی ئێوە بێزارو ڕژد ئەكات و كار دەكاتە سەر دەمارەكانی گەدەتان و لە ڕاستیدا لیكی گەدەتان لە حاڵەتی سروشتییەوە دەباتە حاڵەتی نا سروشتی و دەبێتە هۆی برینی گەدە.

دكتۆر جۆزف مۆنتاج نووسەری كتێبی (( گرفتی گەدەی عەسەبی )) یش هەر ئەو ڕایە دەردەبڕێت. ئەو لە درێژەدا دەڵێت: (( ئێوە لەو شتەوە تووشی برینی گەدە نابن كە دەیخۆن،

بەڵكو برینی گەدە لەو شتەوە دروست دەبێت كە ئێوە دەخواتەوە.))

دوكتۆر ونیسی ئالاورێز لە نەخۆشخانەی مایۆوە دەڵێت: (( برینەكانی گەدە زۆربەی كات كتوپڕدەكەونە ڕوو، یان لەگەڵ بەرزی و نزمی هەستدا دێنە جۆش و دەنیشنەوە.))

ئەم وتەیە بەلێكۆڵینەوە لەسەر ١٥٠٠٠ نەخۆش كە لە ژێر چارەسەری نەخۆشیەكانی گەدەدا بوون، ڕاست دەبێتەوە. لە هەر پێنج نەخۆشێك چوار كەسیان

هیچ بنەمایەکی فیزیکی لە نەخۆشی گەدەیاندا نەبووەو تەنیا فاکتەری وەکو ترس، نیگەرانی، نەفرەت، خۆبەزلزانی و بێ توانایی هۆکاری سەرەکی نەخۆشیەکانی گەدەو برینەکانی بووە.

برینەکانی گەدە کوشندەن. بە گوێرەی بابەتێکی گۆڤاری (( ژیان )) ئەم نەخۆشیە لە پلەی دەیەمی نەخۆشیە کوشندەکاندایە. دوکتۆر هارۆلد هابین لە نەخۆشخانەی مایووە ( بە پشت بەستن بە نامەیەک کە لە کۆبوونەوەی ساڵانەی ئەنجومەنی ساڵانەی ئەمریکایی بۆ پزیشکان و پسپۆرەکانی خوێندنەوە ) لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر ١٧٦کەس لە کاربەدەستانی بازرگانی ئەنجامداوە کە تەمەنی مامناوەندییان ٤٤،٣ ساڵ بوو، بۆی دەرکەوت زیاد لە یەک ٣/١ ئەم کەسانە نەخۆشی درێژخایەنی تایبەت بە نیگەرانیە دەروونیە ڕادەبالاکان واتە نەخۆشی دڵ، پاڵە پەستۆی خوێن و برینی کۆئەندامی هەرسیان هەیە.

من باوەڕم وایە نزیکەی یەک لەسەر سێی بەڕێوەبەرانی بازرگانی لە پێش ئەوەی بگەنە تەمەنی ٤٥ ساڵی، بەهۆی نەخۆشیەکانی برینی گەدە یان پاڵەپەستۆی خوێن و یان نەخۆشی دڵ لەناو دەچن. بەڕاستی چ نرخێک بۆ سەرکەوتنیان ئەدۆڕێنن، لە حاڵێکدا تەنانەت سەرکەوتنیش نابێتە نەسیبیان. ئایە هەر کەسێک بۆ پێشکەوتنی کارەکەی دەتوانێت بە نرخێکی گران وەکو برینی گەدەو نەخۆشی دڵ سەرکەوتوو بێت؟ چ قازانجێک دەست پیاو ئەکەوێت ئەگەر تەنانەت تەواوی دنیاش بە دەست بێنێت بەڵام تەندروستی لەشی لەدەست بدات؟ تەنانەت ئەگەر تەواوی دنیاش ببێتە هی ئەوتەنیا دەتوانێت لە یەک جێگەوباندا بخەوێت و تەنیا سێ ژەم خواردن بخوات. بەئاشکرا دەیڵێم، پێم باشترە کرێکارێکی جووتیار بم لە ئالاباما تاکو بەڕێوەبەری شەمەندەفەر یان کارگەی جگەرە کە لە ٤٥ ساڵیدا تەندروستیم لەدەست بدەم. یەکێک لە بەناوبانگترین بەرهەم هێنەرانی جگەرەی جیهان ( ئێستا کە باسی جگەرە هاتووەتە پێشەوە) لەم ماوەدا بەهۆی خوێن نەگەیاندنی دڵیەوە مرد. ئەو ملیۆنەها دۆلاری کۆکردەوەو لەتەمەنی ٦١ ساڵیدا ژیانی بەجێهێشت. پێدەچێت ساڵانێکی زۆری لەو شتەی ناوی سەرکەوتنی پیشەییە دانابێت. تائەو شوێنەی من بزانم ئەم بەڕێوەبەری کارگەی جگەرەیە بەتەواوی سەرمایەی چەند ملیۆنەوە بە ئەندازەی باوکی من کە

کابرایەکی جوتیار بوو، لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا بەبێ یەك دۆلار دارایی مرد، سەر کەوتنی بە دەست نەهێنابوو.

برایانی ناوداری مایۆدەڵێن: (( نیوەی تەختەکانی نەخۆشخانە بە نەخۆشە دەروونیەکان پڕ بوون.)) لێکۆڵینەوە لەسەر تەزووە عەسەبیەکانی ئەم نەخۆشخانە لە ژێر وردبینیدا بە ئاشکرا تەندروستی ئەوان پیشان ئەدات. کێشە عەسەبیەکانی ئەوان بەهۆی خراپ بوونی فیزیکی عەسەبەکانەوە نیە، بەڵکو بەهۆی پووچی،بێهودەیی، نیگەرانی، دڵە ڕاوکێ، ترس و شکست و بێهیواییە. ئەفلاتوون پێی وایە گەورەترین هەڵەیەك کە پزیشکەکان دەیکەن ئەوەیە کە جەستە بەجیا لەمێشك دەرمان ئەکەن، لە حاڵێکدا مێشك و جەستە یەکێکن و ناتوانن بە جیا چارەسەر بن. زانستی پزیشکی ٢٣٠٠ ساڵ کاتی بەوە بردەسەر تاکو ئەم ڕاستیە گەورەیە دیاری بکات. بەڵام ئێستا جۆرێکی تر لە پزیشکی باوەکە پێی دەڵێن پزیشکی دەروون جەستەیی، پزیشکیەك کە جەستەو ڕۆح پێکەوە چارەسەر دەکات. بەڕاستیش تۆزێك درەنگ بووە بۆ ئەوەی سود لەم زانستە وەربگرین، چونکە زانستی پزیشکی بە شێوەیەکی بەربڵاو ئەو نەخۆشیە ترسناکانەی بەهۆی میکرۆبە فیزیکیەکانەوە دروست دەبن، لە ناو بردووە. ( وەکو ئاوڵە، کولێرا، تای زەردو.....)، بەڵام ئەم زانستە نەی توانیوە خۆی لەگەڵ زیانە دەروونی و فیزیکیەکان کە هەستەکانی دڵنیگەرانی و ترس و نەفرەت و ناکامی و....دروستی دەکات، بگونجێنێت. زیانە دروست بووەکان لەم نەخۆشیانە بە خێراییەکی قەیراناویەوە ڕوو لە زیاد بوونە. پزیشکان باوەڕیان وایە لە هەر بیست کەسی ئەمریکی لە ژیاندا یەك کەس دەورەیەك لەتەمەنی لە نەخۆشخانەی دەروونی بردووەتە سەر. لەهەر ٦ گەنجی ئەمریکی کە خەریکی خزمەتی سەربازین لەشەڕی دووەمی جیهانیدا یەك کەس بە هۆی نەخۆشی دەروونییەوە دەرکراوە. هۆی شێت بوون چییە؟ کەس نازانێت، بەڵام پێدەچێت لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ترس و نیگەرانی فاکتەری خێرا کردنی بن. کەسی نیگەران و بێزار کە ناتوانێت خۆی لەگەڵ دنیای ستەم کاری ڕاستیدا بگونجێنێت تەواوی پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دنیا دەبڕێت و دەخزێتە ناو خەیاڵاتی خۆ دروست کەری خۆیەوە. هەروا کەیادی کتێبی دوکتۆر ئیدوارد پادۆکسیان کردەوە بەناوی (( نیگەرانیەکان وەلاوەبنێ تاکو باش ببیت.....)).

ئەو لەم کتێبەدا باسی چەند بابەتێکی وەکو دڵە ڕاوکێ و نیگەرانی دەکات. هەندێک لە سەر بەشەکانی ئەم کتێبە بریتین لە:

- دڵە ڕاوکێ چی لە دڵی ئێوە دەکات؟
- پاڵەپەستۆی زۆری خوێن بەهۆی نیگەرانیەوەیە.
- نیگەرانی هۆکاری ڕۆماتیزم
- نیگەرانی و ڕژێنەری تیرۆئید
- نەخۆشی شەکرەی دڵنیگەران

کتێبێکی تر کە لەم بوارەدا نوسراوە کتێبی (( مرۆڤ لە دژی خۆی))ە نووسینی دوکتۆر کارڵ مەنینگەر. یەکێک لە برایانی مایۆ پێی وایە کتێبەکەی مەنینگەر هیچ ڕەوشێک بۆ دووری گرتن لە دڵە ڕاوکێ پیشان نادات، بەڵکو ئاشکرا کردنێکی دڵهەژێن دەکات سەبارەت بەو شتەی نیگەرانی: ناکامی؛ نەفرەت، دڵ شکاوی، سەرکەشی و ترس بەسەر جەستەی ئێمەی دێنێت. ئەم کتێبە دەتوانن لە کتێبخانە گشتیەکان دەست بخەن.

نیگەرانی تەنانەت بێبەزەیی ترین مرۆڤەکانیش نەخۆش دەخات. ئەم بابەتە ژەنەراڵ گرانت لە دوایین ڕۆژەکانی شەڕی ناو خۆییدا بۆی دەرکەوت. ئەو ناوچەی ڕیچمۆندی بۆماوەی ٩ مانگ خستبووە گەمارۆی خۆی. سەربازانی ژەنەراڵ ((لی)) لەتاو ماندوویەتی و برسیەتی و بە جلی کۆن و دڕاوەوە شکستیان خوارد. تەواوی گوڕدانەکە لە یەک ساتدا بەرەڵا بوو، پاشماوەی سەربازەکانیش لە خێوەتەکانیاندا بە گریان و تکاوە کۆڕی دۆعایان بەرپا دەکرد. کۆتایی شەڕ نزیک بوو. سەربازانی ژەنەراڵ ((لی)) عەمبارەکانی لۆکەو توتنیان لە ڕیچمۆند ئاگر تێبەردا. عەمباری تەقەمەنیان تەقاندەوەو لە حاڵێکدا بڵێسەکانی ئاگر لە تاریکیدا دەیانگوڕاند بەشەودا، لە شار هەڵهاتن. ژەنراڵ گرانت بەتوندی و لە هەردوو لاوە کەوتبووە گەمارۆ و بەدوادا گەڕان. سوارەکانی شریدینیش ئەوانیان لە پێشەوەو بە بڕینی هێڵی شەمەندەفەرو تاڵان کردنی شەمەندەفەرەکانی هەڵگری ئازوقە خستبووە فشارەوە.

ژەنەراڵ گرانت لەتاو ژانەسەر خەریک بوو کوێردەبوو؛ بەدوای سوپاکەیدا لە کێڵگەیەک وەستا. ئەو دەنووسێت: (( ئەو شەوەم لە کێڵگەدا بردەسەر. قاچم لە ئاوی

گەرمو خەرتەڵدا شۆردو پشتە دەستمو پشتە ملیشم لەزگەی خەرتەڵم لێدا، بەو هیوایەی تا بەیانی چاك ببنەوە. بەیانی ڕۆژی دوایی زامەکانم چاك بوونەوە، بەڵام نەك بەهۆی لەزگەی خەرتەڵەوە بەڵکو لەبەر ئەو هەواڵەی سوارەکان بە چوار ناڵەکی بۆیان هێنام. ئەم نامە دەیوت ژەنەراڵ ((لی)) دەیەوێ خۆی بەدەستەوە بدات. کاتێك مفەوەزی هەڵگری نامەکە هات بۆلام هێشتا سەرم دەئێشا، بەڵام لەگەڵ بینینی ناوەڕۆکی نامەکە ژانە سەرەکەم باش بوو.))

کەواتە ئەم کێشەو نیگەرانیانەی گرانت بوو کە ئەوی تووشی نەخۆشی کردبوو، کاتێك هەستەکانی ڕەنگی متمانەو سەرکەوتن بەخۆوەگرت کتوپڕ ژانە سەرەکەیشی چاك بووەوە.

حەفتا ساڵ دوای ئەوە هێنری مۆرگنتۆ، سکرتێری خەزنەداری دەوڵەتی هەڵبژێردراوی فرانگلین ڕۆز ڤێلت گەیشتە ئەو ئەنجامە کە دڵە ڕاوکێ ئەوەندە ئەوی نەخۆش خستووە کە تووشی سەرە گێژە بووە. ئەو لە نوسراوەکانیدا دەڵێت کاتێك سەرۆك کۆمار ٤٤٠٠٠٠ سیپە گەنمی بە مەبەستی گران بوونی نرخی گەنم کڕی، من بە سەختی تووشی نیگەرانیو دڵە ڕاوکێ بووم. ئەو لە درێژەدا دەنووسێت کاتێك گەیشتمەماڵەوە ئەوەندە گێژ ببووم کە خێرا چوومە جێگاکەمو دوو کاتژمێر خەوتم.

ئەگەر ئەتانەوێ ئاگاداری کاریگەرییەکانی نیگەرانی ببنەوە تەنیا ئەوەندە بەسە لە پەنجەرەوە سەیرێکی دەرەوە بکەن، پێویست ناکات بچن بۆ کتێبخانە یان بۆ لای پزیشك. من لەوێوە بینیم دڵنیگەرانی چی بەسەر سیستەمی عەسەبی یەکێك لە دراوسێکاندا هێنابوو، دراوسێیەکی تر کە بە هۆی دڵە ڕاوکێوە تووشی نەخۆشی شەکرە ببوو، چونکە نرخی بەش لەبازاڕی بوورس دابەزیبوو، ئوورەو شەکرەی خوێنی ئەو هەڵگەڕابوو.

کاتێك فەیلەسووفی ناوداری فەڕەنسایی، ((مونتیگ)) وەکو سەرۆکی شارەوانی زێدی خۆی هەڵبژێردرا بە هاوشارییەکانی وت: دەمەوێ تەواوی کاروباری ئێوە هاوشاریم لە دەستمدا بگرم نەك لە ناو سیەکانو جەرگمدا.

ئەم دراوسێیەی ئێمە کاروباری پەیوەست بە بازاڕی بوورسی کێشایە ناو سیستەمی خوێنی خۆیو سەرەنجام خۆی بە کوشتندا. ئەگەر بمەوێت ئاگاداری ئاسەواری نیگەرانی لەسەر خەڵك بم، پێویست ناکا سەر بکێشمە ماڵی

دراوسێکانمان، بەڵکو سەیرێکی سەر زارەکی هەر ئەم ژوورە بکەم کەتیایدا سەر گەرمی نووسینمو بیر هێنانەوەی ئەوەی خاوەنی پێشووی ئەوەندە لە نیگەرانیدا بوو کە خۆی لە گۆڕستان بینیەوە.

نیگەرانی دەتوانێ ئێوە لەسەر کورسی چەرخداری تایبەت بە نەخۆشانی ڕۆماتیزمیو ئارترۆزی دانیشێنێت. دوکتۆر ڕاسل ئەلسیسیل لە کۆلێجی پزیشکی کۆرنەڵەوە، پزیشکی پسپۆڕلە نەخۆشیە ئارترۆزییەکاندا چوار فاکتەری سەرەکی کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی ئارترۆز ئاوا دەناسێنێت:

١- شکست لە هاوسەر گیریدا.

٢- شکستی بازرگانیو تەعزیە.

٣- نیگەرانیو تەنیایی.

٤-ڕقو کینە کۆکراوەکان.

دیارە ئەم چوار بارودۆخە بەتەنیا ناتوانن هۆکاری ئارترۆز بن. جۆری تری ئەم نەخۆشیەش بە هۆکاری تر دروست دەبن. بەڵام چوار هۆکاری سەرەکی کە بە شێوەی باو دەبنە هۆی ئەم نەخۆشیە، هەمان فاکتەرە ناو براوەکانن لەلایەن دوکتۆر ڕاسڵ ئەلسیسیلەوە. بۆ نموونە یەکێك لە هاوڕێکانم دەیوت لە قەیرانێکی داراییدا کۆمپانیای غاز بۆریەکانی غازی داخست بانکیش سیستەمی ڕەهنی خانووی داخست. هاوسەرەکەی کتوپڕ تووشی چریکەی توندی ئارترۆز بوو، سەرەڕای دەواو دەرمانو پارێزی خۆراك ژانی ئارترۆز تاکاتێك بارو دۆخی ماددیان باشتر بوو، درێژەی هەبوو. نیگەرانیو دڵەڕاوکێ تەنانەت دەبێتە هۆی خراپ بوونی ددانەکان. دوکتۆر ویلیام مەگونگیل لە وتارێکدا لە ئەنجومونی پزیشکانی ددانی ئەمریکا وتی: (( هەستی ناخۆشی وەکو هۆکارە نیگەران کەرەکانی ترس، بۆڵە بۆڵ....دەتوانن هاوسەنگی کالسیۆمی لەش بشێوێننو ببنە هۆی خراپ بوونی ددانەکان.)) ئەو هەروەها باسی یەکێك لە نەخۆشەکانی کردو وتی ئەم نەخۆشە ددانی بەهێزو تەندروستی هەبوو، بەڵام کاتێك هاوسەرەکەی تووشی نەخۆشی بوو، لە ماوەی سێ هەفتە خەواندنی ئەو لە نەخۆشخانە نۆ دانە لە ددانەکانی خراپ بوون. ئەم خراپ بوونانە بەهۆی نیگەرانی لە نەخۆشی هاوسەرەکەیەوە بوو.

ئایا ئێستا کەسێکتان بە تیرۆئیدی پڕکارەوە دیوە؟ من دیومە. دەتوانم بڵێم ئەوان توشی لەرز دەبن، وەکو کەسانێك کە لەتاوترسی بەرەو مەرگ دەڕۆن. ئەگەر تیرۆئید، ڕژێنەرێك کە هاوسەنگی لەش و لێدانی دڵ ڕێك دەخات، لە شوێنی خۆی هەڵبگرێت، لێدانی دڵ زۆر دەبێت و تەواوی لەش وەکو کوورەی گەرم دێتە خرۆش و ئەگەر بەهۆی نەشتەر گەری یان دەواو دەرمانەوە چارەسەر نەکرێت نەخۆشەکە دەمرێت.

ماوەیەك لەمەوبەر لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانمدا کە تووشی ئەم نەخۆشیە بوو چوین بۆ فیلا دلفیا. ئێمە لەگەڵ دوکتۆر ئیسراییل برام، پزیشکی پسپۆڕ کەماوەی سی و هەشت ساڵ ئەم نەخۆشیە سەختانەی دەرمان دەکرد ڕاوێژمان دەکرد. ئەمە پەندێکە کە لەسەر دیواری ژووری چاوەڕوانی نەخۆشەکانیدا نووسیویەتی و من لە پشتی پاکەتە نامەیەك نووسیم:

ئۆقرەیی و حەسانەوەی مێشك

باشترین چالاکیە ئارام بەخشەکان

ئایین، خەو، مۆسیقاو پێکەنینە

باوەڕتان بە خوا هەبێت، باش خەوتن تێبگەن

چێژ لە مۆسیقای جوان وەرگرن تاکو لایەنە جوانەکانی ژیان ببینن

لەم حاڵەتەدا تەندروستی وشادی لە دەستی ئێوەدایە.

یەکەم پرسیار لە هاوڕێکەمی کرد ئەوە بوو چ جۆرە خەلەلێکی هەستی ئەم بارو دۆخەی بۆ هێناویتە پێشەوە؟ پاشان ئاگاداری کردەوە ئەگەر نیگەرانی لە خۆیدا کۆنترۆڵ نەکات، بێگومان ئەنجامی خراپتری وەکو نەخۆشی دڵ، برینی گەدە، یان شەکرە چاوەڕێی دەکات. ئەم پزیشکە بەناو بانگە لە درێژەدا وتی تەواوی ئەم نەخۆشیانە پێکەوە نزیکن. بێ گومان کەنزیکن، تەواوی ئەوانە بە نەخۆشیە نیگەرانیەکان دەژمێردرێن.

لە دیدارێکدا لەگەڵ مارلی ئۆبرۆن ئەو وتی نیگەرانی وەلاوە ناوە. چونکە بەباشی دەزانێت نیگەرانی چۆن سەرمایەی سەرەکی ژیانی واتە ئەکتەری لە سینەمادا لەناو دەبات. ئەو دەڵێت: کاتێك دەمویست بۆ یەکەم جار بچمە ناو سینەماوە نیگەران بووم. تازە لە هندستان هاتبوومەوەو کەسم لە لەندەن نەدەناسی. بەدوای کارێکی گونجاوەوە بووم. لەگەڵ ژمارەیەك دەرهێنەردا دیدارم کرد، بەڵام هیچ کامیان وەریان

نەگرتم. بەو پارە کەمەی بۆم مابووەوە شکستم مسۆگەر بوو. بۆ دووەم هەفتە تەنیا ئاوو پسکیتم دەخوارد. ئێستا چیتر تەنیا نیگەران نەبووم، بەڵکو برسیش بووم. بەخۆمم وت لەوانەیە من زۆر کەر بم، لەوانەیە هەرگیز نەتوانم بچمە ناو کاری سینەماوە. سەرەڕای ئەوە من هیچ ئەزموونێکیشم نەبوو، هەرگیز ڕۆڵم نەگێڕا بوو، لە ڕوخسارێکی کەم و زۆر جوان زیاتر هیچم نەبوو.

کاتێك خۆمم لەناو ئاوێنەدا بینی کوت وپڕ بۆم دەرکەوت ترس و نیگەرانی چی بەسەر ڕوخسارم هێناوە. چرچ و لۆچ بەهۆی نیگەرانیەوە ڕوخسارمی تێك شکاندبوو. بڕیارمدا خێرا دڵە ڕاوکێ بنێمە کەنارو ئاسەوارەکانی لە ڕوخسارم پاك بکەمەوە. تەنیا شتێك کەبۆ سینەما هەمبوو ڕوخسارم بوو، نەمدەویست نیگەرانی لەناوی بەرێت.

گەلێك هۆکار دەتوانن ڕوخساری ژنێك پیرو خراپ بکەن، بەڵام هیچ کامیان لەبواری خێراییەوە بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێ ناگاتەوە. نیگەرانی جەستە ڕەق و عەبووس دەکات، شەویلگەکان پێکەوە گرێ ئەدات و ڕوخسار پڕ لە چرچ دەکات. جێگەی ناوچەوانی هەمیشەیی گرژی دەهێڵێتەوە، ڕەنگی قژ بۆر دەکات و تەنانەت دەبێتە هۆی وەرینیان، ڕەنگی ڕوخسار خراپ دەکات و خوران و زیپکەو پەڵە دروست دەکات.

ئەمڕۆکە لە ئەمریکا نەخۆشی دڵ بە کوشندە ترین نەخۆشیەکان ناو دەبەن. لەماوەی شەڕی دووەمی جیهانیدا چوار سەد هەزار کەس گیانی خۆیان لەدەست دا، بەڵام هەر لەو دەورانەدا نەخۆشی دڵ دوو ملیۆن خەڵکی سڤیلی کردە قوربانی کەیەك ملیۆنی بەهۆی نەخۆشی دڵی دروست بوو لە نیگەرانی شەڕو فشارەکانی ژیانەوە بوو. بەڵێ، نەخۆشی دڵ یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی مەرگی مرۆڤە نیگەرانەکان. بەوتەی دوکتۆر ئالکسیس کاری بازرگانێك کە ڕێگەی بەرەنگار بوونەوەی نیگەرانی نازانێت ناچارە بەمەرگی پێشوەخت.

ڕەش پێستەکانی ناوچەکانی باشوورو چینیەکان زۆر کەم تووشی نەخۆشی دڵ بەهۆی نیگەرانیەوە دەبن، چونکە لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتەکاندا زۆر عاقڵانە مامەڵە دەکەن. پزیشکان بیست ئەوەندەی کرێکارانی کێڵگەکان بە جەڵدە دەمرن. پزیشکان ژیانێکی پڕکێشەیان هەیەو باجەکەیشی ئەدەن.

ویلیامز جیمز دەڵێت: خودا لە تاوانەکانمان دەبورێت بەڵام سیستەمی دەمارییمان (عەسەبیمان) هەرگیز لێمان نابوورێت. ڕاستیەکی هەژێنەرو کەمو زۆر دوور لەباوەڕە کە ژمارەی ئەو ئەمریکیانەی دەست ئەدەنە خۆکوشتن زیاترە لەوانەی بەهۆی پێنج نەخۆشی واگیری باو دەمرن. بۆچی؟ وەڵام تەنیا نیگەرانیە. کاتێك فەرماندەیانی بێ بەزەیی لە شەڕی چیندا دەستیان ئەدایە ئەشکەنجەی زیندانیەکان، بەگشتی ئەوانیان لە ژێر کیسەیەکی ئاودا دائەنا کە بەردەوام دڵۆپەی دەکردو دەستو قاچیان دەبەستنەوە. ئەو دڵۆپە ئاوانەی بەسەر سەریاندا دەهاتە خوارەوە، سەرەنجام وەکو دەنگی لێدانی چەکوش ئەوانی شێت دەکرد. ئەم میتۆدە لە ئۆردووگاکانی سەربازی هیتلەر لە ئەڵمانو هەروەها لە دەورانی بەدوادا گەڕانی ئیمانی ئاینی کڵێسا لە ئیسپانیایشدا بەڕێوە دەچوو. نیگەرانی وەکو دڵۆپی ئاو کار لە عەسابی مرۆڤ دەکاتو شێتی دەکات تائەو شوێنەی دەست بداتە خۆکوشتن.

ئەوکاتە کە منداڵێکی لادێی لە میسوری زیاتر نەبووم لە بیستنی وتارەکانی قەشە بیل ساندی سەبارەت بە بڵێسەکانی ئاگری دۆزەخ تاسنووری مەرگ دەترسام. بەڵام ئەم قەشەیە هەرگیز لە بڵێسەی ئەو ڕەنجانەی نیگەرانی دروستی دەکرد باسی نەکرد. بۆ نموونە ئەگەر تووشی دڵە ڕاوکێی بەردەوام بووبن، شیمانەی تووش بوون بەیەکێك لە سەختترین نەخۆشیەکانی درێژ خایەنی مرۆڤ واتە ئانژین هەیە. کەواتە ئەگەر ئەم هەمووە لەبابەتێك بێ تاقەتیت بۆچی لە کۆتاتی ڕەنجدا هاوار ناکەیت، هاوارەکانت دەنگێك وەکو دەنگی (( دۆزەخی دانتە )) دروست دەکەن. لە پاش ئەوە بەخۆت دەڵێیت خودایە ئەگەر لەم دەردە ڕزگارم بێت چیتر هەرگیز بابەتێك بۆ نیگەرانی بوونی نیە ( ئەگەر پێتان وایە فشە دەکەم پرسیار لە پزیشکی بنەماڵەکەتان بکەن تاکو پێتان بڵێت ).

ئایا عاشقی ژیانن؟ ئایا دەتانەوێت تەمەنێکی درێژتان هەبێتو ژیانێکی تەندروستتان هەبێت؟ ئەمە چارەسەرێکە کەدەتوانن بیکەنە کار. دیسان وتەیەکی دوکتۆر ئالکسیس کارڵ بیر دێنمەوە: (( ئەوانەی ئارامی دەروونیان لە هەڵاو هەمهەمەی ژیانی مۆدێرن لە دەست نادەن لە تووش بوون بە نەخۆشیە دەروونیەکان پارێزراون؟))



 

دەتوانن ئارامی دەروونتان لە دەنگ‌وهەمهەمەی ژیانی مۆدێرندا بپارێزن؟ ئەگەر کەسێکی ئاسایین وەڵام ((بەڵێ))یە. زۆربەی ئێمە بەهێز ترین لەوشتەی خۆمان بیر دەکەینەوە. ئێمە سەرچاوەی دەروونیمان هەیە کەپێدەچێت ئەوانە نەناسین. بەجۆرێك ((تارۆ)) لە کتێبە مێژووییەکەیدا دەنوسێت:

(( دەزانم بۆ مرۆڤ ڕاستیەکی دڵخۆشکەرتر لە توانای بێ سنووری لە پێش خستنی ژیانی خۆی بە هەوڵی هۆشیارانە بوونی نیە. ئەگەر کەسێك لەڕێگەی ئاواتەکانیدا بەمتمانەوە هەنگاو هەڵدەگرێت و ڕێگەی ئەو ژیانەی لە مێشکیدا دروستی کردووە هەوڵ ئەدات، بەرەوڕووی ڕاستیەکی چاوەڕوان نەکراو دەبێتەوە.))

بێگومان زۆربەی خوێنەرانی ئەم کتێبەش بە ئەندازەی ((ئۆلگا جارۆی)) خاوەنی تواناو نیادەو سەرچاوەی دەروونین. ژمارەی ماڵەکەی ئەو ۸۲۹، کۆردۆئالێن، ئایدا هووە. ئەو توانی لەو ڕاستیە تێبگات کە لە سەختترین هەل‌و مەرجیشدا دەبێ نیگەرانی دوور بکەینەوە. من بڕوام وایە من‌و ئێوەیش ئەگەر بۆچونە کۆنەکانی ئەم کتێبە بگرینە بەر، دەتوانین دووری لە نیگەرانی بگرین. ئەمەیش داستانی ((ئۆلگا جارۆی)) :

هەشت ساڵ‌و نیو لەمەوبەر حوکمی مەرگێکی هێدی‌و پڕ ڕەنجی بەهۆی شێر پەنجەم بەسەردا درا. باشترین پزیشکە پسپۆڕەکانی وڵات، برایانی مایۆ، باروودۆخەکەمیان سەلماند. من لە شەقامێکدا گیرم کردبوو کە دەگەیشتە مردن. گەنج بووم‌و نەمدەویست بمرم. پێوەندیم بە پزیشکەکەم لە کلاگەوە گرت‌و تەواوی گریکانی دڵم بەگریانەوە لەلای هەڵڕشت. ئەو بەبێ تاقەتی دڵی دامەوەو وتی.(( ئۆلگا چی بووە؟ هیچ بەرهەڵستیەك لە دەروونتدا نیە؟ ئەگەر درێژە بە گریان بدەیت بێ گومان دەمری. بەڵێ، تۆ خراپترین نەخۆشیت هەیە. باشە ڕوو بەڕووی ڕاستی بەرەوە‌و وازلە نیگەرانی‌و ترس بێنە‌و پاشان بیرێکی لێ بکەرەوە.))

دروست هەر لەو ساتەو لەو شوێنەدا بوو سوێندم خوارد. ئەوەندە بەجیدی کە نینۆکەکانم بە گۆشتی لەشمدا چونە خوارەوە‌و عارەقێکی سارد لە بڕبڕەی پشتمەوە هاتە خوارەوە. چیتر نیگەران نابم، هەرگیز ناگریم‌و ئەگەر شتێك بایەخی هەبێ بۆ بیرکردنەوە تەنیا سەرکەوتنی منە لە دژی نەخۆشی. دەمەوێت زیندوو بمێنم.

بەشێوەی باو لە باروودۆخی خراپی شێرپەنجەدا لە دەورەیەکی یەك مانگیدا هەموو ڕۆژێك نەخۆشی بۆ ماوەی دە خولەك‌ونیو دەخەنە بەرتیشکی لەیزەر. ئەوان تیشکی



 

منیان کردە چواردە خولەك لەرۆژدا لە دەورەیەکی چل و نۆ رۆژەدا. ئەگەر چی ئێسکەکانم وەکو شاخ لەجەستەی لاوازمەوە دەرپەڕیبوون و ئەگەر چی قاچەکانم وەکو سورب وابوون، بەڵام نیگەران نەبووم. هەرگیز تەنانەت یەك جاریش نەگریام، پێدەکەنیم، بەڵێ، بەڕاستی خۆمم ناچار بە پێکەنین دەکرد. ئەوەنەیش بێ عەقڵ نەبووم کەوابزانم تەنیا پێکەنین شێرپەنجەکەم چارەسەر دەکات، بەڵام دەزانم روانگەیەکی مەعنەوی شاد یارمەتی جەستەم ئەدات تاکو بەرەنگاری نەخۆشی ببمەوە. بەهەرحاڵ یەکێك لەدەرمانە سیحراویەکانی شیفا بەخشی شێرپەنجەم تاقی کردەوە. هەرگیز لەم چەند ساڵەی دوایی تەندروستتر نەبووم و ئەمەش سەلماندنێکە بۆ ئەم وتە هاندەرانەم:

بەرەو ڕووی ڕاستی ببەرەوە.

دڵە ڕاوکێ بەردەو پاشان بیرێك بۆ چارەسەری کێشەکەت بکەرەوە.

دەمەوێ ئەم بەشە لە کتێبەکە بە دووپات کردنەوەی گوڵبژێری وتەکانی دوکتۆر ئالکسیس کارڵ تەواو بکەم: (( بازرگانێك کە نازانێت چۆن لە گەڵ نیگەرانیدا ڕوو بەڕوو ببێتەوە، ناچارە بەمەرگی گەنجێتی.))

ئایا مەبەستی دوکتۆر ئالکسیس ئێوەن؟ لەوانەیە!

## کورتەی بەشی یەکەم

*چەند ڕاستیەکی بناغەیی لە بارەی نیگەرانیو دڵە ڕاوکێوە کەزانینیان پێویستە.*

یاسای یەکەم: بۆ دوورکەوتنەوە لە نیگەرانی ئەو ڕەوشەی سیر ویلیام ئوسلەر پێشنیاری کردووە بیگرنەبەر. نیگەرانی بەیانی مەبن، لە ئەمڕۆدا بژین تاکو لەکاتی خەودا بیر هەر لەو ڕۆژە بکەنەوە.

یاسای دووەم: کاتێک دووچاری کێشە بوونو کەوتنە داوی، ڕێگە چارەی سیحراوی ویلیز کریر بگرنە بەر:

١-ئەو پرسیارە لەخۆتان بکەن لە حاڵەتی نەتوانینی چارەسەری کێشەکە خراپترین حاڵەت چیە؟

٢- ئەگەر پێویست بوو مێشکی خۆتان بۆ وەرگرتنی خراپترین حاڵەت ئامادە بکەن.

٣- پاشان لە ئارامی کامڵدا هەوڵ بدەن چارەسەری کێشەکەتان بکەن ( ئێوە خۆ لەوەپێش وەرتان گرتووە).

یاسای سێهەم: بیری بێتەوە دەبێ چ شتێک بۆ چارەسەری کێشەکەتان ببەخشن (تەندروستی ).(( بازرگانێک کە نازانێت چۆن ڕوو بەڕووی کێشەکەی ببێتەوە ناچارە بە مەرگی ناوادە.))

بابەتی یەکەم

## چۆن دەبێ کێشە نیگەرانی دروستکەرەکان شیبکرێتەوەو پاشان چارەسەر بکرێت

*٤خزمەتکارم دامەزراند ( هەرشتێك دەزانم مەمنوونی ئەوانم )*

*ناوەکانیان بریتین: چ شتێك، بۆچی، کەی، چۆن، لەکوێ، کێ*

ئایا ڕێگە چارەی سیحراوی ویلز کریر کە لەبابەتی یەکەمو دووەمی بەشی یەکەمدا باسی کرا، ڕێبازی تەواوی کێشەکانە؟ ئەڵبەت کەوانیە. کەواتە وەڵام چیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە بە فێربوونی سێ قۆناغی بناغەیی شی کردنەوەو ڕاڤە کردنی کێشەکان دەتوانین خۆمان بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی جۆرە جیاوازەکانی دڵە ڕاوکێ و نیگەرانی تەیار بکەین. ئەم سێ قۆناغە بریتین لە:

١- تێگەیشتن لە فاکتەرە دروستکەرەکان .

٢- شی کردنەوەی هۆکارەکان.

٣- بڕیاردانی کۆتایی و پاشانیش کارکردن بەبڕیار.

بەڵێ، ئەرەستۆ فەیلەسووفی گەورە فێری بووەو بەکاری بردووە. ئێوەو منیش لەهەوڵی ئەوەداین ئەو کێشە ئازار دەرانەی شەوو ڕۆژمانیان کردووە بە دۆزەخ، چارەسەر بکەین، پێویستە سوودیان لێ وەرگرین.

لەیەکەم پاسا دەکۆڵینەوە: هۆکارەکان بناسە. بۆچی ناسینی هۆکارەکان گرنگە؟ چونکە بەبێ ناسین توانای چارەسەرکردنیمان نابێت و گێژو سەرسام دەبین.

((دوکتۆر هێربێرت ئی هاوکس)) سەرۆکی زانکۆی کۆلۆمبیایش ڕای وایە. ئەو کەسە بیست و دوو ساڵ مەقامی سەرۆکایەتی کۆلۆمبیای لە ئەستۆ بووە، سەبارەت بەچارەسەری کێشەنیگەران کەرەکانیان ڕاوێژی بۆ دووسەد هەزار خوێندکار کردووە. ئەو بڕوای وایە پەرێشانی گرنگترین هۆکاری دروست بوونی نیگەرانیە.

نیوەی کێشە نیگەران کەرەکان ئێخەی ئەو خەڵکانە دەگرێت کە لەپێش زانیاری تەواو بۆ بڕیاردان بڕیار دەرئەکەن. ئەو دەڵێت: من گرفتێکم هەیە کە دەبوایە کاتژمێر سێی ڕۆژی سێ شەممە ڕوو بەڕووی ببومایەتەوە. تەنانەت خۆم لە بڕیاردان دەربارەی ئەوە تاکو سێشەممە بە دوور گرت. لەکاتی گونجاودا تەواوی فیکری خۆم لەسەر هۆکارەکانی دروست کەری کۆکردەوە.

ئەو درێژەی پێ ئەدات: من نیگەران نابمو ڕێگەنادەم کێشەکە ئازارم بدات. خەوم تێك نادەم، تەنیا تەرکیز دەکەمە سەر هۆکارەکانو دروست ڕۆژی سێ شەممە ئەگەر تەواوی هۆکارەکانم ناسیبێت کێشەکە لەخۆیەوە چارەسەر ئەبێت.

من پرسیارم لەو کرد ئایا مەبەستی ئەوەیە کێشەکەی بەتەواوی لەناو بردوە؟ ئەو وتی: بەڵێ، دەتوانم بە ئەنرسی بڵێم هەرئێستا ژیانی بەتەواوی خاڵیە لە کێشە. ئەو درێژەی پێدا: ئەگەر کەسێك بێ گرێو گۆڵ کاتی خۆی بۆ شیکردنەوەی هۆکارەکان بکات، نیگەرانیەکەی بەو ڕوانگەی هەیەتی لەناو دەچێت.

بادیسان دووپاتی بکەمەوە:(( ئەگەر کەسێك بێ گرێ کاتی خۆی بۆ شیکردنەوەی هۆکارەکان تەرخان بکات، بەو ڕوانگەیەی دەیبێت نیگەرانیەکەی لەناو دەچێت.))

بەڵام زۆربەی ئێمە لە وەها حاڵەت گەلێکدا چی دەکەین؟ تۆماس ئەدیسۆن دەڵێت: (( هیچ هەلو مەرجێك بوونی نیە کە تیایدا لە ڕوو بەڕوو بوونەوەی کێشەدا پەناگەو پشتیوانێك بۆ مرۆڤ دەست نەکەوێت.)) ئەگەر ئێمە خۆمان بۆ تێگەیشتن لە هۆکارەکان ماندووبکەین، هەمیشە بەدوای ئەو هەلو مەرجانەوەین کە فیکرەکانی ئێمە پشت ڕاست بکەنەوەو کردەوەکانمان بسەلمێنن، هۆکار گەلێك کە لەگەڵ بیرە ئارەزوو مەندەکانی ئێمە هاوسەنگنو کەللە وشکیە لەوەپێش دیمانە کراوەکانمان دەسەلمێنن.

بە بڕوای ئاندرێ مۆر هەرشتێك لەگەڵ حەزە شەخسیەکانماندا هاوتەریبە، ڕاستیەوئەو شتانەی ناگونجێن، تووڕەمان دەکەن. کەواتە لەم حاڵەتەدا جێی سەرسووڕمان نیە کە بۆ چی وەڵامی کێشەکانمان نادۆزینەوە؟ ئایا کێشەی ئێمە هاوشێوەی هەمان کێشەی بیرکاری پۆلی سێهەم، واتە ئەنجامی کۆکردنەوەی دوو لەگەڵ دوو ناکاتە پێنج؟ ئێستاش لەم دنیایەدا کەسانێك هەن کە بەپێی داگری لەسەر ئەوەی کەدوو لەگەڵ دوو دەکاتە پێنج، ژیانیان دەکەنە دۆزەخ ( لەوانەیشە دوو لەگەڵ

دوو بکاتـه پێـنج سـەد)، ڕێگەچـارە چـیە؟ دەبـێ هەسـتەکانمان لـە فیکرەکانمـان جیابکەینـەوەو هـەروا کـە ((هـاوکس)) دەڵێـت دەبـێ هۆکارەکـان بـەبێ بـوغزو غـەرەز ببیـنین. لـەکاتی نیگەرانیـدا هەسـتەکانمان دێنـە خـرۆش، بـەڵام مـن دوو ڕوانگـەی سـەرکەوتوو بۆ بینینـی هۆکارەکـان بەشـێوەی ڕاسـتو بۆ ڕزگـار بـوون لـە کێشـەکان پێشنیار دەکەم :

١- لـەکاتی شـیکردنەوەی هۆکارەکانـدا واپیـشان ئـەدەم زانیاریـەکان نـەك بۆخـۆم؟ بـەڵکو بـۆ کەسـانی تـر کۆدەکەمـەوە. ئـەم ڕوانگەیـە یارمەتیـدەرە کـە ڕوانینێکـی بـێ غەرەزانـەو ڕاسـتەقینەمان لەسـەر هۆکارەکـانو بەڵگـەکان هـەبێتو هەسـتەکان وەلاوەبنێین.

٢- کاتێك سەرگەرمی کۆکردنەوەی بەڵگەم بۆ کێشەکەم، خۆم لەڕۆڵی پارێزەرێکدا دەبینم کە ئامادەی بەڵگە هێنانەوەیە بۆ لایەنەکەی تر. بەوتەیەکی تر هەوڵ ئەدەم تەواوی ئەو فاکتەرانەی حەزەکانم لەناو دەبەنو ئامەوێ ڕوو بەڕوویان ببمەوە لەدژی خۆم هان بدەم.

پاشان هەردوولایەنی باسەکە دەنوسم، هەم لایەنی خۆمو هەم دژی لایەنی خۆم. ئەو کاتە تێدەگەم کە ڕاستی لە شوێنێك لە نێوان ئەم دوو بێ کۆتاییەدایە.

ئەمە هەر ئەو خاڵە بوو کەدەمویست ئاماژەی پێ بدەم. ئەێوەو نە ئەنیشتاین. یان داواکاری گشتی باڵای ئەمریکا ئەوەندە زیرەك نین کە بێ وردبینی هۆکارەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بڕیار دەرکەن.ئەدیسۆن ئەمەی دەزانیو لەپاش مەرگی دوو هەزارو پێنج سەد نووسراوە لەوبەجێما کە هۆکارە جۆراو جۆرەکانی کێشەکانی تیانووسیبوو. ناسینی تەواوی فاکتەرە کێشە خوڵقێنەکانی جیهانیش بەبێ شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی کێشەکان هیچ سوودێکی نابێت.

من بەئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتووە کە شیکردنەوەی هۆکارەکان لەپاش نوسینیان ئاسانتر دەبێت. لە ڕاستیدا تەنیا بەنووسینی فاکتەرەکان لەسەر پارچە کاغەزێكو شیکردنەوەی کێشەکانمان ڕێگەیەکی بەکەڵك هاتوومان بۆ گەیشتن بە بڕیاردانی عاقڵانە گرتووەتەبەر.

بەوتەی چارلز گترینگ ((گرفتێك کەبەباشی شیدەکرێتەوە، کەمو زۆر تانیوە چارەسەر بووە.)) بالێرەدا باسی ئەوە بکەین.

چینیەکان بڕوایان وایە دیمەنێك بەنرخترە لە دەهەزار وشە. بیهێننە بەرچاوتان وێنەی پیاوێکتان پیشان ئەدەم کە بەباشی پیشاندەری ئەو کردەوەیە کەمن لە چوار چێوەی وشەکاندا دەمەوێ بۆ ئێوەی پێناسە بکەم.

بالێرەدا سەرنج بخەمە سەر (( گالێن لیچفیلد))، پیاوێك کە چەندین ساڵەدەیناسم. ئەو بازرگانێکی ئەمریکی سەرکەوتووە لە ڕۆژهەڵاتی دوور.

ئەو لەساڵی ١٩٤٢، واتە کاتێك یابانیەکان هێرشیان کردەسەر شانگهای لەچین بوو. ئەمە داستانی ئەوەو کاتێك لە ماڵمان میوان بوو بۆی گێڕاینەوە:

ماوەیەك لەدوای داگیرکردنی بەندەری پێرل بە دەستی یابانیەکان، بەرەو شانگهای هێرشیان کرد. من بەڕێوەبەری کۆمپانیای دڵنیایی تەمەن لە ئاسیا لە شانگهای بووم. ئەوان سەرپەرشتێکی حیساباتی سەربازییان نارد بۆمان. ئەو لە ڕاستیدا دەریاوان بوو، من دەست نیشانکرام لە حیساباتی داراییەکانمان یارمەتی ئەم پیاوە بدەم. منیش لەهاوکاری زیاتر چارم نەبوو. ئەگەر هاوکاریم نەکردایە دەکوژرام.

ئەو کارەی دەیویست ئەنجامم دا چونکە چارم نەبوو. بەڵام چەند سەفتەیەك بەنرخی ٧٥٠٠٠٠ دۆلار هەبوو کە من لە خشتە دەرم کردبوو، پاشان دامە دەستی حیسابات. لە بەر ئەوە لە خشتەکە لامبرد بوو چونکە هی بەڕێوەبەرایەتی هۆنگ کۆنگی کۆمپانیاکە بوو، پەیوەندی بە داراییەکانی شانگهایەوە نەبوو. تەنیا ئەوەندە، بەڵام من ترسم لەوە بوو ئەگەر یابانییەکان بەمە بزانن گیانم لەدەست بدەم. ئەوان زوو بەمەیان زانی. کاتێك بەمە زانرا من لەفەرمانگە نەبووم، بەڵام میسابدارییەکەم لەوێ بوو. ئەو بەمنی وت حیسابدارە یابانییەکە توورە بوو، سوێندی خوارد لە دزوو خەیانەتکار زیاترنین. من بانگ کرام بۆ سوپای یابان. دەمزانی ئەنجامی کار چیە، ئەوان من دەخەنە زیندانی ((بریج هاوس)).

((بریج هاوس)) دەخمەی ئەشکەنجەی تایبەتی سوپای یابانە. زۆرێك لە هاوڕێیانم خۆیان کوشتبوو تاکو نەکەونە ئەم زیندانە. بەشێکی تر لە هاوڕێیانم لەپاش دەرۆژ پرسیارو وەڵامو ئەشکەنجە گیانیان لەدەست دابوو. ئێستا من لەخشتەی ناوی بریج هاوسدا بووم.

دەبوا چیم بکردایە؟ گوێم بۆ هەواڵی ڕۆژی یەکشەممە لە ڕادیۆ دەگرت. زۆر ترسابوومو ئەگەر چارێکم بۆ گرفتەکەم نەدۆزیایەتەوە بێ گومان ترسم زیاتر دەبوو.

چەندین ساڵ هەرکات تووشی نیگەرانی دەبووم دەچوومە سەر ئامێری تایپەکەم و وەڵامی دوو پرسیارم ئەدایەوە:

١- بۆچی ئەوەندە نیگەرانم؟

٢- دەتوانم چی بۆ چارەسەربوون بکەم؟

بەگشتی هەستم بە پێویستی نووسینی وەڵامی پرسیارەکان نەدەکرد. بەڵام ئەم دیمەنە هی ساڵانی ڕابردوو بوو. لە دواییدا بۆم دەرکەوت نووسینی پرسیار و وەڵامەکان بیرەکانم ئاشکراتر دەکات. کەواتە ئەو دوانیوەڕۆی یەک شەممەیە ڕاستەوخۆ چووم بۆ ژوورەکەم لە شانگهای، ئامێرەکەم هەڵگرت و نووسیم:

١- لەچی نیگەرانم؟ دەترسم بەیانی ڕەوانەی بەندیخانەی بریج هاوس بکرێم.

پاشان پرسیاری دواییم تایپ کرد.

٢- بۆ ڕزگار بوون لەمە دەتوانم چی بکەم؟

چەند کاتژمێرم بەبیرکردنەوە و نووسینی ئەو چوار کارەی دەمتوانی بیکەم بردەسەر، تەنانەت بیرم لەوەش کردەوە ئەنجامی هەر کردەوەیەک لەوانەیە چی بێت.

١- هەوڵ ئەدەم بۆ حیسابدارە یابانیەکە شیبکەمەوە، بەڵام ئەو زمانی ئینگلیزی نازانێت. ئەگەر سوود لە وەرگێڕ وەرگرم زیاتر ئەوە دەوروژێنم کە ئەویش حوکمی مەرگمە. چونکە ئەو زۆر بێ بەزەییە. ئەو پێی باشە بمخاتە زیندان تاکو زەحمەت بدا بە خۆی و قسەلەسەر ئەم بابەتە بکات.

٢- دەتوانم هەڵبێم، شتی وانابێت. ئەوان زوو شوێن پێم هەڵ دەگرن و سەرەنجام دەگیرێم و دەکوژرێم.

٣- دەتوانم لەژوورەکەمدا بمێنمەوە و نەچم بەلای نووسینگەکەمدا. لەم حاڵەتەدا کابرای یابانی گومان دەکات و پێدەچێت سەربازەکانی بۆ دەسگیری و زیندانی کردنی من بنێرێت کە لەم حاڵەتەدا بەختی بەرگریکردن لەخۆم لەدەست ئەدەم.

٤- دەتوانم بەیانی ڕۆژی دووشەممە وەکو عادەت بچم بۆ نووسینگەکەم. ئەگەر وابکەم لەوانەیە کابرای یابانی ئەوەندە گرفتار بێت کەسەری نەپەرژێ بیر لەکارەکەی من بکاتەوە. تەنانەت ئەگەر بیریشی بکەوێتەوە لەوانەیە توورەییەکەی نەمابێت و کاری بەسەرمەوە نەبێت. ئەگەر وابێت هەر زۆر باشە. تەنانەت ئەگەر گرفتیشم بۆ

دروست بکات دیسان بەختی ئەوەم دەبێ بۆی شیبکەمەوە. کەواتە ئەگەر وەکو عادەت بچمەوە بۆ سەرئیش دوو بەختی گەورەم بۆ هەڵهاتن لە زیندان هەیە.

کوت و پڕ لەپاش ئەم بڕیارە بەیانی ڕۆژی دووشەممە وەکو هەمیشە دەچم بۆ کارەکەم، ئۆقرەییەك دەروونمی گرتەوە. بەیانی ڕۆژی دوایی کاتێك چوومە نووسیگەکەم کابرای یابانیم بینی کە جگەرەیەکی بەلێوەوەبوو. سەیرێکی منی کردو هیچی نەوت. شەش هەفتە لەدوای ئەوە گەڕایەوە بۆ تۆکیۆ و نیگەرانیەکانی من تەواو بوو. هەروا کە لەوەپیش وتم ئەو ڕۆژی یەك شەممە بەنووسینی قۆناغە جۆراو جۆرەکانی نیگەرانیم و ئەنجامەکانی دوایی هەر کام لەقۆناغەکان و بڕیاردان، لە کۆتایی ئارامیدا توانیم گیانی خۆم ڕزگار بکەم. تەجرەبە نرخی گرانی بڕیاردانی لە هەر زەمانێکدا پیشانی من داوە. ئەم شکستە لە گەیشتن بە ئامانجێکی پایەدارو هەڵسوڕانی لە ڕۆڵی بەتاڵدایە کە مرۆڤ بەرەو هەڵدێری عەسەبی و ژیانی دۆزەخ ڕادەکێشێت. کاتێك گەیشتمە بڕیارێکی دیاری کراو و ڕوون، بۆم دەرکەوت لەسەدا پەنجای نیگەرانیەکانم ڕەویوەتەوەو لەسەدا چلیشی لەکاتی بڕیارداندا لەناو چووە. کەواتە نزیکی سەدا نەوەدی نیگەرانیەکانم بەم سێ قۆناغە لەناو چوو:

١- نووسینی وردی بابەتی نیگەرانیەکەم .

٢- نووسینی ڕێگەچارەی مەبەست و گونجاو.

٣- بڕیاردان.

٤- بەڕێوە بردنی بڕیارەکان لە باشترین کاتدا.

هەر ئێستا گالۆن لیچفیلد بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی تەئمینی کۆمەڵایەتیە بۆ کۆمپانیای ((پارك ئەندفری مەن)) لە شەقامی ١١١ی جان ستریت نیویۆرك کە کارو باری زەمانەت و هاوبەش بوونی بەدەستە. لە ڕاستیدا ئەو یەکێکە لە گرنگترین بیمەدارانی ئەمریکی لە ئاسیاو دانی پیانا کەسەرکەوتنی لەم کارەدا منەتباری هەڵسەنگاندن و ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەڵ کێشەیە.

ئەم شێوازە بۆ ئەوەندە سەرکەوتووە؟ چونکە کارامەو وردەو ڕاستەوخۆ دەچێتە قووڵایی کێشەکان. تەواوی وردبوونەوەو هەڵسەنگاندنەکان ئەگەر نەبێ بەکردەوە بێ سوودەو تەنیا بەفیڕۆدانی ووزەیە.

ولیام جیمز دەڵێت: کاتێك بڕیارێك دەرکراو ئەنجامدانی یەکلایی کرایەوە، هەموو بەر پرسیاریەتییەکان بنێرە کەنارو تەنیا ئاگات لە ئەنجامەکەی بێت. ( بێگومان لەم بابەتەدا بەتایبەت ولیام وشەی (( ئاگاداری)) هاو مانای نیگەرانی بەکار هێناوە). مەبەستی ئەوەیە کاتێك بڕیارێکی جیدی دەربارەی ڕاستیەکان گیرا، بکەوەرە کردەوە. نیگەران مەبە، مەکەوەرە گومان، شك لەخۆت مەکە چونکە گومان بردن خۆی گومانی تری بەدواوەیەو سەیری پاش سەری خۆت مەکە.

جارێك کە پرسیارم لە ویت فیلیپس ( یەکێك لە دیارترین خاوەنەکانی کۆمپانیا ئەوتیەکان) دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی بڕیارەکان کرد، ئەو وتی: بەبڕوای من بیرکردنەوە دەربارەی کێشەکانمان دەبێتە ئەوپەڕی خاڵی دیاری کراوی سنووردارو هۆکاری سەر لێشێوان.

کاتێك دەگاتە بەر کە چیتر لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەیش مەترسیدارەو کاتێك دەگات کەتەنیا دەبێ بڕیار بدرێت و بکرێت بەکردەوەو بیر لەگەڕانەوە نەکرێتەوە. بۆچی تەکنیکی گالۆن لیچفیلد بۆ یەکێك لە نیگەرانیەکانت ناگریتە بەر؟

## بابەتی دووەم

# چۆن نیوەی دڵنیگەرانیەکانی پیشەییمان کەم بکەینەوە؟

تۆ کەکەسایەتی ئازادت هەیەو بازرگانی. ئەڵبەت بەخۆت دەڵییت: ((چ نازناوێکی گاڵتەیە! چەندین ساڵە لەم کارەدامو باشتر لەهەر کەسێك ڕێگەچارەکان و وەڵامی پرسیارەکان دەزانم. بێ ماناو گاڵتەیە کەسێك بیەوێت من فێربکات چۆن نیگەرانیە پیشەییەکانم تا نیوە کەم بکەمەوە)) تۆ ڕاست دەکەیت. خودی منیش تاچەند ساڵ لەمەوبەر ئەگەر شتێکم بەم ناوەوە بدیایە هەر ئەم هەستەم هەبوو. وەعدو بەڵێنی زۆر، بەڵام بێ مانا. وەرن با ڕوو ڕاست بین: لەوانەیە

من نەتوانم دڵنیگەرانیەکانی ئێوە تا نیوەکەم بکەمەوە. واتە لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییانە دەڵێ هیچ کەس لە خۆتان زیاتر ناتوانێت ئەم کارە بکات. کەواتە ئەوشتەی من دەتوانم بیکەم بۆ ئێوە، ئەوەیە ئەو کەسانەی توانیویانە ئەم کارە بکەن بە ئێوەی بناسێنم.

ئەڵبەت دێتەوە یادتان کە لە لاپەڕەکانی سەرەتای کتێبەکەدا ئاماژەم بەوتەی دوکتۆر ئالکسیس کارڵ دابوو کە دەڵێت: (( بازرگانێك کە ڕێگەی زاڵ بوون بەسەر نیگەرانیدا نازانێت: زوو دەمرێت.))

ئێستا کە دەزانن دڵە ڕاوکێ تا چ ڕادەیەك جیدیو پڕمەترسیە. ئایا بیرناکەنەوە ئەگەر بتوانن بەیارمەتی من تەنانەت ١٠٪ی نیگەرانیەکانتان کەم بکەنەوە دیسان جێی ڕەزامەندیە؟... بەڵێ؟...زۆر باشە! کەواتە بەڕێوەبەرێکتان پێ دەناسێنم کەنەك هەر بەسەر نیوەی نیگەرانیەکاندا زاڵ بوو: بەڵکو ئەو کاتانەی لە کۆبونەوە جۆراو جۆرەکاندا بۆ چارەسەری کێشەکانی تەرخان دەکرد: بۆ سێ لە چوار بەش کەمی کردەوە. سەرەڕای ئەوە: ئەو زانیاریانەی ئەیدەم لە بارەی پیاو یان ژنێکی نەناسراوەوە نیە کەنەتوانن شوێن ڕاستیو دروستی شتەکە بکەون. ئەم داستانە

دەربارەی بەڕێز (( لیئۆن شیمکین))ە وەیە کەچەندین ساڵە یەکێکە لە بەڕێوەبەرانی خانە بەخشی سیمۆن و شۆستەرو بەڕێوەبەری ئێستای کۆمپانیای پاکیت بۆکسە لە ناوەندی بازرگانی ڕاکفلێر لە نیویۆرک. ئێستا بەسەرهاتی لیئۆن لە زمانی خۆیەوە ببیستن: (( پانزە ساڵی تەواو کەم و زۆر نیوەی کارەکانی ڕۆژانەم بۆ بەرپاکردنی کۆبوونەوەو دەمەقاڵە لەسەر کێشەکان تەرخان دەکرد تابزانم ئەم کارە بکەین یان ئەو کارە؛ یان لەوانەیە هیچ نەکەین. وەڕس دەبووین و لەسەرکورسیەکانمان خۆمان لوول ئەکرد و پێچمان ئەخوارد. بەم لاولادا دەڕۆیشتین و باس و خواسمان دەکرد و کاتێک دەبوو بەشەو شەکەت و ماندوو بووین. پێموابوو هەموو تەمەنم هەر بەمجۆرە دەڕواتە سەر. پانزە ساڵ ئەمە کارم بوو، هیچ بەمێشکمدا نەهاتبوو دەتوانم لە چوار بەش سێ بەشی کاتی تەرخان کراوم بۆ کۆبوونەوەکان و سێ لەچواری نیگەرانی و گوشارە عەسەبیەکانم کەم بکەمەوە. ئەگەریش کەسێك بیوتایە شتی واهەیە، پێموایە ئەو کەسێکی بێ فیکرو گەشبینە. بەم حاڵەوە بەرنامەیەکم دارشت کە ئەم خەونەی هێنایەدی. ئێستا هەشت ساڵە ئەم بەرنامەیە بەڕێوە دەبەم و لە کارامەیی و تەندروستی و بەختەوەریمدا سیحراوی بووە.

ئەم بەرنامەیە هاوشێوەی جادووکەری و سیحر بازییەو وەکو ئەوانە زۆر ئاسانە. یەکەم؛ ڕەوتی بەرپایی کۆبوونەوەکانم وەستاند. شێوازی کارەکە بەم جۆرە بوو کە هاوبەشەکانم بەباس کردنی وردەکاریەکانی کێشەکان دەستیان دەکردبە قسەکردن و بە هێنانە کایەی ئەم پرسیارەکە (( دەبێ چی بکرێت؟)) کۆتاییان پێ دەهێنا. دووەم، یاسایەکم دامەزراند کە هەر کەسێك دەیویست کێشەیەك بێنێتە گۆڕێ، سەرەتا دەبوایە فۆرمێکی پڕ بکردایەتەوە کە بریتی بوو لەم چوار پرسیارە:

**پرسیاری یەکەم**: کێشەکە چیە؟ ( لەوەپێش یەك کاتژمێر لە کۆبوونەوەکە لە خەسار دەچوو بێ ئەوەی کەس بزانێت کێشەکە چییەو لە کۆتاییدا ڕوو بەڕووی. کەمی کات و وەڕەزی دەبووینەوە. بێ ئەوەی زەحمەتی نووسینی وردی کێشەکان بەخۆمان بدەین )

**پرسیاری دووەم**:هۆکارەکەی چییە؟ ( کاتێك بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە، لەوکاتژمێرانەی بە فیڕۆ چوون لە کۆبوونەوەکاندا، بەبێ سەرنج بۆ هۆکاری بناغەیی دروستکەری کێشەکان، دەکەوتمە ترسەوە)

**پرسیاری سێههم:** ڕێگه چاره شیمانهکراوهکان کامانهن؟ ( لهوهپێش له کۆبوونهوهکاندا یهك کهس ڕێگه چارهیهکی پێشنیار دهکردو کهسێکی تر دهکهوته دهمهقاڵه لهگهڵی، ههمووان وهڕهز دهبوون و له بابهتهکه دوور دهکهوتینهوه. له کۆتاییشدا هیچ خشتهیهك له ڕێگهچاره پێش نیار کراوهکان نهدهنووسرا)

**پرسیاری چوارهم:** ڕێگهچارهی پێشنیار کراوی تۆ چییه؟ ( چهند ساڵ لهوهپێش هیچ کهس دهربارهی تهواوی ڕێگه چارهکان بیری نهدهکردهوه تا له ناویاندا یهکێکیان ههڵبژێرێت)

چیتر هاوبهشهکانم بهکهمی بۆ باسکردنی کێشهکانیان دههاتن بۆلای من، چونکه دهزانن بۆ وهڵامدانهوهی ئهم چوار پرسیاره دهبێ تهواوی بهڵگهو هۆکارهکان کۆبکهنهوهو به کێشهکهدا بچنهوهو له سێ لهچواری کێشهکان لهپاش ئهنجامی ئهم کاره چیتر پێویستیان به ڕاوێژ لهگهڵ من نیه، چونکه وهڵامو ڕێگه چارهی کێشهکهی لهکاتی ئهم ڕهوته کردهوییهدا دێته مێشکیان. تهنانهت لهو حاڵهتانهیشدا که پێویست به ڕاوێژ دهکات، کاتی کۆبوونهوهکه بۆ یهك لهسێی کاتی کۆبوونهوهکانی پێشوو کهم بووهتهوه، چونکه ڕابوونی کۆبوونهوهکه ڕێكو پێكو عهقڵانییه، کهواته دهگاته ڕێگه چارهیهکی عهقڵانی.))

(( ئێستا له دهزگای پهخشی پاکیت بۆکسدا کاتی کهمتر بۆ نیگهران بوون و باس کردن دهربارهی کێشهکان دادهنرێت و له ڕێگای ئهوه ڕێکاری کردهیی زیاتر بۆ چارهسهر کردنی کێشهکان بهڕێوه دهبرێت.))

هاوڕێی من فرانك بهتگهر دهڵێ به یارمهتی ڕهوشێکی هاوشێوه نهك ههر دڵ نیگهرانیهکانی کهم کردهوه، بهڵکو داهاتهکهیشی دوو ئهوهنده کرد. ئهو یهکێکه له دابین کهرانی کۆمهڵایهتی بهناوبانگی ئهمریکا.

((فرانك بهتگهر)) دهڵێ:(( چهند ساڵ لهمهوبهر کاتێك دهستم کردبه سیستهمی دابین کردنی دڵنیایی کۆمهڵایهتی پڕبووم له عهشق و شهوقێکی زۆر بهنیسبهتی کارهکهمهوه. بهڵام ڕووداوێك وهها منی بێ هیوا کردو ورهمی تێکشکاند کهنهفرهتم له پیشهکهم کردو بڕیاری وازهێنانم دا. لهوانهیه ئهگهر ئهو ڕۆژه شهممهیه بیرم لهوهنهکردایهتهوه که دڵنیشم و نیگهرانیهکانم له ڕیشهوه بناسم، بێگومان ئهم کارهم واز لێهێنابوو.))

سەرەتا پرسیارم لەخۆم کرد (( بە ڕاستی کێشەکە چییە؟)) کێشەکە ئەوە بوو لەو پێوەندییانەدا کە دەمگرت ئەنجامی گونجاومدەست نەدەکەوت. وادەردەکەوت باش دەتوانم موشتەرییەکان تێبگەیەنم، بەڵام لەکاتی گرێبەستدا موشتەرییەکە دەیوت: (( باشە بەڕێز بەتگەر، پێم وایە دەبێ زیاتر بیری لێ بکەمەوە. تکایە دیسان پێوەندیم پێوە بگرەوە.)) کەواتە ئەو کاتەی بۆ شوێن کەوتنی ئەم حاڵەتە تەرخانم ئەکرد، منی نیگەران دەکرد.

**دووەم**: پرسیارم لەخۆم کرد:((تەواوی ڕێگەچارەکان کامانەن؟)) ئەڵبەت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبوا تەواوی زانیاریەکانم هەڵبسەنگاندایە. کەواتە ئامارو ڕاژەی یەك ساڵی ڕابردووم خستەبەر لێکۆڵینەوە.

لەناو ئەو کاغەزانەدا دۆزینەوەیەکی گەورەم دەست خست. ٧٠٪ی گرێبەستەکانم هەر لەدیداری یەکەمدا دەبەسترا. ٢٣٪ ئەوانە لەدیداری دووەمداو تەنیا ٧٪ ئەوانە لەدیدارەکانی دواییدا دەبەسترا کە منی بێتاقەت و بێزار کردبوو. واتە نیوەکاری ڕۆژانەم بەو شتانەوە دەبردە سەر کە تەنیا ٧٪ی گرێبەستەکانمی دەگرتەوە.

**سێهەم**: ڕێگەچارە چییە؟ ڕون بوو. تەواوی دیدارەکانی دووەم بە دواوەم لابردو کاتی خۆم بۆ گرتنی مشتەری نوێ تەرخان کرد. ئەنجامەکەی سەرسوڕهێنەر بوو. لەماوەیەکی کورتدا نرخی داهاتی هەر دیدارم کەمو زۆر بووە دوو ئەوەندە)). هەروا کە وتم فرانك بەتگەر یەکێك لەناودارترین بەڕێوەبەرانی سیستەمی دڵنایی کۆمەڵایەتییە لەوڵاتداو ساڵانە بایی ملیۆنەها دۆلار گرێبەست ئەنجام دەدات. شیکردنەوەو لێکدانەوەی کێشەی ئەوی لەڕێگەی پێشکەوتندا بەرەو پێش برد.

ئایا ئێوەش دەتوانن ئەم پرسیارانە دەربارەی کێشەکانتان بێننە گۆڕێ؟ دیسان دوپاتی دەکەمەوە. ئەم کارە دەتوانێ ٥٠٪ نیگەرانییەکانی ئێوە کەم بکاتەوە.

١- کێشەکە چییە؟

٢- هۆکاری دروستکەری چییە؟

٣- تەواوی ڕێگەچارەکان چین؟

٤- ئێوە چ ڕێگەچارەیەك پێشنیار دەکەن؟

کورتەی بابەتی دووەم

## ڕەوشتە بناغەییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕیشەی دڵنیگەرانی

**یاسای یەکەم:** تەواوی زانیارییەکان کۆبکەنەوە. لەبیرتان بێت کە ((دین هاوکس)) لەزانکۆی کۆلۆمبیاوە دەڵێ: (نیوەی نیگەرانییەکانی دنیا بەو هۆیەوەیە کە خەڵك بەبێ هەبوونی زانیاری تەواوو بناغەیی دەست دەدەنە بڕیاردان).

**یاسای دووەم:** لەپاش هەڵسەنگاندنی هەمە لایەنەی زانیارییەکان بڕیار بدەن.

**یاسای سێیەم:** لەپاش دەرکردنی بڕیارێکی دروست دەست بەکاربن خۆتان بۆ بەڕێوەبردنی بڕیارەکەتان تەرخان بکەن و نیگەرانی و دڵەڕاوکێ سەبارەت بە ئەنجامەکەی بنێنە لاوە.

**یاسای چوارەم:** کاتێك لەگەڵ هەر کام لەهاوبەشەکانتان تووشی وەسوەسە بوون سەبارەت بە کێشەیەك خۆتان نیگەران کەن، وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەنەوە:

١- کێشەکە چییە؟

٢- هۆکارەکەی چییە؟

٣- تەواوی ڕێگەچارەکان چین؟

٤- باشترینیان کامەیە؟

## نۆ پێشنیار بۆ کەڵك وەرگرتنی زیاتر لەم کتێبە

١- ئەگەر دەتانەوێ باشترین سوود لەم کتێبە وەربگرن، خاڵێکی پێویستو زۆر گرنگ هەیە دەبێت لەبەرچاوی بگرن کە گرنگترە لەهەر تەکنیکێكو رەوشتێك. ئەگەر ئەم تایبەتمەندییەتان نەبێ هەزار پێشنیاریش کارامە نابێت. بەڵام بەوەوە چیتر پێویست بە پێشنیارو پەندان ناکات. ئەم پێویستیە سیحراوییە چییە؟ حەزێکی بێ کۆتایی بۆ فێربون، ئیرادەیەکی پتەو بۆ زاڵبوون بەسەر نیگەرانییەکانو دەستپێکردنی ژیانو شادمانی.

چۆن دەتوانن ئەم هاندەرە لەخۆتاندا دروست بکەن؟ بە تەڵقینو دوپاتکردنەوەی گرنگی ئەم خاڵە سەرەکییە بەلای خۆتانەوە. لای خۆتان بیهێننە بەرچاو کە بەزاڵبون بەسەر ئەم بنەمایەدا چۆن ژیانتان شادمانتر دەبێت. بەردەوام بەخۆتان بڵێن: ((ئۆقرەیی، بەختەوەری، تەندروستیو تەنانەت لەوانەیە داهاتم لەدرێژماوەدا لەپێناوی هەڵسوکەوت کردندا بەڕاستەقینە هەمیشەییو روونەکانی ئەم کتێبە)).

٢- هەر بەشێك لەم کتێبە سەرەتا بەخێرایی بخوێننەوە تاکو ڕوانگەیەکی سەر زارەکی لێ دەستخەن لەوانەیە وەسوەسە ببن لەدوای ئەوە بچنە سەر بەشی دوایی، بەڵام ئەگەر مەبەستتان لە خوێندنەوەی کتێبەکە تەنیا سەرقاڵ بوون نیە ئەم کارە مەکەنو لەجیاتی ئەوە هەر بەشێك دیسانو بەوردی بخوێننەوە. لە درێژە ماوەدا ئەم کارە بەواتای دەست پێوەگرتنی کاتو دەسکەوتنی ئەنجام دەبێ.

٣- لەکاتی خوێندنەوەدا چەند جار بووەستنو بیر لەبابەتەکەی بکەنەوە. ئەم کارە بەسوودتر دەبێ لەخوێندنەوەی بێ ڕاوەستان.

٤- لەکاتی خوێندنەوەدا قەڵەمێك هەڵگرن تائەو شتەی هەست ئەکەن بۆتان بەسوود دەبێ نیشانەی سەر بخەن. ئەگەر بابەتەکە یەکجار گرنگ بوو دەتوانن چوار ئەستێرەی لەسەر دابنێن. ئەم کارە هەم خوێندنەوەی خۆشتر دەکاتو هەم دووبارە پیاچوونەوەی ئاسانتر دەکات.

٥- کەسێك دەناسم ماوەی ١٥ ساڵە بەڕێوەبەری نووسینگەی یەکێك لەکۆمپانیاگەورەکانی دڵنیایی کۆمەڵایەتی بووە. ئەو هەموو مانگێك تەواوی گرێبەستەکان دەخوێنێتەوە. بەڵێ، هەموو مانگێك گرێبەستەکان دەخوێنێتەوە چونکە دەزانێت ئەمە تاقە ڕێگایە کە ئامانجی داهاتووی ئەوان لەمێشکیدا زیندوو دەکاتەوە.

جارێك نزیکەی دوو ساڵ کاتم تەرخان کرد تاکو کتێبێك دەربارەی وتاربێژی لەشوێنە گشتیەکان بنووسم، بەڵام ئێستا بیردەکەمەوە باشتر وایە جارجار سەیرێکی کتێبەکەم بکەمو ئاتەو شتەی نووسیومە یادی بێنمەوە.

خێرایی لەبیر چوونەی شتەکان زۆر زۆرە. کەواتە ئەگەر ئەتانەوێ سوود لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە وەرگرن دەبێ بزانن یەك جار خوێندنەوەی سەرزارەکی بەس نیە. لەپاش تەواو بوونی هەموو مانگێك بۆماوەی چەند کاتژمێرێك پیای بچنەوە. لەسەر مێزەکەتان دای نێنو جار جار چاوێکی پیا بخشێنن. لەبیرتان بێ تەنیا شتێك کە دەتوانێ بنەماکانی ئەم کتێبە بخاتە ناو مێشکتان بۆ هەمیشەو بەڕێوەبردنی ئەوانە بکاتە ئائیرادی لەئێوەدا، خوێندنەوەی بەردەوامیەتی. هیچ ڕێگەیەکی تر نیە.

٦- بەرناردشۆ دەڵێ: (( ئەگەر هەر شتێك فێری کەسێك بکەیت، هیچ فێرنابێت)). ڕاست ئەکات. فێرکردن ڕەوەندێکی زانستیەو ئێمە بەئەنجامدانی فێردەبین. کەواتە ئەگەر ئەتانەوێ بەسەر بنەماکانی ئەم کتێبەدا زاڵبن باشتر وایە لەهەر دەرفەتێکدا سوودی لێوەرگرن. ئەگەر وانەبێ لە بیرتان دەچێتەوە. تەنیا زانستێك لەمێشکدا دەمێنێت کە کەڵکی لێوەر بگیرێت.

بۆتان دەردەکەوێت کە لەکارگرتنی تەواوی ئەم پێشنیارانە زۆر سەختە. منیش کەنووسەری ئەم کتێبەم دەزانم کە بەڕێوەبردنی تەواوی ئەو شتانەی لەکتێبەکەدا هێناومە سەختو دژوارە.کەواتە بزانن کەمەبەستی ئێوە لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە تەنیا دەست خستنی زانیاری نیە، بەڵکو بەدەست هێنانی عادەتی نوێیەو ئەوەش پێویستی بەتەرخان کردنی کات، کوڵنەدانو سوودی زانستیە.

٧- هەرکاتێك هاوسەرەکەتان لەکاتی سەرپێچی یەکێك لەبنەماکان دەستگیری کردن ئەوا ڕێگەی پێ بدەن! بێ گومان ئێوە تووشی شکست دەکات!

٨- تکایە بچنەسەر لاپەڕەکانی ١٩٦و١٩٧ی کتێبەکەو بزانن ئیچ پی هاول، بانکداری واڵ ستریتو بەن فرانکلین چۆنهەڵەکانی خۆیان ڕاست کردۆتەوە. ئێوە

بۆچی سوود لەڕەوشی ئەوان وەرناگرن؟ سوود وەرگرتن لەڕەوشی ئەم دووکەسە دوو ئەنجامی دەبێ:

**یەکەم**: ئێوە دەچنە ڕەوەندێکی فێربوونەوە کەهەم سەرنج ڕاکێش و هەم بێ خەرج.

**دووەم**: بۆتان دەردەکەوێ تواناکانتان بۆ زاڵ بوون بەسەر نیگەرانیدا بەخێرایی گەشە دەکات.

٩- دەفتەرێك بۆ نووسینی سەرکەوتنەکانتان لەبەڕێوەبردنی ئەم بنەمایانە دانێن. لەم کارەدا وردبین بن و ناوەکان و بەروارو ئەنجامەکان بنووسن. ئەم کارە ئێوە هان ئەدات هەوڵی زیاتر بدەن و ساڵانی دوایی خوێندنەوەیان چێژی دەبێت.

## خاڵەگرنگەکان

## نۆ پێشنیار بۆ سوود وەرگرتنی زیاتر لەم کتێبە

١- دروستکردنی ئارەزوویەکی بێ کۆتایی بۆزاڵ بوون بەسەر نیگەرانیدا.

٢- لەپێش دەسپێکردنی بەشی نوێ، بەشی پێشوو بەوردی بخوێننەوە.

٣- ڕاوەستان لەکاتی خوێندنەوەو بیرکردنەوە دەربارەی بابەتەکان.

٤- لەسەر بابەتە گرنگەکان نیشانە دابنێن.

٥- مانگانە ئەم کتێبە بخوێننەوە.

٦- لەهەر دەرفەتێکدا بنەما باسکراوەکان بکەنە کارو لەکێشە ڕۆژانەکاندا بەکاری بێنن.

٧- بەسوود وەرگرتن لەوشتەی فێری بوون یارییەك دروست بکەن و هەرکاتێك یەکێك لەه

٨- حا

بابەتی یەکەم:

## چۆنیەتی لەناو بردنی نیگەرانی لەمێشکدا

هەرگیز شەوێك لەشەوانی چەند ساڵ لەمەوبەر کە ((ماریۆن جی دۆگلاس)) فێرکارم بوو، فەرامۆش ناکەم ( ئەڵبەت بە ویستی ئەو ناوە ڕاستەقینەکەیم نەهێناوە ). داستانی ڕاستەقینەی خۆی جارێك لەپێش وانەکەماندا بۆ گێرامەوە: ئەو وتی قەیران نەك یەك جار، بەڵکو دووجار تووشی بووە. یەکەم جار کچە پێنج ساڵانەکەی لەدەستدا. ئەو و هاوسەرەکەی پێیانوا بوو توانای تەحەمولی ئەم بەڵایەیان نیە. بەڵام دەمانگ دوای ئەوە خوا منداڵێکی تری پێدان، بەڵام ئەویش لەپاش پێنج ڕۆژ مرد. تەحەمولی ئەم دوو بەڵا گەورەیە یەکجار سەخت بوو. ئەم باوکە دەیوت:(نەمدەتوانی بخەوم، نان بخۆم یان بحەسێمەوە. مێشك و بڕوابەخۆ بوونم لەدەست چوو بوو) پزیشکەکان حەبی خەوو گەشت کردنیان بۆ دانا کەئەڵبەت بێسوود بوون. وەکو ئەوە وابوو لەناو ئامێری کەپسدا بێت و کەپسەکە بەرتەسکتر بێت. ئەو خەریك بوو بەهۆی خەم و کەسەرەوە لەناو دەچوو.

(( شوکری خوا منداڵێکی ترم هەبوو. کوڕێکی چوار ساڵان کە ڕێگە چارەی کێشەکەی پیشانی مندا. ڕۆژێك دوانیوەڕۆ کە ئەژنۆی خەم و خەفەتم لەباوەش گرتبوو وتی: (( باوکە بەلەمێکم بۆ دروست دەکەی؟)) ئەڵبەت تاقەتی بەلەم دروست کردن یان هەرکارێکی ترم نەبوو، بەڵام کوڕەکەم ئەوەندە پێداگری کرد کە ناچار بووم.

دروستکردنی ئەو بەلەمە یارییەکەم و زۆر سێ کاتژمێری خایاند. کاتێك کاری بەلەمەکە تەواو بوو بۆم دەرکەوت ئەو چەند کاتژمێرەی خەریکی ئەم کارەبووم. یەکەم کاتژمێرەکانی ئۆقرەیی و ئاسایش بوو لەچەند مانگی ڕابردوودا.

ئەم دۆزینەوەیە منی لەحاڵەتی سستی و بێتاقەتی دەرهێناو بووە هۆی ئەوەی کەمێك بیر لە هەل و مەرجی خۆم بکەمەوە و ئەمە یەکەم بیرکردنەوەی جیدی بوو لەم

مانگانەدا. بۆم دەرکەوت کاتێك مێشکم سەرگەرمی کارێکە کە پێویستی بە پلان دارێژیی و ورد بینیە، چیتر ناتوانم نیگەران بم، کەواتە بڕیارمدا خۆم سەرگەرم رابگرم تاکو نیگەرانی لەمەیدان وەدەرنێم.

شەوی دوایی لەناو ماڵدا گەڕام و خشتەیەك لەو کارانەی دەبوا ئەنجام بدرێن، نووسیم.

دەیان شت پێویستی بە نۆژەن کردنەوە بوو: کتێبخانە، پێپلیکانەکان، پەنجەرەکان، پەردەکان، دەسگیرەکان، قوفڵەکان، بەلوعەکان و....لەماوەی دوو هەفتەدا ٢٤٢ شتی قابیلی تەعمیرم لە خشتەکەدا هەبوو.

لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا زۆربەی ئەم کارانەم ئەنجامداو سەرەڕای ئەوە ژیانم بە چالاکی هاندەر پڕکردەوە. دوو ڕۆژ لەهەفتەدا لە نیویۆرك دەچم بۆ وانەی پەروەردە کردنی گەورە تەمەنان. لەشارەکەی خۆمدا کاری خێر دەکەم و بۆ خاچی سوورو دەزگاکانی تر پارە کۆدەکەمەوە. ئەوەندە سەرم قاڵە کەکاتم بۆ نیگەرانی و پەرێشانی نیە)). ئەمە کوت و مت هەر ئەو شتەیە وینستۆن چەرچڵ کاتێك لەگەرمەی شەڕدا ڕۆژی ١٨ کاتژمێر کاری دەکرد. کاتێك دەربارەی نیگەرانی و دڵە ڕاوکێ لەئەو هەموو بەرپرسیارەێتیە گەورەیە پرسیاریان لێکرد وتی:

(( سەرم زۆر قاڵە کاتم بۆ نیگەرانی نیە)).

(( چارلز کەترینگ)) یش حاڵەتێکی هاوشێوەی هەبوو، بۆ ڕزگار بوون لەوە دەستی دایە داهێنانی ستارتەری ئۆتۆماتیك بۆ ئۆتۆمبێل ئەو تاپێش لەخانەنشین بوون جێگری بەڕێوەبەری جەنراڵ مۆتۆرز بوو، بەرپرسیارێتی بەشی لێکۆڵینەوەی ئەوێی لەئەستۆ بوو. لەو کاتەدا ئەو ئەوەندە دەستەنگ بوو کەناچاربوو لەجیاتی تاقیگە سوود لەعەمبارێك وەرگرێت و بۆ بەڕێکردنی ژیان کەڵکیان لەداهاتی فێرکردنی پیانۆی هاوسەرەکەی وەردەگرت.ئەو تەنانەت ناچار بوو پارە لەسیستەمی دڵنیایی کۆمەڵایەتی خۆی بەقەرز وەربگرێت. پرسیارم لەهاوسەرەکەی کرد: ئایا لەو بارودۆخەدا نیگەران نەبوو؟ ئەو وتی: ئەوەندە بێتاقەت بوو کەنەیدەتوانی بخەوێ، بەڵام ((کەترینگ)) ئەوەندە سەرقاڵی کارەکەی بوو کەدەرفەتی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی نەبوو.



 

زانای ناودار (( لویس پاستۆر)) یش باس لەو ئۆقرەییە دەکات کە لەتاقیگەو کڵێبخانەکاندا هەیە. بەڵام بۆچی لەم شوێنانەدا ئارامی دەست دەکەوێت؟ چونکە کەسانێك کەلەم شوێنانەدان ئەوەندە سەرگەرمی کارەکانیانن کەلەبیریان دەبێ نیگەران بن. لێکۆڵەران بەکەمی دەمارگیری دەبن چونکە کاتی ئەم کارە ناسکانەیان نیە.

بۆچی کارێکی ئەوەندە سادە، واتە خۆ سەرگەرم کردن دڵنیگەرانی لەناو دەبات؟ لەبەر یاسایەکی بنەڕەتی لەدەروونناسیدا. واتە مێشکی هەر مرۆڤێك هەرئەندازە بەهێز بێت ناتوانێ لەیەك کاتدا بیر لەدووشت بکاتەوە، ئەگەر بڕواناکەن دەتوانین تاقیکردنەوەیەك ئەنجام بدەین:

هەرئێستا چاوتان ببەستن و هەوڵ بدەن لەیەك کاتدا بیر لەپەیکەری ئازادی و بەرنامەی بەیانیتان بکەنەوە. بێ گومان تێدەگەن دەتوانن بەنۆرە بیر لەهەرکامیان بکەنەوە، بەڵام لەیەك کاتدا ئەم کارە نابێت. سەبارەت بەهەستەکانیش ئەم شتە ڕاست دەبێتەوە. ئێوە ناتوانن لەیەك ساتدا بەشەوقەوە کارێك ئەنجام بدەن و لەهەمان کاتدا لەبەر شتێك پەریشان بن.

هەستێك هەستەکەی تر دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە. بە سوود وەرگرتن لەم بنەمایە دەروونناسان لەکاتی شەڕدا توانیان کارگەلێکی سەر سووڕهێنەر ئەنجام بدەن. کاتێك سەربازان بێتاقەت و دڵشکاو لەشەڕ دەگەڕانەوە پزیشکان بۆ دەرمان ئەوانیان سەر گەرم دەکرد. هەرساتێکیان بە کارێك پڕدەبووەوە و زۆربەی ئەم چالاکیانە لەکەش و هەوای ئازادا بوو،بۆ نموونە: ڕاوە ماسی، دووگۆڵی، کۆڵف، ڕاو، وێنەگری، باخەوانی و...ئەوەندەکاتی بێکاری بەوان نەدەدا کەبیر لەتەجرەبە تاڵەکان بکەنەوە.

کار دەرمانی وشەیەکە کە ئەمڕۆکە لەدەروونناسیدا بەم شێوە دەوترێت. پزیشکانی یۆنانی ٥٠٠ ساڵ بەر لەمەسیح پێشنیاری ئەم ڕەوشەیان کردووە!

لەسەردەمی فرانکلینیشدا (( کواکر))دکان[1] لەفیلادلفیا سوودیان لەم ڕەوشە وەرگرتووە. لەمۆڵگەکانی کواکرەکاندا نەخۆشانی دەروونی سەرگەرمی چنینی کەتان بوون و ئەم کارە بۆ مێشکیان هێمن کەرەوە بوو.

هەر پزیشکێکی دەرونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەباشترین ئارامکەرەوە بۆمێشك كارە.کاتێك ((هێنری لانگ فلۆ)) هاوسەرە گەنجەکەی لەدەستدا بەم ڕاستیەی زانی. هاوسەرەکەی ئەو لەکاتی تواندنەوەی مێو بەمۆم ئاگری گرتبوو. ئەو بەبیستنی هاواری هاوسەرەکەی هەوڵیدابوو فریای بکەوێت، بەڵام بەهۆی سەختی برینەکانیەوە گیانی لەدەست دابوو. بیرهێنانەوەی ئەم دیمەنە ترسێنەرە ئەوەندە لانگ فلۆی ئەشکەنجە ئەدا کەنزیك بوو شێتی بکات، بەڵام خۆشبەختانە سێ منالە بچووکەکەی پێویستیان بە ئاگالێبوونی ئەو هەبوو. ئەو سەرەڕای خەم و ڕەنجەکە دەبوایە هەم دایك و هەم باوکی سێ منداڵەکەی بێت. ئەوانی دەبرد بۆ پیاسە، داستانی بۆ دەگێڕانەوە، یاری لەگەڵ دەکردن و هاوڕێیەتی و لەگەڵ بوونیانی لەشیعری ((کاتژمێریك بۆ منالان)) ئەبەدی کرد. لانگ فلۆ ((دانتە))یشی وەرگێڕا و ئەم سێ ئەرکە ئەوەندە ئەوی سەرگەرم ڕاگرت کەتوانی توانای خۆی بەدەست بێنێتەوە.

زۆربەی ئێمە بەدرێژایی ڕۆژ کاتێك کارەکانمان ڕادەپەڕێنین بەئاسانی تیایدا نوقم دەبین و گرفتەکانمان لەبیر دەکەین، بەڵام لەپاش تەواو بوونی کاتی کار مەترسی دەست پێ دەکات. دروست هەر لەم کاتەدایە کەنیگەرانیەکانی ئێمە دەست پێدەکات. ئایا بەختەوەرین؟ کارەکانمان خۆش دەوێ؟ خەریکین کەچەڵ دەبین؟ بەڕێوەبەرەکەمان ڕازییە؟ و.....

کاتێك مرۆڤ سەرگەرم نیە مێشکی وەکو بۆشایی لێدێت. هەروا کەسروشت لەهەوڵی پڕکردنەوەی بۆشاییدایەو گوشاری دەخاتە سەر، مێشکی بەتاڵی ئێمەیش دەکەوێتە بەر هێرش و ئەم هێرشانە لەجۆری هەستێن. هەستی نیگەتیفی وەکو ترس، دڵەڕاوکێ، نەفرەت، ئیرەیی و کۆنەپەرەستی ئەوەندە بەهێزن کەدەتوانن ئاسایش و ئۆقرەیی بەتەواوی لەمێشکمان دەرکەن. پرۆفیسۆر جیمز مارشاڵ لەزانکۆی

[1] the Quekers ڕەوتێك لەمەسیحیەت کە پێڕەوەکانیان بڕوایان بەقەشەو ڕێ و ڕەسمی ئاینی ڕەسمی نیە ئەوان دژی شەڕ توندوتیژین و ڕێو ڕەسمی ئاینی خۆیان لەبێدەنگیدا بەڕێوە دەبەن



 

کۆلۆمبیاوە ئەم بابەتە بەجوانی باس دەکات: (( نیگەرانی نەک کاتێک کەسەرگەرمن، بەڵکو لەپاش تەواو کردنی کاری ڕۆژانە دەست دەکات بەهێرش کردن. لەم کاتەدایە کە بیرەکانی ئێوە بێ هاوسار دەبن و هەر کێشەیەکی بچوک بەگەورە دەبینن. ڕێگەچارەکەی ئەوەیە کارێکی بەسوورد ئەنجام بدەن.)) ئەڵبەت بۆ تێگەیشتن و لە کارا کردنی ئەم بابەتە پێویست ناکا ئێوە مامۆستای زانکۆ بن.

لەدەورانی شەڕدا خانمێکم ناسی. ئەو ئەیوت دۆزینەوەیەکی کردوە کە باشترین دەرمانی دڵەڕاوکێ ئەنجامی کارگەلی بەسوودە. کاتێک لەرێستورانی شەمەندەفەرێکدا بووم و خەریک بووم لەنیویۆرکەوە دەچومەوە بۆ کێڵگەکەم لەمیسوری لەگەڵ ئەم خانمەو هاوسەرەکەیدا ئاشنا بووم (بەداخەوە ناوو ناو نیشانیانم وەرنەگرت ئەڵبەت لەوەی ناچار بووم نموونەیەک بێنمەوەکە زانیاری تەواوی بۆ بەدوادا چوون نەبێ، ڕازی نیم).

ئەم جوتە هاوسەرە گێڕایانەوەکە تاقە کوڕەکەیان چووبوە ناو سوپا و دایکی لەترس و نیگەرانیدا بەردەوام خۆی دەخواردەوە. کاتێک پرسیارم لێکرد چۆن توانی لەم بارودۆخە ڕزگاری بێت وەڵامی دایەوە: (( خۆم سەرگەرم کرد)). سەرەتا خزمەتکارەکەی ئیزن دابوو، کارەکانی ناو ماڵی گرتبووە ئەستۆ. بەڵام ئەم کارە بەسوود نەبوو چونکە بەوتەی ئەو ئەنجامی کاری ماڵەوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیک و میکانیکی ڕوونەدات و مێشکی تێکەڵ ناکات و هەر بەو شێوەیە نیگەرانی تەنانەت لەکاتی ئەنجامی کارەکانی ماڵەوەیشدا هاوڕێی بوو . دەبوا کارێکی بکردایە کەهەم بەجەستەو هەم بەڕۆح تیایدا نوقم بوایە. کەواتە دەستی کردبە فرۆشیاری لەفرۆشگەیەکی گەورەدا.

ئەو وتی: (( ئەم کارە بەسوود بوو. خۆم لەنا و سەرقاڵی و چالاکیدا بینیەوە. کریارگەلێک دەوریان گرتبووم کەپرسیاری نرخ و ئەندازە و ڕەنگیان دەکرد. یەک چرکەیش کاتم نەبوو لەئەرکەکەم زیاتر خەریکی شتێکی تربم و شەوانە ئەوەندە ماندوو دەبووم کەهەر سەرم دەنایە سەرسەرین خەوم لێ دەکەوت.

ئۆسا جانسۆن، ناودارترین ژنی داهێنەری جیهان بەمنی وت سوودی لەچ ڕەوشتێک بۆ ڕزگار بوون لەدڵە ڕاوکێ و نیگەرانی وەرگرتووە. لەوانەیە داستانی ژیانی ئەوتان لەکتێبەکەیدا بەناوی (( من بەزەوق و شەوقەوە هاوسەر گیریم کرد)) خوێندبێتەوە.

مارتین جانسۆن کاتێك ئۆسا تەمەنی شانزە ساڵ بوو لەگەڵ ئەودا هاوسەر گیری کردو ئەوی لەکانزاسەوە برد بۆ دارستانەکانی بۆرنە.[1] لەماوەی ٢٥ ساڵدا ئەم جووتە گەشتیان بۆ زۆربەی شوێنەکانی جیهان کرد تاکو فیلم لەجۆرە ئاژەڵە نزیك لە لەناو چونەکان لەئاسیاو ئەفەریقا هەڵگرن. ٩ساڵ لەمەوبەر گەڕانەوە بۆ ئەمریکاو زنجیرە وتاربێژیەکەیان بۆ نواندنی فیلمەکانیان دەست پێکرد. لەپاش فڕین لەدینۆرەوە فڕۆکەکەیان بەر چیایەك کەوت. مارتین هەر زوو گیانی لەدەستداو پزیشکەکان ڕایانگەیاند ئۆسا بۆ هەمیشە ئیفلیج دەبێ. سێ مانگ دوای ئەوە ئۆسا لەسەر عارەبانەی چەرخدار وتاری بۆ سەدان کەس دەخوێندەوە. کاتێك هۆی ئەم کارەیم لێ پرسیار کرد وتی: (( چونکە دەمویست ئەوەندە خۆم سەر گەرم کەم کەدەرفەتی خەمو خەفەت خواردنم نەبێ)).

ئۆسا جانسۆن پەی بەو ڕاستیە بردکە ئالفرێد لۆرد تەنی سۆن یەك سەدە لەمەوبەر لە شیعرێکدا هۆنیبوویەوە: (( دەبێ لەکاردا نوقم بم ئەگەرنا لەبێ کاریدا دەژاکێم)).
دەریاوان بێردیش لە ٥مانگ ژیانی تەنیای لەناو سەهۆڵەکانی جەمسەری باشووردا، شوێنێك کەدێرینترین نهێنیەکانی دنیای لێیەو ڕووبەرەکەی لەهەموو ئەمریکاو ئەورووپا زیاترە،بەم ڕاستیە گەیشت. ئەو ٥مانگ لەتەنیایی کامڵدا بێ ئەوەی هیچ جۆرە گیانداریك لەدەوری بێت، لەوێ ژیا. هەوا ئەوەندە سارد بوو کەدەنگی سەهۆڵ بەستنی هەناسەکانی خۆی لەبادا دەبیست. ئەو لەکتێبەکەیدا بەناوی تەنیایی باسی ٥مانگ ژیان لەتاریکی کامڵدا دەکات.

(( شەوانە لەپێش کوژاندنەوەی چرا فانۆسەکەدا، کارەکانی بەیانیم بۆ خۆم دیاری دەکرد: ڕێك کردنی گردە بەفرەکان، ڕێك کردنی بەرمیلەکانی سوخت، هەڵکەندنی کتێبخانە لەناو سەهۆڵدا. نۆژەن کردنەوەی پردی شکاوی عارەبانەکەو .....

ئەم ڕەوشە بۆ کات بەڕێکردن زۆر باش بوو، بووبووە هۆی ئەوەی خۆم لەژێر چاودێری‌ودەسەلاتمدا بگرم. ئەو ڕۆژانەی هیچم نەدەکرد دوچاری پەرێشانی‌و خەمۆکی دەبووم )). کەواتە ئەگەر دوچاری نیگەرانی‌و پەرێشانین، لەبیرمان بێت کە دەتوانین وەکو دەرمان سوود لەکار کردن وەربگرین. ئەم بابەتە دوکتۆر ((ڕیچارد سی

---

[1] دوورگەیەك لە باشووری ڕۆژئاوای فلیپین.

کابوت)) مامۆستای پێشووی زانکۆی هاروارد لەکتێبەکەیدا بەناوی (( مرۆڤ بەچی زیندووە؟ )) بەم شێوەیە باس دەکات:

(( وەکو پزیشکێك کە لەبینینی کەسانێکی زۆر کەتوانیویانە بەیارمەتی کارکردن لەشەلەلی ڕۆحی بەهۆی ترس. دوودڵی. گومانو بێ بڕیاریەوە دروست دەبێ. ڕزگار ببن زۆر شادمانم)).

بەڵام ئەگەر خۆمان سەر گەرم ڕانەگرینو ڕێگەی بیرە بێزارکەرەکان بدەین بۆ مێشکمان، لەدەروونەوە تێك دەشکێین. دەڵێی جنۆکە گەلێك لەدەروونی ئێمەدا تەواوی توانای کردەوەی ئێمە دەچننو تێکمان ئەدەن.

کەسێك لەنیویۆرك دەناسم کە توانی ئەم بیرە بێزارکەرانە بەکاری زۆرو مەجال نەدان بەهێرشی نیگەرانیو دڵەڕاوکێ لەخۆی دوربکاتەوە. ناوی ئەو(تەرمپەرلانگ مەن)ەو نوسینگەکەی لەشەقامی واڵ ستریت، ژمارەی ٤٠٥. ئەو لەیەکێك لەوانەکانی پەروەردەی گەورە تەمەنانی مندا بوو. دەربارەی شێوەزاڵبوون بەسەر نیگەرانییەکەیدا قسەی دەکرد، ئەزموونەکەی ئەو ئەوەندە سەرنجڕاکێشو کاریگەر بوو کە داوام لێکرد خواردنی ئێوارەم لەگەڵ بخوات. لەپاش وانەکە تا درەنگانێ لەرێستۆرانتێکدا دانیشتینو دەربارەی ئەزموونەکەی ئەو قسەمان کرد.

ئەو داستانەی بۆی گێڕامەوەبەم شێوەیەیە:

(هەژدە ساڵ لەمەوبەر ئەوەندە نیگەرانبووم کە تووشی بێ خەوی بوبوم.ئەوەندە بێزارو دەمارگیر بووبووم کە خەریکبوو تووشی خەمۆکی دەبوم.

ئەڵبەت هۆکارێکی باشم بۆ نیگەرانی هەبوو. لەو کاتەدا گەنجینەداری کۆمپانیایەکی بڵاوکردنەوەی میوە بووم. سەرمایە گوزارییەکی گەورەمان لەسەر بەستەی یەك گالۆنی شاتوو کردبوو، ئەوانەمان دەفرۆشت بەکارگە گەورەکانی ئایس کرێم. بەڵام کارگەکان لەبەر دەست پێوەگرتن بەکاتو پارەوە بڕیاریاندا شاتووەکان بەشێوەی بەرمیل بکڕنو فرۆشی ئێمە وەستا..

نەك هەر بەشێکی زۆر شاتوو بایی نیو ملیۆن دۆلار بەسەر دەستمانەوەمابووەوە، بەڵکو گرێبەستی کڕینی شاتوو بەبەهای یەك ملیۆن دۆلار بۆ دوانزە مانگی داهاتوویش لەبەردەستماندا بوو ٣٥٠٠٠٠ دۆلاریشمان لەبانك وەرگرتبوو بەقەرزو نەماندەتوانی بیدەینەوە یان کاتەکەی زیاد بکەین. سەیر نەبوو گەر تووشی نیگەرانی

بەم بەخێرایی چووم بۆ کالیفۆرنیا، ئەو شوێنەی کارگەکەمانی لێبوو هەوڵمدا بەرپرسەکەمان ڕازی بکەم باروودۆخەکە گۆڕاوەو خەریکین تووشی شکست دەبین. بەڵام ئەو ئاگاداری باسەکە نەبوو، نووسینگەی نیۆیۆرکی لەبەر شێوازی لاوازی فرۆشتن تۆمەتبار دەکرد. لەپاش چەند ڕۆژ پاڕانەوە سەرەنجام توانیم ڕازی بکەم بەستەکردنی شاتووەکان ڕابگرێت و ئەوەندە لەعەمباردا مابووەوە لەبازاڕی میوەی تازەی سان فرانسیسکۆ بیفرۆشێت. کەمو زۆر کێشەکە چارەسەر بوو، من دەبوایە لەدەستی نیگەرانی ڕزگارم بووایە، بەڵام وانەبوو. نیگەرانی خوویەکەو ئەم خووە لەمندا دروست ببوو.

کاتێک گەڕامەوە بۆ نیۆیۆرک سەبارەت بە هەموو شتێک نیگەران بووم، گێلاسە کراوەکان لەئیتالیا، ئەناناسەکانی هاوایی و.....هتد. عەسەبی، زووهەڵچوون، تووشی بێخەویش ببووم. لەو پەڕی بێ هیواییدا شێوازی ژیانی خۆم گۆڕی و ئەم کارە نەک هەر بێ خەوییەکەمی دەرمان کرد، بەڵکو نیگەرانیەکەشمی لەناو برد. هەرچی زیاتر خۆم سەرقاڵی کارکردن کرد. کارێک کەتەواوی هێزی منی دەگرتە خۆ. لەوەپێش ڕۆژی (٧) کاتژمێر کارم دەکرد، بەڵام ئەم کاتە بۆ (١٥) تا (١٦) کاتژمێر زیادیکرد. هەموو ڕۆژێک کاتژمێر (٨) دەچووم بۆ نوسینگەکەم و تا نیوە شەو کارم دەکرد. ئەرک و بەرپرسیارەتی نوێم وەرگرت و کاتێک دەگەیشتمەماڵەوە بێهۆش لەسەر جێگەکەمدا خەوم لێدەکەوت.

بۆ ماوەی سێ مانگ درێژەم بەم بەرنامەیەدا. لەم ماوەدا توانیبوم خوی نیگەرانی لەمێشکم دەرکەم. کەواتە گەڕامەوە بۆ بەرنامەی ئاسایی ڕۆژی (٧) یان (٨) کاتژمێر کاری خۆم. ئەم شتە (١٨) ساڵ لەمەوبەر ڕوویداو لەوە بەدواوە هەرگیز دوچاری بێ خەوی یان نیگەرانی نەبووم.

بەرنارد شۆ دەڵێ: (( نهێنی بەدبەخت بوون ئەوەیە ئەوەندە کاتی بێکاریت هەبێ بیر لەوە بکەیتەوە بەختەوەری یان نا)) کەواتە هیچ دەربارەی بیرمەکەنەوە. قۆڵتان هەڵماڵن و دەست بکەن بەکار. خوێنتان دەکەوێتە ڕەوانی، مێشکتان دەست بەکار دەکات و هێزی ژیان دێتە ڕەگ و دەمارتان و نیگەرانی لەدەروونتان دەردەکات. چالاکیتان زیاد بکەن. ئەمە هەرزانترین ڕێگەیە بۆ دەرمانی نیگەرانی.

یاسای یەکەمی تەرکی خووی نیگەرانی:

سەرقاڵی خۆتان زیاد بکەن، کەسی نیگەران ئەگەر لەکاردا نوقم نەبێ لەبێکاریدا دەپەشۆکێت..

## بابەتی دووەم

# ڕێگەمەدەن گوشار نێوە لەپێ بخات

بەڕێز ڕابێرت مۆر داستانێکی بۆ گێڕامەوە کە هەرگیز فەرامۆشی ناکەم. ئەو وتی:
(( لەمارتی ساڵی ١٩٤٥دا

گەورەترین دەرسی ژیانم وەرگرت و ئەمە لەحاڵێدا بوو کە لەکەناراوەکانی هیندۆچین لەقووڵایی ٢٧٦پێدا لەناو زەریادا بووین. لەو کاتەدا من یەکێك لە(٨٨) کەسی ناو ژێر دەریایی BAYA.S.S.٣١٨ بووم. لەسەر ڕادارەکە کاروانێکی دەریایی ژاپۆنی دەرکەوت و ژێردەریاییەکی بۆ هێرش سەر لەبەیانی چووە سەر ئاوەکە. لەهۆی پریسکۆپەوە پاپۆڕێکی شەڕکەر، نەوت هەڵگرێك و پاپۆڕێکی مین دانەرم بینی. سێ ساروخمان نارد بۆ پاپۆڕی شەڕ کەر، بەڵام نەیپێکا،چونکە ساروخەکان عەیبیان هەبوو. پاپۆڕەکە ئاگاداری هێرشەکە نەببوو. درێژەی بەڕێگەکەی خۆیدا. ئامادە نەبووین هێرش بکەینە سەر دواین پاپۆڕ کە کوتوپڕ پاپۆڕە شەڕکەرەکە بەرەو لای ئێمە سووڕایەوە.

( فڕۆکەیەکی شەڕکەری یابانی بەڕادار شوێنی ئێمەی پێزانیبوو. ئاگاداری کردبوونەوە ).

چووینە قووڵایی(١٥٠) هەنگاو، دەربیجەکانمان توند کرد و بۆ ئەوەی شوێن پێمان نەگیرێت سیستەمی فێنك کەرەوە، پانکەکان و دەندە کارەباییەکانمان کوژاندەوە. سێ خولەك دوای ئەوە دۆزەخمان بەسەردا داباری. شەش بۆمب لەدەوری ئێمە تەقیەوە و ئێمەی فڕێدا بۆ قووڵایی (٢٧٦) پێ. ئەگەر لە (١٠٠٠) پێ هێرش بکرێت مەترسیدارە و ئەگەر لە (٥٠٠) پێ کەمتر بێت کوشندەیە. ئێمە لەنیوەی ئەوەیشدا بووین! بۆ ماوەی پانزە کاتژمێر پاپۆڕە مین دانەرەکە بۆمبی بۆ قووڵایی دەریاکە فڕێ ئەدا. ئەگەر بۆمبێك لەدووری (١٧) پێوە لەژێر دەرییاییەکە بتەقیایەتەوە گوشارەکەی دەیتوانی ژێر دەریاییەکە کون بکات. فرمانیان بەئێمە دابوو ئارام لەتەختەکانماندا

ڕابکشێنین و نەترسین. ئەوەندە ترسابووم کە نەمدەتوانی هەناسە بکێشم. بەردەوام بەخۆمم دەوت کارمان گەیشتووەتە کۆتایی. لەگەڵ ئەوەی ژێر دەریاییەکە زۆر گەرم بوو من لەترساندا دەلەرزیم و قەمسەڵەو بلووزی گەرمم لەبەر کردبوو. چۆقەی ددانەکانم دەهات و عارەقێکی سارد نیشتبووە سەر لەشم.

هێرشەکە پانزە کاتژمێری خایاندو پاشان کوت وپڕ وەستا. لەوانەیە بۆمبەکانی کەشتیەکە تەواو ببوو، وازی هێنابوو. ئەو پانزە کاتژمێرە وەکو پانزە ملیۆن ساڵ ڕابووردو هەموو ژیانم وەکو فلیم لەپێش چاوانمەوە تێپەڕی تەواوی کارە خراپەکان و تەواوی ئەو شتەبێ نرخانەی لەبەریان ڕەنجم چەشتبوو هاتەوە یادم. لەپێش چوونم بۆ نا و هێزی دەریایی فەرمان بەری بانك بووم و لەبەر ماوەی زۆری کارکردن، داهاتی کەم و خاوبوونی پێشکەوتنم، نەبوونی خانوو، بێ توانایی لەکڕینی شتانی باش بۆ هاوسەرەکەم، نەفرەت لەبەرپرسەکەم و شوێنی برینداری سەر ناوچاوانم هەمیشە نیگەران بووم.

چەند ساڵ لەمەوبەر ئەم شتانە لەبەر چاومدا گەورە بوون، بەڵام کاتێك بۆمبەکان لەدەوروبەرماندا دەتەقینەوە زۆر گاڵتە بەر چاو دەهاتن. بەڵێنم بەخۆمدا ئەگەر دیسان ڕۆژو ئەستێرەکان ببینمەوە هەرگیز نیگەران نەبم. لەماوەی ئەم پانزە کاتژمێرەدا زیاتر لەچوار ساڵی خوێندنی زانکۆم هونەری ژیان فێر بووم)).

ئێمە زیاتر لەبەرامبەری کێشە گەورەکاندا بەهێزەوە بەرەو ڕوودەبینەوە، بەڵام دوایی ڕێگە ئەدەین کێشە بچووکەکان بەسەرماندا زاڵ بن. بۆ نموونە ساموئیل پەپیس کەشایەت حاڵی ئیعدامی سێر هەری ویز بوو لەلەندەن، نووسیویەتی ئەو تکای لەجەلادەکە دەکرد کاتێك لەملی ئەدەن ئاگاداربن لێدانەکە لەسەر دوملە پڕژانەکەی ملی نەبێ.

دەریاوان بێرد لەجەمسەری باشوور لەوسەرما و تاریکیە کامڵەدا لەویش گەیشتبوو خەڵك زیاتر نیگەرانی دوملەکان دەبن تاکو کێشە بناغەییەکان. ئەو دەڵێت خەڵك بەبێ گلەیی سەرما و سەختی و مەترسیەکان تەحەممول دەکەن. بەڵام بینیومە لەکەشتیدا دووکەس کە تەختەکانیان پێکەوە چەسپاوە لەگەڵ یەکتر قسەناکەن، چونکە یەکیان هەستی دەکرد ئەوی تر شتەکانی خۆی بەلای ئەودا کۆدەکاتەوە تاکو جێگەی خۆی زیاتر بێت. مەلەوانێکیش هەبوو نەیدەتوانی بەبینینی یەکێك

لەمەلەوانەکانی تر کە لەپێش قوت دانی خواردنەکەیدا (٢٨) جار دەیجاوی، هیچ بخوات‌و هەمیشە بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا هەتا کاتی نان خواردنی ئەو نەیبینێت.

دەریاوان بێرد دەڵێ لەئۆردوگای جەمسەردا شتانێکی ئەوەندە گاڵتە مێزیان هەیە کە دەتوانن تەنانەت ڕێك‌و پێك ترین کەسان تاسەرحەدی شێتیەتی عەسەبی بکەن ئەو دەیوت ئەم شتە بێ نرخانە لەهاوسەرگیریشدا دەتوانن خەڵك تاسەرحەدی شێتیەتی عەسەبی بکەن‌و هەروەها نیوەی جەڵدەکانی دڵی دنیا بخولقێنن. ئەمە وتەیەکە کەخاوەن فیکرانیش دەیڵێن. بۆ نموونە دادوەر جۆزێف سەبەس لەپاش دادوەری لەچل هەزار هاوسەر گیری ناکامدا وتی:

(( کێشە کەم بایەخ‌و وردەکان هۆکاری زۆربەی هاوسەر گیرییە بێ ناکامەکانن))

هەروەها فرانکلین هۆگان، پارێزەرێك لەنیویۆرك دەڵێ لەزۆربەی فایلە پیاوکوژییەکاندا هۆکاری دەست دانە جەنایەت شتانی کەم بایەخن. بۆ نموونە: شەڕی ناو نادییەکان، شەڕی ناو گەڕەك، سووکایەتی، بچووك کردنەوە، نەتوانی ناشرین‌و.....کەمتر کەسێك بەڕاستی لەژیاندا تووشی حەق کوژی ستەمکارانە دەبێ. زۆربەی بێ ڕێزیەکان‌و سووکایەتییە بچووکوکان بەنیسبەتی کەسایەتیەوە، هەیبەت‌و خۆبەزلزانی دەبێتە هۆی بێزاری. کاتێك ئەلنۆر رۆزڤێلت لەسەرەتاکانی هاوسەر گیریدا بەهۆی ئەوەی چێشت لێنەرەکەی خواردنێکی خراپی ئەدایە ڕۆژانە بێتاقەت دەبوو، بەڵام بەوتەی خۆی ئەگەر ئێستا بوایە هیچ بەخەیاڵیدا نەدەهات. ئەمە بەڕوو بەڕوو بوونەوەیەکی هەستی عاقڵانە ناودەبرێت. من‌و خاتوو کارینژی بۆ ئێوارە لەماڵی یەکێك لەهاوڕێکانمان لەشیکاگۆمیوان بووین. ئەو لەحاڵی بڕینی گۆشتدا کارێکی هەڵەی کرد کە من هیچ ئاگام لێنەبوو، ئەگەریش ئاگام لێنەبوایە هیچ گرنگیم پێ نەئەدا. بەڵام هاوسەرەکەی ئەو لەو ساتەدا تووڕە بوو، هاواری کرد:

(( جان، تۆ کەی ئەتەوێ فێرببی چۆن خواردن ڕاکێشی؟))

پاشان بەئێمەی وت: (( جان هەمیشە لەم هەڵانە دەکات‌و هیچ هەوڵ نادا فێرببێت )) لەوانەیە ئەو فێر نەبووبێ چۆن گۆشتەکە ببڕێت، بەڵام من بەهۆی ئەوەی (٢٠) ساڵ لەگەڵ ئەو ژنەدا ژیانی کردبوو، ڕێزم بۆ دادەنا. پێم خۆش بوو دوو دانە سوویسم لەئارامیدا بخواردایە بەڵام ئەم سووکایەتیەم نەبیستایە تانەوەی گۆشتی مراوی لەپەنای ئەودا بخۆم.لەپاش ئەو تەجرەبەیە خاتوو کارینژی‌و من بۆ ئێوارە میوانمان

هەبوو. دروست لە پێش هاتنە ژوورەوەیان خانم بۆی دەرکەوتبوو سێ دانە لەدەسماڵە سفرەکان لەگەڵ پارچەی سەرمێزەکەدا ناگونجێن. بەلام دوایی بۆی گێرامەوە کە: (( بەپەلە چووم بۆلای چێشت لێنەرەکە بەلام ئەو سێ دەسماڵە لەناو ئامێری جل شۆردا بوون. میوانەکان لەپێش دەرگاکەوە بوونو مەجالی گۆڕینی دەسماڵەکان نەبوو. خەریک بوو فرمێسکەکانم دەهاتنە خوارەوە. بەخۆمم وت چ مۆیەکی هەیە ئەم هەڵە بچووکە تەواوی ئەم دوانیوەڕۆیەم تێک بدات. پێم باش بوو میوانەکانم بیر بکەنەوە من ژنێکی شپرێوم تا ئەوەی بڵێن مۆنەو تا ئەو شوێنەی بزانم کەس بەم هەڵەی نەزانی)).

قسەیەک لەبەینی مافناسەکاندا هەیە کەدەڵێت: یاسا بۆ شکانی وردو کەم بایەخ نیە، دەبێ بڵێم نیگەرانیش بۆ ئەم شتانە نیە.

زۆر بەی کات ئەو شتەی پێویستمانە تا بەسەر ئەم جۆرە نیگەرانیانەدا زاڵ بین، گۆڕین یان هەڵگرتنی جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەم کێشەیە. واتە دروست کردنی ڕوانگەیەکی نوێ سەبارەت بەو بارو دۆخە. هاوڕێی من هۆمەر کرۆی، نووسەری کتێبی (( دەبوا پاریسیان بدیایە )) دەربارەی ئەوەی چۆن ئەم گۆڕینی ڕوانگەیە ئەنجام بدەین نموونەیەکی باش دێنێتەوە. پێشتر کاتێک کاری لەسەر کتێب دەکرد تەنانەت لەدەنگی بۆریەکانیش نیوە شێت دەبوو. ئەو دەڵێ: (( لەو کاتەدا لەگەڵ چەند کەس لەهاوڕێیانم چووین بۆ سەفەر. کاتێک خەریک بووم گوێم لەدەنگی سووتانی دارو چیلکە دەگرت، هاتە مێشکم ئەم دەنگە چەندە هاوشێوەی دەنگی بۆری ڕادیێتەری شوقەکەمە. بۆچی لەیەکیان شادو لەوەی تر بێزار دەبم؟ کاتێک گەرامەوە بۆ شوقەکەم بەخۆم وت دەنگی ڕادیێتەرەکە هاوشێوەی دەنگی سووتانی دارە، کەواتە نابێت بێزارم بکات. ئەم کارە بەسوود بوو، لەپاش چەند ڕۆژ هیچ ئاگام لەدەنگی ڕادیێتەرەکە نەبوو.

زۆرێک لەنیگەرانیەکان هاوشێوەی ئەمەن. چونکە زیاد لەئەندازە گرنگیان پێ ئەدەین ئێمە ئازار ئەدەنو بێزارمان دەکەن)).

یەکێک لەسیاسەتمەداران و نووسەرانی سەدەی هەژدە دەڵێ (( ژیان بۆ بچوک بوون زۆر کورتە )). بە شێوەی گشتی شتانێکی کەم بایەخ کە دەبێ لەبیر بکرێن، ئێمە بێتاقەت دەکەن..... ئێمە لەم دنیایەدا تەنیا چەند دەیە مەجالی ژیانمان هەیە، کەواتە

نابێ کاتژمێره نەگەڕاوەکان تەرخانی بیرکردنەوەو خەمو خەفەت خواردن بکەین. لەجیاتی ئەوە دەبێ خۆمان تەرخانی کاروهەستی بەنرخ، ئەندێشەی گەورەو بەرپرسیارەتیە گەورەکان بکەین، چونکە ژیان بۆ بچووك کردن زۆر کورتە. تەنانەت کەسایەتیەکی گەورەی وەکو (( ڕۆدیارد کیپلینگ))یش ئەم بابەتەی لەبیر دەکرد. لە ئەنجامدا ئەو و ژن براکەی بەناو بانگترین کێشەی دادگای وەرمۆنتیان دروست کرد. ئەم کێشەیە ئەوەندە ناودار بوو کە کتێبی (( دادگای کیپلینگ لەوەرمۆنت))ی دەربارەوە نووسرا.

داستانەکە بەم جۆرە بووکە ڕودیارد لەگەڵ کچێکی وەرمۆنت هاوسەر گیری کردو خانوویەکی جوانی لەبەرتلبۆرۆ کڕی. ژن براکەی واتە بیتی بەلستیر بووە باشترین هاوڕێی ئەو.ئەوان پێکەوە کارو کەیفو سەیرانیان دەکرد. پاشان ڕودیارد پارچە زەوییەکی لەو کڕی بەو مەرجەی بیتە ڕێگەی هەبێت هەمووساڵێك کاکەی بدوورێتەوە. ڕۆژێك بیتی سەیری کرد ڕودیارد لەشوێنی وێنجەکاندا باخچەی گوڵی دروست کردووە. ئەو تووڕە بوو، ڕودیاردیش وەڵامی دایەوە و شەڕێکی تەواو لەنێوان ئەم دووانەدا ڕوویدا.

چەند ڕۆژ دوای ئەوە ڕوردیاردخەریکی پاسکیل سواری بوو، ژن براکەی بە عەرەبانەیەك بەرەو ئەو ڕۆیشتو لەپاسکیلەکەی خستیە خوارەوە. ڕودیاریش، هەر ئەو نووسەرەی دەیوت: (( ئەگەر بتوانیت بەسەر خۆتا زاڵ بیت کاتێك خەڵك تووڕە بوونو سەرزەنشتی تۆ دەکەن، ئەو کاتە...)) خۆی لەو کاتەدا تووڕە ببوو، سکاڵایەکی لەدژی بیتی تۆمار کردوحوکمی گرتنی ئەوی وەرگرت. لەدرێژەدا دادگەیەکی پڕهەمهەمە دروست بوو کە هەواڵنێرانی لەهەموو شوێنێك ڕاکێشایە وەرمۆنت. ئەم هەواڵە لەهەموو شوێنێك بڵاو بووەوە، بەڵام هیچ ئاکامێکی نەبوو. لەدوای ئەوە ڕودیاردو هاوسەرەکەی ئەمریکایان بۆ هەمیشە بەجێهێشت. ئەم هەموو ئازارو سەختیە تەنیا لەبەر باخە کایەك.

ئێستا گوێ بۆ لەسەرنج ڕاکێش ترین داستانەکانی دوکتۆر ((هەری ئێمرسۆن)) فۆسدیك دەربارەی شەڕەکانی دێوێکی دارستانەوە بگرن:

لەداوێنی چیای لانگزپیك لەکۆلۆرادۆ پاشماوەی درەختێکی زەبەلاح هەیە. سروشت ناسان تەمەنی ئەم دارەیان بە (٤٠٠) ساڵ شیمانە کردووە. لەماوەی ئەم

تەمەنە درێژەیدا ئەم دارە (١٤) جار دوچاری هەورە بریسکە بووەو چەندەها جار لەبەرامبەری هەرەسی بەفردا وەستاوە. سەرەنجام مێروو هێرشیان کردە سەرو سەرەو نگوتیان کرد. مێرووەکان بەهێرشی بچووک بەلام بەردەوامی خۆیان جەستەی دارەکەیان خواردو ناوەکەیان بۆش کرد. ئەو درەختە زەبەلاحەی لەبەرامبەری هەورە بریسکەو توفان و رابوونی زەماندا وەستا بوو، بەدەستی مێروانێک لەناو چوو کەدەتوانین لەبەینی پەنجەدا پانیان کەینەوە.

ئایا ئێمە هاوشێوەی ئەو دارە نین کە بەلا گەورەکان پشتگوێ دەخەین بەلام لەبەرامبەری کێشە بچووکەکان کە بەئاسانی دەتوانین لەناویان بەرین سەرداەنەوێنین؟

چەند ساڵ لەمەوبەر لەپارکی نەتەوەیی تەتون لەوێومینگ لەگەڵ چارلز سیفرێدو هاورێکانی بەرەو مڵکەکانی جان دی راکفلێر دەڕۆیشتین. ئەو ئۆتۆمبێلەی من سواری بووم ڕێگەکەی ونکردو هەربەوهۆیەوە یەک کاتژمێر درەنگتر لەوانی تر گەیشتینە دەرگای شوێنی دیاری کراو. سیفرێد چونکە کلیلی دەروازەکەی پێنەبوو، یەک کاتژمێر لەناو ئەو مێشوولانەی مێواشترین کەسانی شێت دەکرد، چاوەڕێ بوو بەلام شێت نەبیوو. لەجیاتی ئەوە بەلەتە دارێک فیقەنەیەکی بۆ خۆی دروست کردبوو. ئەو لەجیاتی شەڕ لەگەڵ مێشوولەکان خەریک بوو فیقەنەی بۆ خۆی لێنەدا. ئەو فیقەنەیەم وەکو یادگاری پیاوێک کە دەیزانی چۆن ڕوو بەڕووی کێشەو گرفتی وردو بچووک بێتەوە، هەڵگرتووە.

## یاسای دووەم: بۆ تەرکی خووی نیگەرانی:

ڕێگە مەدەن شتانێکی کەم بایەخ کەدەبێ لەبیر بکرێن، ئێوە بێزار بکەن. ژیان بۆ بچووک کردنەوە زۆر کورتە.

بابەتی سێیەم

## یاسایەک کەنیگەرانیەکان لەمەیدان دەردەکات

مندالیم لەکێلگەیەک لەمیسۆری بەسەرچوو. رۆژێک لەحالی یارمەتیدانی دایکم بۆ دەرهێنانی ناوکە گێلاس دەستم کرد بە گریان. دایکم پرسیاریکرد: دیل بۆچی ئەگری؟ وەلامم‌دایەوە:

(دەترسم رۆژێک بە زیندوویی زیندە بەچال بکریم؟)

ئەو رۆژانە زۆر نیگەرانبووم. دەترسام رۆژێک هەورە بروسکە لیمبدات یان کاتێک هەژاربووین دەترسام لەبرسێتیدا بمرین. دەترسام لەپاش مەرگ بچم بۆ جەهەننەم. دەترسام یەکێک لەمندالە یاخییەکان کە هەڕەشەی لەمن کردبوو، گوێچکەکانم ببرێت. دەترسام ئەگەر کلاوەکەم بۆ کچان لابەرم پێم پێبکەنن. دەترسام هیچ کچێک نەیەوێ ببێتە هاوسەرم. دەترسام لەکاتی گەڕانەوە لەکلێساچۆن لەگەل هاوسەرەکەمدا قسە بکەمو.....

لەگەل رابوونی سالەکان تێگەیشتم ٩٩٪ی ئەو شتانەی من لێی دەترسام هەرگیز رووی نەدا. بۆ نموونە لەهەورە بروسکە دەترسامو بەگوێرەی راگەیاندنی کۆڕی ئاسایشی نەتەوەیی ئەگەری لێدانی هەورە بریسکەی هەر کەسێک لەیەک سالدا تەنیا یەکە لە(٣٥٠,٠٠٠). ترسم لەزیندە بەچالبوون بوو، ئەویش لەو نابەجێتر بوو. تەنانەت کاتێک زیندەبەچالکردن وەکو یاسا دەژمێردرا تەنیا یەک کەس لە (١٠) ملیۆن کەس گرفتاری دەبوو، دەبوو من لەبابەتێکەوە کەوتبوومە گریان کە هەرگیز ئەکەری روودانی نەبوو. لەحالێکدا لە(٨) کەس یەک کەسیان بەهۆی شێرپەنجەوە دەمرێت. ئەگەر دەمویست لەشتێک بترسم دەبوا شێرپەنجە بووایە نەک هەورەگرمەو زیندەبەچالبوون.

بێگومان ئەمانە ترسی دەورانی لاوی‌و مێردمنداڵین، بەڵام ترسی کاتی گەورەییش هەر بەو رادەیە بێ مانان. هەموو ئێمە ئەگەر بتوانین هەر ئێستا بەبیرکردنەوە لەم بوارە کە بەپێی ئامار ئەگەری روودانیان چەندەیە، ترسەکانمان بوەستێنین ئەوکاتە دەتوانین ٩٠٪ی ترس‌و نیگەرانییەکان لەخۆمان دوربخەینەوە.

کۆمپانیای دڵنیایی کۆمەڵایەتی لۆید لە لەدەندەن کە بەناوبانگترین پێشکەشکاری خزمەتگوزاری دڵنیایی توانیویەتی هەر لەم ترسە نابەجێیەی خەڵک سەبارەت بە شتانێك کە زۆر بەکەمی روودەدات ملیۆنەها دۆلار پارەی دەستکەوتووە. ئەم کۆمپانیایە خەڵك دڵنیا دەکاتەوە ئەم نیگەرانیانە هەرگیز روونادەن، ئەڵبەت ئەم کارە بە یاسای ئەگەرەکان ناونابەن بەڵکو ناوی دەنێن دڵنیایی. ئەم کۆمپانیایە (٢٠٠) ساڵە بەهێزەوە درێژە بەکاری خۆی دەدات‌و ئەگەر خودی مرۆڤ نەگۆڕێت تا (٥٠) سەدەیتر دەکەونە دابینکردنی دڵنیایی بۆ پێڵاوو کەشتی‌و مۆم‌و... لەبەرامبەر شتانێکدا کە زۆر بەکەمی روودەدەن.

ئەگەر یاسای ئەگەرەکان بخوێنینەوە تووشی تێڕامان دەبین. بۆ نموونە ئەگەر بە منیان بوتایە پێنج ساڵی تر لەشەڕێکدا بەشدار دەبم کە ئەگەری زیندوو مانم زۆر کەمە بێگومان دابینی تەمەنم وەردەگرتەوەو هەوڵم ئەدا ئەم چەند ساڵە بەباشترین شێوە بگوزەرێنم، لەحاڵێکدا بەپێی یاسای ئەگەرەکان ژیان لە(٥٠-٥٥) ساڵی بۆ نموونە لەزمانی ئاشتیشدا هەر ئەوەندە مەترسیدارە کە لەزمانی بەشداربوونی شەڕدا هەیە. مەبەستم ئەوەیە کە لەزمانی ئاشتیدا ژمارەی ئەو کەسانەی لەبەینی تەمەنی (٥٠-٥٥) ساڵی دەمرن یەکسانە لەگەڵ ئەو ژمارەیەی کەسانی (٥٠-٥٥) ساڵ کە لەبەینی بۆ نموونە (١٦٣٠٠٠) سەربازی شەڕی گتیسبۆرگدا کوژران.

لەکەنەدا خانمی سلینگەرو هاوسەرەکەیم ناسی کە خەڵکی سانفرانسیسکۆ بوون. خاتوو سلینگەر ژنێکی بە هەیبەت‌و ئارام بوو تائەو رادەیەی هەستم کرد ئەو هەرگیز دووچاری نیگەرانی نەبووە. ڕۆژێك لەپێش دەمی شۆمینەکەدا دانیشتبووین پرسیارم لێکرد ئایا هەرگیز تووشی ترس‌و نیگەرانی بووە؟ وەڵامی دایەوە: ((لە پێش ئەوەدا کە فێرببم چۆن بەسەر ترسەکانمدا زاڵ ببم، ژیانم بەدەستی ئەوانەوە خەریك بوو لەناو دەچوو.(١١) ساڵ ژیانم لەخۆم کردبووە دۆزەخ‌و زۆر عەسەبی‌و دڵشکا‌و دەبووم. کاتێك لەماڵ دەچوومە دەرەوە تەنیا نیگەران بووم نەکا‌و ئوتوووەکە بەکارەباوە بێت‌و

ماڵەکە ئاگر بگرێت، یان خزمەتکارەکە منداڵەکان بەجێ بهێڵێت، یان لەکاتی پاسکیل سواریدا تووشی پێکان بووبن و....زۆر جار ئەم فیکرو ترسانە عارەقێکی ساردی بە لەشمدا دەڕشت و خێرا دەگەڕامەوە بۆ ماڵ تاببینم هیچ ڕوونەداوە. سەیر نیە کە هاوسەرگیری یەکەمم بەقەیران کۆتایی پێهات)).

هاوسەری دووەمم و ئەوەی ئێستام پارێزەرێکی زۆر لەسەرخۆو عاقڵ و هێمن بوو. کاتێک نیگەران دەبووم بەمنی دەوت: (( ئارام بە، یان پێکەوە ئەم کێشەیە هەڵدەسەنگێنین....چ شتێک تۆ نیگەران دەکات؟ وەرە بابەیارمەتی یاسای ئەگەر و ئامار بزانین ئەم ترس و نیگەرانیەی تۆ تاچ ڕادەیەک ڕاست دەبێتەوە)).

بۆ نموونە جارێک لەجادەیەکی گڵدا دەڕۆیشتین کە گرفتاری تۆفان و بارانێکی زۆر بووینەوە. ئۆتۆمبێلەکە هەڵدەخزاو نەماندەتوانی بەسەریدا زاڵ بین. من دڵنیابووم لەجادەکە لادەدەین و وەرئەگەڕێین. بەڵام هاوسەرەکەم بەردەوام دەیوت: من زۆر بەئارامی شۆفێری دەکەم و هیچ ڕوونادات. تەنانەت ئەگەر بەم خێراییە کەمەوە وەریشبگەڕێین هیچمان لێ نایەت. هێمنی ئەو منیشی ئارام کردەوە.

شەوێکی هاوین کەیەکێک لەچیاکانی ڕاکی چادرمان هەڵدابوو. زریانێکی سەخت پەیدا بوو، نزیک بوو چادرەکانمان لەتوپەت کات. چادرەکان بەتەختەیەکی پانەوە بەسترابوونەوەو بەهۆی توندی زریانەکەوە دەلەرایەوەو هەردەم چاوەڕێ بووم چادرە لەتوپەتەکەمان لەناوەڕاستی ئاسماندا ببینمەوە. هاوسەرەکەم وتی: ((گوێ بگرە بەقوربان، ئێمە لەگەڵ شارەزایانی ناوچەکەدا گەشت دەکەین. ئەوان کاری خۆیان دەزانن و شەست ساڵە لەم شوێنەدا چادر هەڵئەدەن. ئەگەر ئەم چادرە تائێستا چەند ساڵ دەوامی هێناوە، کەواتە هۆیەکی نیە ئەمشەو تێک بشکێت. تەنانەت ئەگەر وایش بێت ئێمە دەتوانین بچینە چادرێکی تر. کەواتە ئۆقرە بگرە)). بەم قسەی ئەو توانیم ئەو شەوە بەئاسوودەیی بخەوم.

چەند ساڵ لەمەوبەر لەوبەشەی لەکالیفۆرنیا کە ئێمە لێی ئەژیاین نەخۆشی شەلەلی منداڵان داکەوت. ئەگەر هاوسەرەکەم نەبوایە من دوچاری هیستریا و نیگەرانی دەبووم، بەڵام ئەو یارمەتی منیدا تاکو ئۆقرەیی خۆم ڕابگرم. تەواوی چاودێرییە پێش بینی کراوەکانمان ئەنجامداو منداڵەکانمان لەقەرەباڵغی و قوتابخانەو سینەما بە دوورگرت.لەپاش ڕاوێژ لەگەڵ کۆمیتەی تەندروستی تێگەیشتین کە خراپترین حاڵەت



 

کە تائێستا بینراوە تەنیا (١٨٣٥) منداڵ لەتەواوی پارێزگاکەدا تووشی ئەم نەخۆشییە بوون و لەهەل و مەرجی ئاساییدا تەنیا (٢٠٠ یان ٣٠٠) کەسە. کەواتە بەزانینی ئەم ئامارە تێگەیشتم کە ئەگەری تووشبوونی منداڵەکانم بەم نەخۆشیە زۆر کەمە. ئەم ڕستەیە کە ((بەپێی ئامار ئەگەری ئەم ڕووداوە نیە)) تـوانی ٩٠٪ی نیگەرانیەکان و ترسەکانی منی لەناو بردو (٢٠) ساڵی ئاخری ژیانی منی پڕ لەشادییەکی زۆر کرد.

ژەنراڵ جۆرج کرۆك لەکتێبەکەیدا بەناوی ((ژیاننامە)) دەنووسێت: ((کەم و زۆر تەواو ترس و نیگەرانیەکانی خەڵکی هیندستان دروستکراوی خەیاڵاتی ئەوانە و لەڕاستیەوە دوورە)).

کاتێك سەیری ڕابردوو دەکەم دەبینم ڕیشەی زۆربەی ترس و نیگەرانیەکانی خودی منیش هەرئەم خەیاڵاتانە بوون. هاوڕێی من جیم گرەنت کەخاوەنی کۆمپانیای بلاو کردنەوەی مەوادی خۆراکە بۆی گێڕامەوە کە ئەویش کێشەیەکی هاوشێوەی بووە ئەو داوای (١٠تا١٥) واگۆن پرتەقاڵ و میوەو سەوزەواتی لە فلۆریدا دەکرد و بەردەوام نیگەرانی ئەوە بوو ئەگەر شەمەندەفەرەکە وەربگەڕێ یان پردێك خراپ ببێت چ بەڵایەکی بەسەر دێت. ئەڵبەت زەمانەت بۆ میوەکان کرابوو بەڵام ئەو دەترسا ئەگەر لەکاتی دیاریکراودا نەتوانێ میوەکان بگەیەنێت،ئەوا متمانە لەدەست دەدات. لەتاو نیگەرانی شکی بردوو تووشی برینی گەدە بووە هەر بەم هۆیەوە چوو بۆلای پزیشك بەڵام هیچ گرفتێکی نەبوو لەکێشەی عەسەبی زیاتر. ئەو دەڵێ: ((لەوکاتەدا بوو کە فیکرێك بە مێشکمدا هات. پرسیارم لەخۆم کرد تا ئێستا چەند کاروانی میوەت ئەملاولا پێکردوە؟ وەڵامەکەی کەم و زۆر (٢٥) هەزار جار بوو. تا ئێستا چەند کاروانی تووشی کێشە بووە؟ نزیکی (٥) کاروان. بەڵێ، دەکاتە یەك لە(٥٠٠٠) جار. واتە شتێکی زۆر هیچ. بەپێی ئامارو بەپێی تەجرەبە ئەگەری خراپ بوونی کاروانێك یەك لەبەرامبەری (٥٠٠٠)ە، کەواتە من بۆچی دەبێ ئەوەندە نیگەران بم؟

پاشان بەخۆمم وت باشە ئەگەری ئەوە هەیە پردێك خراپ بێت، بەڵام من تا ئێستا چەند باری میوەم بەهۆی خراپ بوونی پردەوە لەدەست داوە؟ هیچ. کەواتە ئەبێ شێتبم لەبەر پردێك کە هەرگیز خراپ نەبووەو لەبەر مەترسی لەدەستدانی واگۆن

گەلێك کە ئەگەرەکەی یەك لە(٥٠٠٠)ە ئەوەندە نیگەرانی بکێشم کە تووشی برینی گەدەببم)).

جیم گرەنت بەمنی وت: (( کاتێك لەم ڕوانگەوە سەیری بابەتەکەم کرد هەستی کەریەتیم لا دروست بوو، بڕیارمدا بەئامارو یاسای ئەگەرەکان بچمە شەڕی نیگەرانی. لەوە بەدواوە چیتر تووشی ڕنجی برینی گەدە نەبووم)).

کاتێك ئاڵ سمیت قایمەقامی نیۆیۆرك بوو، لەکەسە نزیکەکانیەوە بیستم ئەو لەبەرامبەری ئەو هێرشە سیاسیانەی لەلایەن ڕکەبەرو دژبەرەکانیەوە ڕوونەدات، بەوتنەوەی ئەم ڕستەیە کە (( باڕابردوو هەڵبسەنگێنین)) بەرەوڕوو دەبێتەوە و پاشان دەکەوێتە پیشاندانی زانیاریو ڕاستیەکان. وەرن بائێمەیش ئەم وانەیە لەئاڵ سمیتەوە فێرببینو ئەم جارە کەنیگەرانیو دڵە ڕاوکێ هاتە سەرمان، بەگەڕانەوە بۆ ڕابردوو سەبارەت بەسەرچاوەکانی ئەم نیگەرانیە لێکۆڵینەوە بکەین(ئەڵبەت ئەگەر سەرچاوەیەکی هەبێ).

سەربازێکی کۆن لەیەکێك لەوانەکانی پەروەردەی گەورە تەمەنانی مندا داستانی ئەوەی چۆن بەسەر ئەو ترسەدا کە لەگۆڕەکەیدا ڕاکشاوە و چاوەڕوانی مەرگە، زاڵ بووە، بۆی گێڕامەوە داستانەکە بەم جۆرە بووە:

(( ڕۆژێك لەسەرەتای مانگی جوونی (١٩٤٤) لەکەنار ئاوی ئۆماها کەسەنگەرێکی شێوە چاڵی لاکێشدا ڕاکشا بووم. هەروا کە سەیری ئەملاولای سەنگەرەکەم دەکرد کە لاکێشی بوو، بەخۆم وت سەنگەرەکە دروست هاوشێوەی گۆڕە. هەر ئەوەندەی ویستم بخەوم هەستم کرد بەڕاستی لەناوگۆڕدامو بەخۆمم وت ئەمەگۆڕی منە. کاتێك فڕۆکە بۆمب هاوێژەکانی ئەڵمانی کاتژمێر (١١)ی شەو بەسەر سەرمانەوە دەرکەوتنو دەستیان کرد بە بەردانەوەی بۆمبەکانیان، لەترسدا دەستو قاچم وشك ببوو.دووسێ شەوی یەکەم لەترسدا خەوم لێنەکەوتو بەرەبەرە بووم بەکەسێکی تێکشکاو و دەمارگیر. دەمزانی ئەگەر کارێك نەکەم تەواو شێت دەبم. کەواتە خۆمم هانداو بەخۆم وت ئێستا (٥) شەو لەدەستپێکردنی هێرشەکە تێپەڕیوەومن هێشتا زیندوومو هەموو سەربازەکانی تریش هەروا. تەنیا دوو کەس بریندار بوون، ئەویش نەك بەهۆی بۆمبە ئەڵمانیەکانەوە، بەڵکو بەهۆی ئاگری تۆپخانەی دژە هەوایی خۆمانەوە. بڕیارم دا ترسان چۆڵ بکەم. بۆ بەرگریکردن لەخۆم لەبەرامبەری ئەم مەترسیەدا سەقفێکی

بچووکم بۆ خۆم دروست کرد. بەسەیرکردنی بەربڵاوی ناوچەکە بۆم دەرکەوت تەنیا ڕێگەی کوژرانی من ئەوەیە بۆمبێک یەکڕاست بکەوێتە ناوسەنگەرەکەم. ئەڵبەت ئەگەری ئەوەی بۆمبێک بکەوێتە ناو سەنگەرەکەم ئەویش لەم ناوچە بەربڵاوەدا، یەک لەبەرامبەری ده هەزاریشدا نەبوو. چەند شەوێک کەلەم ڕوانگەوە سەیری بابەتەکەم کرد نیگەرانیەکەم ڕەویەوە و تەنانەت لەکاتی هێرشیشدا توانیم بە ئاسوودویی بخەوم.

هێزی دەریاوانی لەکاتی شەڕدا بە سوود وەرگرتنی لەیاسای ئامارو ئەگەرەکان لەهەوڵی باشترکردنی ورەی مەلەوانەکاندا بوو. مەلەوانێکی ڕابردوو بۆی گێڕامەوە کاتێک ئەو و هاوڕێکانی نێردران بۆ گەشتێکی هەڵگری سووتەمەنی بەڕێژەی ئاگرکەوتنەوەی زۆرەوە، هەمووان تووشی ترس بوون چونکە دەیانزانی ئەگەر یەکێک لەتەنکەرەکان ساروخی بەرکەوێت، گەورەیی تەقینەوەکەی هەمووان دەکوژێت.

بەڵام هێزی دەریاوانی بابەتەکەی لەلایەنێکی ترەوە هەڵسەنگاند چونکە بەگوێرەی ئامار لەهەر (١٠٠) کەشتی هەڵگری سووتەمەنی کە کەوتبوونە بەر لێدانی ساروخ(٦٠) دانەیان بەسەر ئاوەوە مابوونەوەو لەناو چل دانەکەی تردا تەنیا(١٠) دانەیان لەکەمتر (١٠) خولەکدا نوقم ببوو. واتە کاتی تەواو بۆ دابەزینی سەربازەکان لەپاپۆڕەکە هەیەو زەرەرو زیانیش کەمە. ئایا ئەم شتە یارمەتی سەربازەکانیدا؟ ئەو دەڵێ: (( زانینی ئەم زانیارییانە نیگەرانی ئێمەی لەناو بردو هەموو مەلەوانەکان هەستیان بە ئاسوودەیی کرد چونکە دەمانزانی بەختێکی باشمان بۆ زیندوو مانەوە هەیەو پێدەچێت هیچ شتێک ڕوو نەدات)).

## یاسای سێهەم: بۆ تەرکی خووی نیگەرانیو ترس

وەرن سەیری ڕابردوو بکەین و پرسیار لەخۆمان بکەین بە سەرنج خستنەسەر ئامار ئەگەری ڕوودانی ئەو شتەی منی نیگەران کردووە چەندەیە؟

## بابەتی چوارەم

# ئەو شتەی بێ گەڕانەوەیە لەگەڵیدا بگونجێن

کاتێك منداڵ بووم ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێکانمدا لەژووری ژێر جەمەلۆنی عەمبارێکی کۆن و چۆڵی دارو تەختەدا یاریمان دەکرد. کاتێك لەژوورەکە دەهاتمە خوارەوە بۆ ساتێك قاچم نایە سەر پەنجەرەکەیی و کاتێك خۆم کۆکردەوە پەڕیمە خوارەوە. پەنجەی ئاماژەم ئەنگوستیلەیەکی تیابوو. بۆ نەگبەتی لەکاتی پەڕینـدا ئەنگوستیلەکەم لەبزمارێك گیری کردو پەنجەم هەڵکەندراو لێ بووەوە. هاوارم دەکردو دەترسام و پێموابوو بێ گومان دەمرم، بەڵام لەپاش ئەوە برینەکە چاك بووەوە تەنانەت بۆ چرکەیەکیش بیرم لەو شتە نەکردەوە.ئاخر سوودی ئەو هەموو ترس و نیگەرانیە چی بوو؟.....

لەوە بەدواوە بڕیارمدا لەگەڵ ئەو شتەی بێ گەڕانەوەیە بگونجێم.

ئێستا دەکرێ هەر بیریشی لێنەکەمەوە کەتەنیا چوار پەنجەی دەستی چەپم هەیە.

چەند ساڵ لەمەوبەر لەناوەندی شاری نیویۆرکدا لەگەڵ پیاوێکدا دیدارم کرد کەبەر پرسی ئاسانسواری (مەسعەدە) هەڵگرتنی باربوولەبینایەکدا. بۆم دەرکەوت دەستی چەپی ئەو لەمەچەکەوە کۆڵە. پرسیارم لێکرد ئایا ئەم کەم ئەندامیە دەبێتە هۆی ئازارو نارەحەتی ئەو؟ وەڵامی دایەوە: (( نا، زۆر کەم بیری لێدەکەمەوە. من زگوردیم و تەنیا کاتێك ئەمەوێ دەرزی پێوەکەم بیری ئەم کەم ئەندامیەم دەکەوێتەوە!))

سەرسووڕهێنەرە کە ئێمە بەچ خێراییەك دەتوانین هەر بارو دۆخێك وەربگرین و خۆمان لەگەڵیدا بگونجێنین و فەرامۆشی بکەین، ئەگەر ناچاربین بەم کارە. زۆر جار بیر لەنووسراوی سەر کڵێسایەکی پەڕپووتی کەلاوە لەهۆڵەندا دەکەمەوە کە دەڵێت:

(( ئاوایەو ناتوانێ جۆرێکی تر بێت)). هەرچی تەمەنی من و ئێوە دەچێتە سەرەوە نارێکی زیاتر لەژیاندا دەبینین.نارەوایی گەلێك کە (( ئاوان ))و شیاوی گۆڕان نین.

هەڵبژاردن لەدەستی خۆماندایە، هەم دەتوانین ئەم شتە قبووڵ کەین و خۆمان لەگەڵیدا بگونجێنین و هەم ژیانمان بکەین بە دۆزەخ، یاخی و سەرکەش بین و لەکۆتاییدا دەروونیشمان پڕ ڕەنج و نەخۆش کەین.

سەرنج بدەنە پەندی فەیلەسوفی خۆشەویستی من ولیام جیمز: (( ئارەزوومەندی وەرگرتنی ئەو شتەبن کەلەگۆڕدایە، وەرگرتنی ئەو شتەی ڕوویداوە یەکەم هەنگاوە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئاکامەکانی هەر بەڵاو بەسەر هاتێکی ناخۆش)). ئەلیزا بێت کاللی خەڵکی پۆرتلەند ئۆرگۆن لەپاش سەختی گەلێکی فراوان بەم ڕاستییەی زانیوە.گوێ لەو نامەیە بگرن کە بەم زووانە بۆمنی ناردوە:

(( هەر ئەو ڕۆژەی هەموو ئەمریکا جەژنی سەرکەوتنی هێزە چەکدارەکانی لەئەفریقیای باشوور گرتبوو، لەلایەن سوپاوە تەلەگرافێکم وەرگرت کە دەیوت برازاکەم کەلەهەموو کەسێك زیاترم خۆش دەویست نادیارە. دوای ماوەیەك تەلەگرافێکی تر هەواڵی مەرگی ئەوی پێدام)).

خەم و پەژارە منی لەپێ خستبوو. تائەو کاتە بیرم دەکردەوە ژیان لەگەڵ مندا میهرەبانە. کارێکی باشم هەبوو، لەپەروەردەکردنی برازاکەمدا یارمەتیدەر بووم. ئەو بۆمن سومبولی تەواوی تایبەتمەندییە باشەکان لەپیاوێکی گەنجدا. هەستم دەکرد وەڵامی تەواوی ئەو چاکانەی دابووم بەدەم ئاوەوە ئێستا وەرمگرتووە!..... بەگەیشتنی ئەم تەلەگرافە تەواوی خوورییەکانم بووەوە بەپێس. ژیان بۆمن مانای لەدەستدابوو، عەبووس ببووم و نەفرەتم لە هەموو شتێك دەکرد، لەدۆست و هاوڕێکانم دوور کەوتبوومەوە و دەستم لەهەموو شتێك شۆردبوو. ئاخر بۆچی دەبێ برازا خۆشەویستەکەم لەمن بسەنرێتەوە؟ خەم و کەسەر ئەوەندە بەسەر مندا زاڵ ببوو کە بڕیارمدا واز لەکارەکەم بێنم و خۆم لەسووچێکدا لەناو فرمێسك و خەمدا بشارمەوە.

خەریك بووم مێزی کارەکەمم بەتاڵ دەکرد کەچاوم بەنامەیەکی لەبیر کراو کەوت. ئەم نامەیە لەلایەن برازاکەمەوە بۆم هاتبوو کاتێك چەند ساڵ لەمەوبەر دایکم مردبوو. لەم نامەدا ئەمە نووسرابوو:

(( ئەڵبەت هەموومان و بەتایبەت تۆ لەدووری و نەبوونی ئەو ڕەنج دەکێشن، بەڵام دەزانم تۆ لەگەڵ ئەم پێشهاتەدا خۆت دەگونجێنیت. فەلسەفەی تۆ لەژیاندا بۆ ئەم کارە یارمەتیت ئەدا. هەرگیز ئەو ڕاستیە جوانانە لەبیر ناکەم کە فێری منت کرد.لەهەر کوێ

بەو هەرچەندە لێت دووربم بەردەوام لەیادمە تۆ فێری منت کرد پێبکەنم و وەکو پیاوێکی ڕاستەقینە هەر پێشهاتێك وەربگرم)).

چەندەها جار ئەم نامەم خوێندەوە.وەکو ئەوە وابوو برازاکەم لەپەنامدا دانیشتبێت و بەمن بڵێت:

(( بۆچی خۆت کار بەو شتەناکەی کە فێری منت کرد؟ هەر شتێك ڕوو بدات تۆ درێژە بەژیانت بدە. خەمەکانی خۆت لەژێر بزەیەکدا دابشارەو درێژە بەژیان بدە)).

بەم جۆرە گەڕامەوە بۆ کارەکەم.چیتر ڕوو ترش و هەڵپن نەبووم. بەردەوام بە خۆمم دەوت کارێکەو بووە، ناتوانم بیگۆڕم، بەڵام هەروا کە ئەو دەیەوێت دەتوانم لەگەڵ ژیاندا خۆم بگونجێنم. هەموو وزەو توانام بۆ کارەکەم خستە گەڕ. نامەم بۆ سەربازان، ڕۆڵەی کەسانی تر دەنارد دوانیوەڕۆیان دەچووم بۆ وانەی پەروەردەی گەورەتەمەنان و هەوڵم ئەدا ئارەزوومەندی و هاوڕێیانی نوێ پەیدا بکەم. چیتر ماتەمینی ڕابردووی بەسەر چووم ناوەتە لاوە ژیانێکی ئاسوودەییم دەستپێکردووە کە برازاکەم چاوەڕێی دەکرد لەمن. لەگەڵ ژیاندا ئاشت بوومەتەوەو چارە نووسم وەرگرتووە. ئێستا ژیانم لەهەموو کاتێك کامڵترو بەپیتترە.

ئەلیزا بێت کانلی ئەوشتەی یەك بەیەکی ئێمە دەبێ درەنگ و زوو فێری ببین بەدەستی هێناوە.واتە دەبێ ئەو شتەی ناچارییە وەربیگرین و لەگەڵیدا بگونجێین.(( ئەمەیەو ناتوانین بیگۆڕین )).

ئەڵبەت ئەم دەرسە ئەوەندە ئاسان و سادە نیە. تەنانەت پادشایانی سەرتەختی دەسەلاتیش دەبێ بەردەوام ئەم شتە بیری خۆیان بێننەوە. کۆچکردووە جۆرجی پێنجەم ئەم وسانەی لەسەر دیواری کتێبخانەکەی لەکۆشکی باکینگهام هەڵواسیبوو:(( لەبیرم بێ نە ئاوی ڕۆیشتوو دەگەڕێتەوە ناو جۆگەو نەدەکرێ ئەستێرەکان کۆبکەینەوە)).هەر ئەم وتەیە بەمجۆرە لەلایەن شۆپنهاوەر فەیلەسوفی بەناوبانگەوە وتراوە: (( گرنگترین شت بۆ توێشووی سەفەر ژیان و ئەندازەیەکی زۆر ڕەزامەندییە)).

ئاشکرایە کەهەل و مەرج بەتەنیا نابنە هۆی کامەرانی یان ناشادیی ئێمە، بەڵکو شێوەی کاردانەوەی ئێمە بەنیسبەتی هەل و مەرجە جۆراو جۆرەکانەوەیە کە

هەستەکانی ئێمە دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە. عیسا دەڵێت بەهەشت لەدەروونی ئینساندایە. دەشێ بڵێین دۆزەخیش هەروەها.

ئەگەر ناچاربین دەبێ بەڵاو بەسەرهاتو ناڕێکییو ناڕەواییەکان بنێینە ژێر پێ. لەوانەیە بیر بکەینەوە توانای ئەم کارەمان نیە، بەڵام لەکۆتایی سەرسوڕماندا هێز گەلێکی گەورەتر لەدەروونی ئێمەدا هەیە کە ئەگەر ئەوانە بگرینە بەر لەم کارەدا سەرکەوتوو دەبین. کۆچکردوو بۆس تارکینگتۆن هەمیشە دەڵێت: (( هەر بەڵایەك ژیان بەسەرم بێنێت دەتوانم تەحەممولی بکەم بێجگە لەیەك شتو ئەویش کوێرییە)). ڕۆژێك شەستو چەند ساڵ تەمەنی بوو، سەیرێکی عەرزی کرد بەڵام چاوی تار بوو، نەیتوانی گوڵی فەرشەکە ببینێت.چوو بۆلای پزیشکی پسپۆڕو بەو ڕاستیە تاڵەی زانی، خەریك بوو بینایی لەدەست ئەدا.

چاوێکی بەتەواوی کوێر بووبوو، چاوەکەی تریشی دوای ماوەیەکی کەم دەکەوتە ئەو حاڵەوە. بەسەری هات ئەو شتەی لێی دەترسا هاتە دی.

ئەو چۆن بەرەوڕووی ئەم خراپترین بەڵایە بووەوە؟ ئایا ژیانی بە تەواوبوو فەرز کرد؟ نا، ئەو شتەی جێی سەرسووڕمان بوو ئەوە بوو کە هەستێکی خۆشی هەبوو. تەنانەت ببوە کەسێکی گاڵتە چیش. ئایا چارەنووس دەتوانێ وەها ورەیەك لەپێ بخات؟ وەڵام ئەمەیە کە نەتوانیو نەدەشتوانێت. کاتێك ئەو تەواو کوێر بوو بە خۆی وت: (( تێگەیشتم کە مرۆڤ دەتوانێ کوێر بوونیش وەکو هەر شتێکی تر وەربگرێت. تەنانەت ئەگەر هەر پێنج هەستەکەم لەدەست بدەم، دەزانم دەتوانم لەمێشکی خۆمدا ژیان بکەم، چونکە زانراو یان نەزانراو ئێمە لەمێشکماندا شت دەبینینو ژیان دەکەین)).

ئەو بۆ چاکبوو نەوەی بینایی لەماوەی یەك ساڵدا نزیکی (١٢) نەشتەرگەری بە بەنجی شوێنەکە ئەنجامدا. بەڵام ئەم شتە بووە هۆی ڕوو گرژی ئەو؟ نا، ئەو دەیزانی ناچارە بەم کارەو تەنیا ڕێگەیەك بۆ کەم کردنەوەی ڕەنج بوونی هەیە، خۆڕاگرییەتی بە هێمنیو ئارامی. ئەو بە خەواندن لەژووری تایبەتدا ڕازی نەبوو، لەبەشی گشتی نەخۆشخانە خەواندیان، چونکە دەیویست لەگەڵ کەسانێکدا بێت کەدەردو ڕەنجیان هەیە. هەوڵی ئەدا سەرشادیان بکاتو کاتێك ناچار بوو نەشتەرگەری چەند جارەی بۆ بکرێت سەرەڕای ئەوەی دەیزانی

چی بەسەر چاوی دێت دەیوت: (( چەندە باشە کە دەکرێ نەشتەرگەری لەسەر دڵی ئاسکی وەك چاوی ئینسان بکرێت)).

مرۆڤێکی ئاسایی لەم بارو دۆخەدا تووشی بێزاریو کێشەی دەروونی دەبوو بەڵام ئەو دەیوت:

(( ئەم ئەزموونە لەگەڵ هیچ شتێکی جوانتر ناگۆڕێتەوە )). ئەم ڕووداوە وەرگرتنو خۆگونجانی فێری ئەو کرد. ئەوەی کە هیچ نارەوایيەك لەسەرووی خۆڕاگریی مرۆڤەوە نیە. هەروا کە شاعیری بەناو بانگ جان میلتۆن وتوویەتی: (( کوێری بەدبەختی نیە. بەدبەختی لەوەدایە نەتوانی بەرگەی بگریت)).

مارگرێت فولەر هەمیشە دەیوت: (( من جیهانم وەرگرتووە)). ئێمەیش باشتر وایە ئەو شتەی شیاوی گۆڕان نیە بەوتەی شاعیری پڕ هەراو هۆریا تۆماس کارلایل بەڕووی کراوەوە وەربگرین.

ئەگەر لەبەرامبەری کێشەو ناڕێکیەکاندا ملهوڕی بکەینو ژیان لەخۆمان تاڵ کەین، نەك هەر کێشەکانمان نەگۆڕیوە بەڵکو خۆمان خستووەتە دۆخێکی خراپترەوە. ئەمە لەڕووی تەجرەبەوە دەڵێم. جارێك لەقبووڵ کردنی بارودۆخێکی نەگۆڕم قەبووڵ نەکرد. خۆمدا لەنەزانیو سەر کەشیم کرد. لەکۆتاییدا لەپاش یەك ساڵ ئەشکەنجەدانی خۆم بینیم ناچارم بە وەرگرتنی شتێك کە لەسەرەتاوە دەمزانی بێ لادانەو نەگۆڕە. دەبوا چەند ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ واڵت ویتمەن هاودەنگ بوومایە کە: (( لەگەڵ شەو، لەگەڵ تۆفان، برسیەتی، گاڵتە پێکردن، پێکانو سووکایەتی، بەو جۆرەی درەختەکانو ئاژەڵەکان بەرەو ڕووی دەبنەوە، هەڵسو کەوت بکەم)).

من (١٢) ساڵ لەگەڵ ئاژەڵاندا کارم کردو هەرگیز نەمبینی مانگایەك لەبەر ئەوەی لەوەڕگاکان لەبەر بێ بارانی وشك بوون یان سەهۆڵیان بەستووە، تووڕە ببێتو خۆی کەر کات. ئاژەڵان بە خوێنساردی ڕوو بەڕووی کێشەکان دەبنەوەو هەر لەبەر ئەوەیە هەرگیز کێشەی عەسەبی یان برینی گەدەیان نییەو شێت نابن.

من نالێم دەبێ تەسلیمی هەر پێشهاتێك ببین. من هەرگیز پشت گیری جەبر گەرایی ناکەم. تەنانەت ئەگەر یەك شانسیش بۆ گۆڕینی هەلو مەرجەکە ببێ دەبێ شەڕ بکەین. بەڵام کاتێك عەقڵی سەلیم پێمان دەڵێ لەهەلو مەرجێکی نەگۆڕداین دەبێ بەناوی عەقڵانیەتەوە وەریبگرینو بۆ ئەو شتەی بوونی نیە خەم نەخۆین.

سەرۆکی کۆچکردووی زانکۆی کۆلۆمبیا جارێك بەمنی وت شیعرێکی نارچەیی وەکو یەکێك لەدروشمەکانی ژیانی هەڵبژاردووە:

بۆ هەر دەردێك لەدنیادا چارەسەرێك هەیە یان نا

ئەگەر چارەسەری هەیە بیدۆزەرەوە، ئەگەر نیە لەبیری کە.

بۆ نووسینی ئەم کتێبە دیدارم لەگەڵ زۆرێك لەبازرگانانی ئەمریکا کردو بۆم دەرکەوت زۆربەی ئەوانە لەگەڵ کێشە ناچاریو ئەگۆڕەکاندا خۆیان دەگونجێنن، چونکە ئەگەر وانەبێ لەژێر فشاردا تێك دەشکێن.

سەبارەت بەمە چەند نموونەیەك بخوێننەوە:

جی سی پەنی دامەزرێنەری فرۆشگا زنجیرەییەکانی پەنی بەمنی وت:

(( ئەگەر تا دوایین دۆلارێك کە هەمە لەدەستی بدەم خۆم نیگەرانو بێتاقەت ناکەم، چونکە ئەو شتەی بە ترسو نیگەرانی بە دەست بێت بڕوام پێ نیە. من باشترین کار دەکەمو ئەنجامەکەی دەسپێرم بە دەستی خودا)).

هانری فۆردیش هەر ئەم شتەی وت: (( کاتێك ناتوانم کێشەکان چارەسەرکەم لێیان ئەگەڕێم خۆیان چارەسەربن)). کاتێك پرسیارم لەکیتی کلێر بەڕێوەبەری کۆمپانیای کرایسلەر کرد کە چۆن بەسەر نیگەرانیدا زاڵ دەبێ وتی: (( کاتێك ڕوو بەڕووی ئاستەنگێك دەبمەوە ئەگەر بتوانم چارە سەری ئەکەمو ئەگەر نەتوانم فەرامۆشی ئەکەم. هەرگیز نیگەرانی داهاتوو نیم چونکە کەس نازانێت چ ڕووداو گەلێك لەداهاتوودا ڕوونەدات.هیچ کەس هەواڵی لەوانە نیە، کەواتە بۆچی دەبێ نیگەرانی ئەوانە بین؟)) ئەگەر بەو بڵێین فەیلە سووفە سەری لێدەشێوێت. ئەو بازرگانێکی باشەو دەستی گەیشتووەتە هەر ئەو شتەی ئۆپیکتە تۆس (١٩) سەدە لەمەوبەر فێری ڕۆمیەکانی کرد: (( تەنیا یەك ڕێگە بۆ کامەرانی بوونی هەیە. نیگەرانی بەنیسبەتی ئەو شتەی گەورەترە لەئیرادەتان وازی لێبێنن)).

سارا بێرنارد نموونەیەکی زۆر باشە لەژنێك کەتوانی لەگەڵ چارەنووسدا هاو هەنگاو بێت. ئەو بۆ ماوەی نیو سەدە لەتەواوی جیهاندا باشترین ئەکتەری شانۆ بوو. کاتێك تەمەنی (٧١) ساڵ بوو هەموو سەرمایەکەی لەدەستدابوو، پزیشکەکەی پێی وتبوو دەبێ قاچێکی ببڕنەوە. کاتێك لەسەر زەریای ئەتلەس بەسەر پاپۆڕەکەوە تێدەپەڕی بەهۆی تۆفانەوە درابوو بە زەویداو بە سەختی قاچی پێکرابوو. بەهۆی ئەم

زیانەوە قاچی لەشێوەی خۆی دەرچوو، ئەوەندە ئازاری هەبوو کەدەبوا ببڕایەتەوە. پزیشکەکە لەوەی ئەم هەواڵە بدات بەسارای تووڕەو هەڵچوو، دەترسا. کەم و زۆر ئەم دڵنیابوو بەبیستنی ئەم هەواڵە سارا دووچاری هێرشی نەخۆشی هیستریك دەبێت، بەڵام وانەبوو. سارا بۆ ساتێك سەیری کردو وتی: (( ئەڵبەت چارەیەك نیە)). چارەنووس ئەمە بووە.

کاتێك ئەویان دەبردە ژووری نەشتەرگەری بە دەنگێکی شاد بەکوڕەکەی کەدەگریا وتی:

(( لەشوێنی خۆت مەجووڵێ. زوو ئەگەڕێمەوە )). تا ژووری نەشتەرگەریەکە بەشێکی شانۆنامەیەکی دەخوێندەوە. پرسیاریان لەو کرد ئایا ئەم کارە دەکات بۆ ئەوەی خۆی شاد بکات؟ ئەو وتی:

(( نا، ئەم کارە بۆ پزیشکەکان و سیستەرەکان دەکەم چونکە نەشتەرگەرییەکی سەختیان لەبەرە)). لەپاش چاك بوونەوە گەشتی کرد بۆ دەوری دنیا و بینەرێکی زۆری بۆ ماوەی (٧)ساڵ کردە میوانی شادی.

ئەلسی مەك کورمیك لەوتارێکیدا لەگۆڤاری ریدەرز دایجۆست دەنووسێت: (( ئەگەر شەڕکردن لەگەڵ ئەو شتە ناچاری و بێ لادانە بەردەین، وزەیەك ئازاد دەکەین کە دەتوانین بۆ دروستکردنی ژیانێکی بەپیتتر سوودی لێوەربگرین)). هیچ کەس ئەوەندە توانای نیە لەگەڵ پێشهاتە ناچاری و بێ گەڕانەوەکان بجەنگێت و ئەگەر جەنگا، هێزێکی بۆ دروستکردنی ژیانی نوێ نابێت. دەبێ یەکیان هەڵبژێریت. یان بەتۆفانە بێ چارەسەرەکانی ژیان بنووشتێینەوە یان بەسەختی بوەستین و بشکێین.

ئەم شتەی لەکێڵگەی میسۆریدا بەڕوونی بینی. ژمارەیەك درەختم لەویادا چاند، گەورەبوونیان سەرەتا زۆر خێرا و سەرسوڕهێنەر بوو، بەڵام بەبارینی قورسی بەفرو باران تەواوی پەلەکانی بەستیان. لەجیاتی ئەوەی لەژێر ئەم بارەدا بنوشتێنەوە خۆڕاگرییان کردو شکان. ئەم دارانە هێشتا تەجرەبەی دارستانەکانی باکووریان نەبوو. من چەندەها میل لەناو دارستانە هەمیشە سەر سەوزەکانی کەنەدا گەڕام و هەرگیز درەختێکی سنەوبەر یان کاجم نەبینیوە لەژێر بەفرو باراندا شکابێت. ئەم درەختانە دەزانن چۆن لەژێر باردا دامرکێن و پەل و پۆکانیان دابەزێنن و لەگەڵ بارو دۆخی نەگۆڕدا خۆیان بگونجێنن. مامۆستاکانی وەرزشی بەرگری جوجیتۆ فێری

شاگردەکانیان دەکەن کە: (( وەکو داربی بلووشتێرەوە، وەکو بەرەی تۆقیند ڕامەرێسکە )). تا ئێستا بیرتان کردۆتەوە تایەکانی ئۆتۆمبیلەکەتان چۆن لەجادەکاندا لەژێر ئەو هەموو بارەدا بەردەوام دەبن؟ سەرەتا داوایان لەبەرهەم هێنەرانی تایە کرد تایەیەک دروست بکەن لەبەرامبەری لێدانەکانی جادەدا خۆڕاگری بکەن. ئەم تایە هەر زوو لەتوپەت بوو. پاشان تایەیەکیان دروست کرد کە ئەم لێدانانە بگرێت و ئەمەیان باش بوو. ئێمەیش ئەگەر فێرببین چۆن ناڕێکییەکانی ڕێگەی ژیان بەنەرمی وەربگرین ئاسوودەتر ڕێگەکە دەپێوین.

لەکاتی شەڕدا ملیۆنەها سەربازی نیگەران ناچار بوون یان لەژێر فشاردا خۆیان ڕابێت یان خۆڕاگری بکەن و تێک بشکێن. بۆ نموونە گوێ بۆ ئەم داستانە بگرن کە ویلیام ئیچ کاسلێوس لەیەکێک لەوانەکانی پەروەردەی گەورەتەمەنەکاندا گێڕایەوە:

((ماوەیەک دوای ئەوەی چوومە ناو گاردی بەندەر، نێردرام بۆ یەکێک لە گەرمترین شوێنەکانی لەو پەڕی زەریای ئەتڵەسیەوە و بوومە بەرپرسی مەوادی تەقەمەنی. بیر بکەنەوە، فرۆشیارێکی دەمە قاچان ببێتە بەرپرسیاری مەوادی تەقینەوە و تەقەمەنی. تەنانەت بیری وەستانی لەسەر چەندین تەن tnt (تی ئێن تی) و تەقینەوەی تر کیفایەتە هەتا مۆخی ئێسکی فرۆشیارێکی دەمەقاچان لەترسدا بلەرزێنێت. تەنیا دوو ڕۆژ پەروەردەم بینیبوو، ئەم پەروەردەیە ترسی منی زیاتر کردبوو. هەرگیز یەکەم ئەرکداریم فەرامۆش ناکەم. دەبوایە لەعەمباری ژمارە (٥)ی پاپۆڕێکدا لەگەڵ (٥) کەسی تردا کارم بکردایە. ئەوان کەسانێکی بەهێز بوون، بەڵام هیچیان دەربارەی مەوادی تەقینەوە نەدەزانی. کارەکەمان بارکردنی tnt بوو. ئەوان سندووقی گەورەی tnt یان بەشریتێکی بەرزکەرەوە کە هەرکامیان یەک تەنی تیابوو باردەکرد. هەرکام لەو سندووقانە کیفایەت بوو هەتا پاپۆڕەکە لەت و پەت بکات. لەترسی ئەوەی نەکاو یەکێک لەشریتەکان دەربچێت یان بپچڕێت دەمم وشک ببوو، دەست و قاچم دەلەرزین، بەڵام نەمدەتوانی ئەوێ بەجێبهێڵم، چونکە بەهەڵهاتن لەخزمەت و بۆ خۆم و بنەماڵەکەم حەیاچوون بوو، ئەگەری ئەوەیش هەبوو لەکاتی هەڵهاتنندا بکەومە بەر فیشەک. نەمەتوانی هەڵبێم، دەبوایە بمامایەتەوە و هەردەم لەوانەبوو کەشتیەکە بتەقێنێتەوە. سەیرێکی ئەوانی ترم کرد کەبێ دەربەستانە کاریان دەکرد. کاتژمێرێک تێپەڕی. کەمێک بەهرەم لەعەقڵی خۆم وەرگرت. بەخۆمم وت تاک و قەناعەت بکەم. وتم:



 

(( بگره بشتەقێتەوە. ئەگەر بتەقێتەوە چ جیاوازییەكی هەیە. خۆهەر بەخۆیشت نازانی؟ بگره ئاسانترین ڕێگەیە بۆ مردن. لەشێرپەنجە ئاسانترە. بەهەرحاڵ ناچاری ئەم كارە بكەیت ئەگەرنا فیشەك چاوەڕێتە. كەواتە باشتر وایە بەئارەزووەوە ئەنجامی بدەیت.

بەردەوام ئەم قسانەم دووپات دەكردەوە و بەرەبەرە هێور بوومەوە. سەرەنجام كاتێك خۆمم ناچار بە وەرگرتنی بارودۆخەكە كرد توانیم بەسەر ترسەكەمدا زاڵ بم. هەمیشە ئەم دەرسەم لەیادە. هەركاتێك ترس یان نیگەرانی دێتە گیانم شانێك هەڵدەتەكێنم و دەڵێم فەرامۆشی كە)). بێجگە لەخاچدرانی عیسای مسیح، ناو دارترین دیمەنی مەرگی مێژوو هی سوقراتە هەزاران سەدەی تریش خەڵك لەخوێندنەوەی گێڕانەوەی هەمیشەیی ئەفلاتوون لەو دیمەنە دەكەونە ژێركاریگەری.

هەندێك لەخەڵكانی بەخیل و حەسوودی ئەسینا كە چاوی بینینی سوقراتی پێ پەتیان نەبووە، چەند تۆمەتێكیان خستە پاڵ ئەو و ئەویان دادگایی كردو حوكمی مەرگیان بەسەردا سەپاند. كاتێك زیندانبانە ڕووخۆشەكە جامە ژەهرەكەی دابەو تاكو بینۆشێت وتی: (( هەوڵ بدە ئەو شتەی دەبێت ڕوودات بە ئارامی تەحەمولی بكە)). سوقرات مەرگی ئەوەندە ئارام و ڕەزامەندانە وەرگرت كەتا ئاسمان كەوتە ژێر كاریگەرییەوە:

(( هەوڵ بدە ئەو شتەی دەبێ ڕووبدات بەئارامی تەحەمولی كە )). ئەم وتەیە (٣٩٩) ساڵ پێش زایینی عیسا وترا، بەڵام مرۆڤ ئەمڕۆكە زیاتر لەهەركاتێكی تر پێویستی پێیەتی.

هەشت ساڵە هەر كتێب یان هەر بابەتێك كە پێوەندی هەرچەند كەمی بە لەناوبردنی نیگەرانییەوە هەیە دەیخوێنمەوە. حەزئەكەن بزانن باشترین پێشنیارێك لەناو تەواوی ئەو شتانەدا بەدەستم هێناوە چییە؟

باشە، ئەم وشانە ئەو وشانەن دەبێ بەسەر ئاوێنەی دەست شۆرەكەمانەوە هەڵیواسین تا هەركاتێك دەست و چرو چاومان شۆرد ترس و نیگەرانیشمان بشۆینەوە. دوكتۆر رینهۆڵد نایبۆهێر ئەم دوعایەی نووسیوە:

خودایە ئارامیم پێ ببەخشە

تا ئەو شتەی ناتوانم بیگۆڕم وەریبگرم.

شەهامەتم پێ عەتا بکە تا ئەو شتەی دەتوانم،بیگۆڕم
و تێگەیشتنێك کە بتوانم جیاوازی نێوان ئەم دوانە دیاری بکەم.

## یاسای چوارەم بۆ تەرکی خووی نیگەرانیو ترس:

خۆگونجاندن لەگەڵ ڕووداوە ناچاری و نەگۆڕەکان.

بابەتی پێنجەم

## بۆ دڵنیگەرانیەکانتان یاسای بڕینی زەرەرو زیان دابنێن

ئایا پێتان خۆشە بزانن واڵ ستریت چۆن دەوڵەمەند بوو؟ ملیۆنەها کەس ئەم ئاواتەیان هەیەو بێگومان ئەگەر من وەڵامی ئەم پرسیارەم بزانیایە هەر بەرگێك لەم کتێبەم بەدەیان هەزار دۆلار دەفرۆشرا. بەڵام فیکرێکی باش هەیە کە زۆرێك لەبازرگانان توانیویانە سوودی لێوەربگرن. گوێ لەم داستانە بگرن کە لەلایەن ڕاوێژکارێکی سەرمایە گوزارییەوە بۆم هاتووە:

(( من بەبیست هەزار دۆلارەوە کە هاوڕێیانم بۆ سەرمایەگوزاری لەبازاڕی بورسدا بەمنیان دابوو، لەتەکساسەوە هاتم بۆ نیۆیۆرك. بیرم دەکردەوە شێوەو فرتو فێڵی کارەکە دەزانم بەڵام تادوا دۆلارم لەدەست بووەوە. ئەڵبەت لەهەندێك موعامەلەدا سوودم کرد بەڵام لەکۆتاییدا هەموو شتێم لەدەست چوو)).

لەوەی پارەی خۆمم لەدەست دابوو ناڕەحەت نەبووم، بەڵام دۆڕاندنی پارەی هاوڕێکانم کە ئەڵبەت بەئاسانی دەرەقەتی ئەو پارانە دەهاتن ئازاری ئەدام. لەکاردانەوەی ئەوان دەترسام بەڵام ئەو شتەمایەی تێڕامانی من بوو ئەوان نەك هەر زۆر بەماریفەت بەڵکو بەشێوەیەکی سەیر گەشبین بوون.

دەمزانی ڕەوشی من لەسەرمایە گوزاری بازاڕی بورسدا ئەڵڵا بەختەکیەو لەسەر بنەمای شانس و فیکری کەسانی ترە. سەبارەت بەهەڵەکانم بیرم دەکردەوەو بڕیارمدا پێش لەوەی بگەڕێمەوە بۆ ناو بازاڕی بورس هەڵەکەم بدۆزمەوە. پرس و جۆم کردو لەگەڵ یەکێك لەسەرکەوتووترین کەسانی بازاڕی بورسدا ئاشنا بووم.ئەو بەوە بەناو بانگ بوو کەهەر ساڵ لەساڵی پار سەرکەوتووترەو بۆم دەرکەوت ئەم سەرکەوتنە ناتوانێ تەنیا سەمەرەی بەخت و شانس بێت.

ئەو دەربارەی شێوەی موعامەلاتەکەم پرسیاری لێکردمو پاشان ئەو شتەی بەبڕوای ئەو گرنگترین بنەماو یاسابوو لەموعامەلەدا بۆی باس کردم: (( من لەموعامەلەکانمدا سوود لە یاسای بڕینی زیان وەردەگرم. بۆ نموونە ئەگەر بەشێك بە نرخی هەر دانەی (٥٠) دۆلار بکڕم بۆ (٤٥) دۆلار یاسای بڕینی زیان دادەنێم. واتە ئەگەر بەشەکە پێنج یەکە لەنرخی سەرەکی خۆی دابەزی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیك دەفرۆشرێت تاکو زیانەکە لە(٥)یەکەدا بوەستێت.

ئەگەر لەسەرەتاوە عاقڵانە دەست بەکاربیت بەشێوەی مامناوەندی سوودی ئێوە ١٠٪ یان٢٥٪ یان تەنانەت ٥٠٪ دەبێت،بەمجۆرە ئەگەر تەنانەت لەم یاسایەشدا هەڵەت کردبێت بەشێوەی مامناوەندی داهاتێکی باشت دەست دەکەوێت. منیش زوو سوودم لەم ڕەوشە وەرگرت. ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی کەهەم منو هەم ئەوانەی دەهاتن بۆلام پارەیەکی زۆرمان لەمەترسی ڕزگار کرد.

لەدواییدا بەمێشکمدا هات دەتوانم لەم یاسایە سوودی تریش وەربگرم. بۆ نموونە لەباسی بورسو پارە زیاتر دەربارەی نیگەرانیەکانم سوودم لەم یاسایە وەرگرت. هەر بێتاقەتیو تووڕەییەکم بۆ دروست ببوایە دەمخستە ناو ئەم یاسایەو ئاکامەکەی سەرسوور هێنەر بوو. بۆ نموونە زۆر بەی کات لەگەڵ هاوڕێیەکدا وادەی دیدارم دادەنا بۆ خواردنی نیوەڕۆو ئەو هەمیشە درەنگ دەهاتو نیوەی کاتی نان خواردنی من لەچاوەڕوانی ئەودا بە فیڕۆ دەڕۆیشت. ڕۆژێك دەربارەی یاسای بڕینی زیان کەبۆ نیگەرانیەکانم بەکارم دەبرد قسەم بۆ کردو پێم وت:

(( بیل، کاتی دیاری کراوی ئەو زیانەی بۆ چاوەڕوانی تۆ دامناوە (١٠) خولەکە. واتە ئەگەر لە(١٠) خولەك درەنگتر بێیت وادەکە بە تێکچوو حساب دەکەمو دەڕۆم)).

خودایا! خودایە خۆزگە چەند ساڵ لەمەوبەر ئەمەم بزانیایەو بۆ کێشە مێشکیو هەستیەکانم بۆ نموونە بێ سەبری، تووڕەیی، خۆخەڵەتاندنو پەشیمانی سوودم لەم یاسایە وەربگرتایە. بۆچی چەند ساڵ لەمەوبەر ئەم تێگەیشتنەم نەبوو کەکێشەکانم هەڵبسەنگێنمو بەخۆم بڵێم: (( سەیرکە دیل، ئەم کێشەیە تەنیا ئەوەندە زەحمەت دەهێنێت نەك زیاتر!))

ئەڵبەت دەبێ لەبەر ئەوەی یەکجار توانیم ئەم عەقڵە بگرمەکار سوپاسی خۆم بکەم. ئەو بارو دۆخە قەیراناویو جیدی بوو. کاتێك تەواوی ئاواتەکانم، خەونەکانمو

بەرنامەکانم لەپێش چاومدا لەناو چوو. کاتێک سی ساڵ بووم بڕیارمدا تەواوی ژیانم تەرخانی نووسین بکەم. دەمویست ببمە چاک لەندەن، تۆماس هاردی یان فرانک نۆریسی دووەم.

بۆ ئەم کارە دوو ساڵ لەئەورووپا ژیام چونکە دەمتوانی بەدۆلاری ئەمریکا لەوێ ژیانێکی هەرزانترم هەبێت. لەوێ شاکارەکەمم نووسی و ناوم نا(( بۆران)). لەو دەورانەداکە لەپاش شەڕی دووەم بوو ئەم ناوە زۆر ئاسایی دەهاتە پێش چاو و چاپخانەکانیش هەربەو ساردییەی ناوەکەی پێشوازییان لێکرد. کاتێک ڕاوێژکاری ئەدەبیم وتی شاکارەکەم بە کەڵک نایەت و من توانا و مێشکی نووسینی ڕۆمانم نیە، نزیک بوو دڵم بووەستێت.

بەسەرە گێژییەوە لەنووسینگەکەی هاتمە دەر. ئەگەر بەچەکوش لەسەری بدامایە ئەوەندە گێژ نەدەبووم. هەستی بێ عەقڵیم دەکردو بۆم دەرکەوت لەچوار ڕێیانی ژیاندا وەستاوم و دەبێ بڕیارێکی گەورە بدەم. دەبێ چی بکەم؟ چەندەها حەفتەی پێ چوو تالەو گێژییە نەجاتم بوو. لەو دەورانەدا هیچم دەربارەی یاسای بڕینی زیان نەدەزانی، بەڵام ئێستا کەسەیری ڕابردوو ئەکەم دەبینم ئەم کارەم ئەنجام داوە. لەسەر ڕۆمانەکەم لە سەمەرەی دوو ساڵ زەحمەت و عارەق ڕشتنم بوو نووسیم (( تاقیکردنەوەیەکی باش ))، چونکە ئەم دووساڵە تەنیا ئەوەندە نرخی بۆ من هەبوو. پاشان گەڕامەوە بۆ کارە پێشووەکەم واتە ڕێک خستن و وانە وتنەوەی پەروەردەی گەورە تەمەنان و لەکاتی بێکاریمدا ژیاننامە و کتێبی غەیری داستانیم نووسی.

ئایا لەم بڕیارەم ڕازیم؟ بەڵێ! ئەوەندە ڕازیم کە کاتێک بیری لێدەکەمەوە دەمەوێ لەخۆشیدا لەو سەرجادانە سەما بکەم. بڕوا بکەن لەو کاتەوە تەنانەت بۆ ساتێک لەوەی نەبووم بەتۆماس هاردی دووەم هەستم بەپەشیمانی نەکردووە.

یەک سەدە لەمەوبەر کاتێک کوندە پەپوویەک لەداستانەکانی کەناراوی ناوچەی والدەن پاند بانگی هەڵدابوو هانری سۆرۆ قەڵەمی پەڕە مراوی خۆی کردبوو بەجەوهەرە دەستسازەکەیداو لەدەفتەری بیرەوەرییەکانیدا نووسی: (( بەهای هەرشتێک، کەمێک لەو شتەیە کەمن ناوی دەنێم ژیان کەدەبێ خێرا بەڕابوونی زمان لەگەڵیدا جێگۆڕکێ بکرێت )). بەوتەیەکی تر کاتێک بەش زیاتر ئەدەین بەشتێک کەدەبێ لەژیانی ئێمەدا بەشی ببێت لەوپەڕی کەریەتیداین:

بەڵام بەداخەوە ئەمە کوت‌ومت هەرئەو کارەیە کەدوو مۆسیقاری گەورە بەناوەکانی گیلبێرت‌و سالیوان کردیان. ئەوان دەیانزانی چۆن دەبێ کەلامی شادو مۆسیقای شادیهێنەر دروست بکەن، بەڵام دەربارەی دروستکردنی شادیو بەدەستەوە گرتنی ژیان لەژیانی خۆیاندا زۆر کەمیان دەزانی. ئەم دوو کەسە ژمارەیەك لەباشترین ئۆپێرا نارامەکان کەتا ئێستا جیهانیان گوێیان لێبووە بۆ نموونە سەبر، پێشبەندو میکادویان دروست کردووە، بەڵام نەیانتوانی بەسەر دەروونی خۆیاندا زاڵ بن. ئەوان ژیانی خۆیان لەسەر شتێك کەزیاتر لەنرخی فەرشێك نەبوو، تاڵ کرد. سالیوان بۆ ئەو هۆڵە شانۆییە تازەی کڕیبووی فەرشێکی کڕیبوو. بەبینینی فاکتۆرەکە مێشکی گیلبێرت جام بوو، شتەکە گەیەنرایە دادگا. چیتر ئەوان هەرگیز پێکەوە قسەیان نەکرد. کاتێك سالیوان شیعرێکی دەنووسی پۆستی دەکرد بۆ گیلبێرت‌و گیلبێرت شیعرەکەی دەکرد بە ئاهەنگ‌و بۆی نارد. ئەوان ئاگایان لەوە نەبوو دەبێ سنوورێك بۆ نەفرەتیان دابنێن. کاتێك کە لینکۆڵن توانی ئەنجامی بدات.

لەکاتی شەڕە ناوخۆییەکانی ئەمریکادا جارێك دۆستانی لینکۆڵن سەرگەرمی ڕەخنەگرتن لەدوژمنانی ئەو بوون. لینکۆڵن بەوانی وت: (( نەفرەت لەدەروونی ئێوەدا زیاتر لەمنە. لەوانەیە ڕادەی نەفرەت لەدەروونی مندا زۆر کەم بێت بەڵام هەرگیز بیرم نەکردۆتەوە نەفرەت سوودێکی هەبێت. ژیان ئەوەندە درێژ نیە کەنیوەی لەدەمەدەمێدا بەسەر بچێت. ئەگەر کەسێك دەست لەهێرش کردن هەڵگرێت من ڕابردووی ئەو لەبیردەکەم )). ئاواتم ئەوە بوو یەکێك لەپوورەکانی من بەناوی پوورە ئەدیت وەکو لینکۆڵن ڕۆحی بەخشندەیی تیا بوایە. ئەو لەگەڵ مامە فڕانکم لەکێڵگەیەکی کرێ گرتەدا دەژیان کەهەم ئافەت لێیدا بوو هەم خاکێکی بێ بەرهەمی هەبوو. ژیانی ئەوان زۆر سەخت بوو، دەبوا زۆر دەستپێوەگر بوونایە. بەڵام پوورم دەیویست چەند پارچە پەردەو هەندێك کەل‌و پەلی تر بۆ خانووە بەتاڵەکەیان بکڕێت. ئەو ئەم شتانەی بەشێوەی قست دەکڕی‌و مامە فڕانکم لەم قەرزانە زۆر بێتاقەت بوو بەدزییەوە داوای لەخاوەنی دوکانەکە کرد شت بەقست نەفرۆشێت بەپوورم. کاتێك پوورە ئەدیت ئەم هەواڵەی بیست زۆر تووڕە بوو. نەك هەر لەوکاتەدا، بەڵکو ئەم تووڕە بوونەی ئەو پەنجا ساڵ درێژەی کێشا. بۆ دوایین جار کە ئەوم بینی‌و حەفتاو ئەوەندە ساڵ تەمەنی بوو پێم وت: (( پوورە ئەدیت مامە فرانك کارێکی باشی نەکرد کەتۆی سووك

كرد، بەڵام بیرناكەیتەوە ئەوەی تۆ نیو سەدە بەردەوام ئەم شتەت دووپات كردووەتەوە و گلەیی لێدەكەیت خراپتربێت لەكارەكەی ئەو؟)) ئەڵبەت دەمتوانی ئەم قسانەم بۆ دیوار بكردایە!

پوورە ئەدیت بەهایەكی گرانی بۆ ڕقەكەی دانا. ئەو چەندەها ساڵ ژیانی خۆی بەتاڵی بردە سەرو ئۆقرەیی ڕۆحی خۆی خستە مەترسییەوە.

كاتێك بەنجامین فرانكلین تەمەنی حەوت ساڵ بوو هەڵەیەكی كرد كە حەفتا ساڵ لەیادیدا مایەوە. كاتێك كوڕێكی حەوت ساڵان بوو ئاواتە خوازی فیقەنەیەك بوو. ئەوەندە ئەو فیقەنەی حەز لێبوو كە چووە فرۆشگای یاری منداڵانەوەو تەواوی پارەكانی ڕشتەسەر مێزەكەو بەبێ پرسیاری نرخەكەی فیقەنەكەی كڕی. كاتێك گەڕایەوە بۆماڵەوە كەوتە یاری كردن بە فیقەنەكەی. خوشكو براكانی كە زانیان ئەو چەند ئەوەندەی نرخی ڕاستەقینەی فیقەنەكەی داوە بە كەریەتی ئەو پێكەنینو ئەو لەتاو نارەحەتی دەستی كرد بەگریان. چەندەها ساڵ دوای ئەوە كاتێك فرانكلین بووە باڵوێزی ئەمریكا لەفەڕەنساو بووە كەسایەتیەكی جیهانی، دیسان ئەم شتە لەیاد بوو كەپارەدانی زیاتر بۆ چێژی هەبوونی فیقەنە مەراقو خەفەتی بۆ ئەو دروستی كردبوو. بەڵام ئەم پارەیە لەچاو ئەو پەندەی فرانكلین لەوەی وەرگرت زۆر كەم بوو. ئەو دەڵێت: (( كاتێك گەورەبوومو چوومە دنیای گەورەكانەوە كەسانێكی زۆرم بینی كە بۆ فیقەنەكانیان بەهایەكی زۆریان ئەدا. بەكورتی پێموایە زۆربەی بەدبەختی خەڵك لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە ناتوانن بەهای شتەكان بە دروستی لێك بدەنەوەو بەهایەكی زۆر بۆ شتەكەم بایەخەكان ئەدەن)).

كیلبێرتو سالیوان، پوورە ئەدیتو منو تەنانەت لیۆ تۆ لستۆی نووسەری دوو ڕۆمانی زۆر بەناوبانگی (( شەڕوئاشتی))و ((ئاناكارنینا)) هەموویان تووشی ئەم هەڵەیە بووین. بەپێی سەرچاوەی بریتانیا لیۆ تۆ لستۆی لەماوەی بیست ساڵی كۆتایی تەمەنیدا بە بەڕێزترین كەس لەدنیادا دەژمێردراو خەڵك لەهەموو دنیاوە ڕوویان لە لادێكەی ئەو دەكرد تاكو خانوو و ڕوخساری ئەو ببینن، دەنگی ببیستنو یان تەنانەت دەستێك بە عاباكەیدا بێنن. هەر ڕستەیەك دەیوت وەكو وەحی دەنووسرایەوە. بەڵام لەژیانی ڕاستەقینەدا لەتەمەنی حەفتا ساڵی بەئەندازەی حەوت ساڵی فرانكلین عەقڵی مەعاشی نەبوو.

ئەو لەگەڵ کچێکدا هاوسەر گیری کرد کەزۆر خۆشی دەویست. ئەوان ئەوەندە بەختەوەر بوون کە هەمیشە دوعایان دەکرد بەردەوام بەم شادیو شەوقەوە پێکەوە بژین. بەڵام هاوسەرەکەی ئەو زۆر دڵپیس بوو. جلی ساختەی لەبەر دەکردو شوێن لیۆ دەکەوتو تەنانەت لەدارستانیشدا چاودێری ئەوی دەکرد.تەنانەت سەبارەت بە منداڵەکانیشی دڵپیس بوو تا ئەو شوێنەی جارێك فیشەکێکی بەوێنەی کچەکەیەوە نا. جارێکی تر بتڵێکی نا بەدەمیەوە کەتلیاکی تیابوو، هەڕەشەی خۆ کوشتنی کرد. ئەمە لەحاڵێکدا بوو کە منداڵەکانی لەسووچێکەوە کز دانیشتبوونو دەگریان.

کاردانەوەی لیۆ چی بوو؟ ئەگەر شتو مەکی بشکاندایە سەرزەنشتم نەدەکرد چونکە لەئەندازە هاندەری بۆ ئەم کارە هەبوو. بەڵام کارێکی خراپتری ئەنجامدا. دەفتەرێکی بیرەوەری هێناو لەوێدا ژیانی بە شێوەیەك باسکرد کە نەوەکانی داهاتوو ئەو بەبێ تاوان بزانن و تاوانەکە بخەنە ئەستۆی ژنەکەی.

هاوسەرەکەی چی کرد؟ ئاشکرایە، چەند لاپەڕەیەك لەوەی دڕاندو سووتاندو خۆی دەفتەرێکی بیرەوەری نووسی

کە لەوەدا لیۆ تاوان باربوو. ئەو تەنانەت ڕۆمانێکیشی بەناوی (( تاوانی کێیە؟ )) نووسیو لەوێدا لیۆی بە ئەهریمەنو دێو دیمانە کردو خۆی بەقوربانی دەستی ئەو ناساند.

هەموو ئەم کارانە بۆچی بوو؟ بۆچی ئەم دووکەسە خانووەکەیان بەوتەی لیۆ کردبوو بە شێتخانە؟ ئەوان هۆکاری تایبەتی خۆیانیان هەبوو. یەکێك لەهۆکارەکان ئەوە بوو کەدەیانویست منو ئێوە بخەنە ژێر کاریگەرییەوە. بەڵێ، ئەوان بەنیسبەتی داهاتووانەوە کە ئێمەین زۆر نیگەران بوون. بەڵام ئایا بۆ ئێمە گرنگە تاوانبار کام لەوان بوو؟ نا! ئێمە ئەوەندە سەرقاڵین کە دەرفەتی بیر کردنەوە لەکێشەی خێزانیمان نیە. ئەم دووانە بەهایەکی زۆریان بۆ قیقەنەکانیان دۆڕاند. پەنجا ساڵ لەژیانی خۆیان کردە دۆزەخ. چونکە هیچ کامیان ئەوەندە تێگەیشتنیان نەبوو سوود لەیاسای بڕینی زیان وەربگرنو بڵێن: ئیتر بەسە، هەر لێرەدا باکۆتایی پێ بێنین)).

بەڵێ، هەبوونی هەستی نرخ دانان لەژیاندا زۆر گرنگەو یەکێکە لەفاکتەرەکانی ئارامیو ئۆقرەیی مێشكو ڕۆح.هەرکام لەئێمە دەبێ ستاندەری تایبەت بەخۆمان بۆ بەهادانان دیاری بکەین. بەمجۆرە دەتوانین نیوەی ئازارەکانمان لەنا و بەرین.



 

## یاسای پێنجەم بۆ تەرکی خووی نیگەرانی:

هەرکاتێك بینیتان بەهایەکی گران بۆ شتانی کەم بایەخ ئەدەن ئەم سێ پرسیارە لەخۆتان بکەن:

١- ئەو شتە من ئازار ئەدات ئایا بەڕاستی تا چ ڕادەیەك بۆ من گرنگە؟

٢- یاسای بڕینی زیان لە چ سنوورێکدا بخەمە کار؟

٣- ئەبێ چەندە لەژیانی خۆمی بۆ تەرخان بکەم؟ ئایا تا ئێستا لەنرخی ئەوە زیاترم بڕیوە؟

بابەتی شەشەم

# ئاوی ڕۆیشتوو ناگەڕێتەوە بۆ جۆگەکەی

ئەم ڕستەیە دەنووسم، لەپەنجەرەی خانووەکەوە سەیرێکی حەوشە دەکەم. لەناو حەوشەکەدا جێی قاچی چەند داینا سۆر هەیە. ئەم جێ قاچانەم لەمۆزەخانەی پی بادی هەڵکەوتوو لەزانکۆی (( ییل )) دا کڕی. بەرپرسی مووزە خانەکە لەنامەیەکدا نووسیویەتی ئەم جێ پێیانە دەگەڕێتەوە بۆ ((١٨٠)) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر. تەنانەت بێ عەقڵترین مەغۆلەکانیش بەمێشکیاندا نایەت بگەڕێنەوە بۆ (١٨٠)ملیۆن ساڵ لەمەوبەرو ئەم جێ پێیانە بگۆڕن. ئەوەی کە بمانەوێت تەنانەت (١٨٠) چرکە بگەڕێینەوە بۆ دواوە هەر بەو ئەندازەیە گاڵتەیە. بەو حاڵەوە زۆربەی ئێمە بەردەوام لەڕابردوودایین و دەمانەوێ شتانێك بگۆڕین. بێ گومان زۆرتر کارێك دەتوانین بیکەین ئەوەیە کە ئاکامەکانی ئەو شتەی (١٨٠) چرکە لەمەوبەر ڕوویداوە بیگۆڕین، بەڵام خودی ئەو شتەی ڕوویداوە بێگومان ناتوانین بیگۆڕین.

لەم دنیایەدا ڕابردوو تەنیا بەیەك شێوە بەسوود دەژمێردرێت و ئەوە لەحاڵەتێکدایە کە بەهەڵسەنگاندنی هەڵەکانی ڕابردوو سوودیان لێوەربگرین و لەبیریان بکەین. باش دەزانین کە ئەم شتە ڕاستە، بەڵام ئایا هەمیشە ئەو شەهامەتەم هەیە ئەم کارە بکەم؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە با لەیەکێك لەئەزموونە سەرنج ڕاکێشەکانمدا لەگەڵتان هاوبەش بم. چەند ساڵ لەمەوبەر چەند هەزار دۆلارم لەدەستدا بێ ئەوەی پەنابایەك سوود بەرم. ڕێکخراوێکی گەورەی پەروەردەکردنی گەورەتەمەنانم دامەزراندو بنکەی زۆرم لەشارە جۆراو جۆرەکاندا داناو بۆ پڕوپاگەندە پارەیەکی زۆرم خەرج کرد. ئەوەندە سەرقاڵی وانە وتنەوە بووم کە نەکات و نەئارەزووی شوێن کەوتنی کاروباری مادیم هەبوو. ئەوەندە ساویلکە بووم کە تێنەگەیشتم دەبێ بەڕێوەبەرێکی حیسابات بۆ ڕێکخستنی خەرجەکانم دابمەزرێنم.

لەکۆتاییدا لەپاش یەک ساڵ ئاگاداری ڕاستیەکی هەژێنەر بوومەوە. سەرەڕای داهاتێکی زۆر کە بۆ ڕێکخراوەکە دەهات هیچ دەستکەوتێکم نەبوو. لەپاش تێگەیشتن لەمە دەبوا دوو کارم بکردایە. یەکەم زەرەرو زیانەکەم فەرامۆش بکردایەو دووەم بەشیکردنەوەی گرفتەکە بۆ تەواوی ژیانم پەندم وەربگرتایە. بەڵام هیچ کام لەمانەم نەکرد. بەپێچەوانەوە عەسەبیو نیگەران بووم.چەند مانگ گرفتاری کێشەبوومو خەوو خۆراکم نەمابوو. لەجیاتی دەرس وەرگرتن هەمان هەڵەم لەئەندازەیەکی بچووکتردا کردەوە. لەبیر هێنانەوەی ئەم بێ عەقڵیەم شەرمەزار دەبم. بەڵام دوای ماوەیەک بۆم دەرکەوت:(( پەند دانی ٢٠ کەس ئاسانترە لەوەی لەجیاتی یەکێک لەوان بیتو شوێن ئەم ئامۆژگارییانە بکەویت)).

ئاواتم ئەوە بوو منیش دەمتوانی لەقوتابخانەی دوکتۆر پۆل برەندواین دەرسی بە بەڕێز ساندەرز دابوو، بەشداربم. بەڕێز ساندەرز بۆی گێڕامەوە مامۆستای تەندروستیان واتە دوکتۆر برەندواین یەکێک لەپڕ بەهاترین وانەکانی فێری ئەو کردووە:

(( ١٦-١٧ساڵ بووم کە نیگەرانیو دڵە ڕاوکێ ئێخەی پێ گرتبووم. دەربارەی هەڵەکانم زۆر ڕاڕایەم هەبوو، تاکو ئەنجامی تاقیکردنەوەکان وەربگرمەوە. لەتاو نیگەرانی نینۆکەکانم دەکرۆشتەوە. بەکورتی ژیانم ببووە پەشیمانیو ئاواتی ئەوە کەبتوانم کارەکانی ڕابردوو بەشێوەیەکی تر ئەنجام بدەم یان وتەکانم باشتر بێنمە سەر زمان. ڕۆژێک پۆلەکەمانیان برد بۆ تاقیگەو دوکتۆر برەندوانیش لەوێ بوو.بتڵێک شیر لەسەر مێزەکەی دەبینرا. هەموومان دانیشتبووینو چاومان بڕیبووە ئەو بتڵە شیرەو دەمانویست بزانین پێوەندی ئەمە لەگەڵ وانەی تەندروستی چیە؟ کوتوپڕ هەستاو بتڵەکەی کردە ناو سنگێک کە لەناو مێزەکەدا بوو، هاواری کرد:(( ئاوی ڕۆیشتوو ناگەڕێتەوە بۆ ناو جۆگا)). پاشان هەمووومانی بانگ کرد تاسەیری ناو سنگەکە بکەینو ببینین چی لەشیرەکە ماوەتەوە.

ئەو وتی(( هەموو شیرەکە چووە ناو زێرابەوەو ئەگەر هەموو دنیا کۆببنەوەو چرچاویان بڕنن یەک دڵۆپیشی ناتوانن بگەڕێننەوە. بەتۆزێک وردبینی لەوانەبوو ئەو شیرە بپارێزێت بەڵام ئێستا بۆ ئەم کارە درەنگە. تەنیا دەتوانین پەندی لێوەرگرینو

خودی ڕووداوەکە لەبیر بکەین)). ڕاستەکە هەندەسەو زمانی لاتینیم فەرامۆش کردووە، بەڵام ئەم نواندنەی دوکتۆر برەندواین هەرگیز فەرامۆش ناکەم.

لەڕاستیدا ئەم کارەی ئەو زیاتر لەو شتەی لەچوار ساڵی دواناوەندیدا فێر بووم، دەرسی کردەوەی فێری من کرد. تێگەیشتم دەبێ هەوڵ بدرێت شیرەکە نەڕژێت، بەڵام کاتێک کار لەکار ترازا چیتر فەرامۆش بکرێت)).

لەوانەیە هەندێک لەخوێنەران لەوەی ئەوەندە تیشک دەخەینە سەر پەندی کۆن چڕوچاوی گرژ کردبێت. دەزانم ئەم پەندە زۆر ئاساییە، کۆنەو زۆر وتراوەتەوە و ئێوە هەزاران جار بیستووتانە. بەڵام ئەوەیش دەزانم ئەم پەندە سەمەرەی ئەزموونی سەدەکانی مرۆڤایەتییە کەئەوە لەدوای ئەوە گەیشتووە بەئێمە.

بەردەوام ئافەرینم بە دوکتۆر فرێد فولێر شێرد وتووە لەبەر ئەوەی دەتوانێ قسەکۆنەکان لەچوار چێوەیەکی نوێدا بەیان بکات. ئەو هەم سەرنووسەری گۆڤاری فیلادلفیا بوو، هەم مامۆستای زانکۆ بوو. جارێک لەپۆلەکەدا پرسیاری کرد: (( چەند کەس لەئێوە داری بەمشار بڕیوەتەوە؟)) زۆربەی خوێندکاران دەستیان هەڵبڕی. پاشان پرسیاری کرد:(( چەند کەس لەئێوە خوڵی مشارەکەی بڕیوەتەوە؟)) هیچ کەس دەستی هەڵنەبڕی. پاشان فولێرشێرد وتی: (( ئەڵبەت دیارە ناکرێت خوڵەکەی بڕدرێتەوە. چونکە لەوەپێش بڕاوەتەوە. ئەم بابەتە سەبارەت بەڕابردووش هەر بەوجۆرەیە. کاتێک بۆ ئەو شتانەی ڕوویانداوەو تەواوبووە خەمو بریا هەڵدەکێشن وەکو ئەوە وایە هەوڵ بدەن خوڵی مشارەکە بڕنەوە)).

لەڕۆژی شوکرانە بژێریدا لەگەڵ جەک دەمپیسی خواردنی ئێوارەم دەخوارد.ئەو باسی لەکێبەرکێیەکی قارەمانی دەکرد کە دۆڕاندبووی: (( لەناوەڕاستی یاریەکەدا بووم کەتێگەیشتم پیر بووم. کۆتایی ڕاندی دەبوو. هێشتا بەسەر پێوە بووم، بەڵام نزیک لەکۆتایی بووم. دەمووچاوم هەڵاوسابوو، بریندار ببوو، چاویشم نیوە کراوە بوو. بینیم دادوەرەکە دەستی ڕکەبەرەکەی بەرز کردەوە.....چیتر قارەمان نەبووم. لەناو جەماوەرەکەوە چوومە ژووری خۆگۆڕین. هەندێک هەوڵیان ئەدا دەستم بگرن‌و لەچاوانی هەندێکیشدا فرمێسک کۆببووەوە. ساڵی دوایی هەر لەگەڵ ئەو ڕکەبەرەدا کەوتمە کێبەرکێ، بەڵام بێسوود بوو دەورانی من تەواو ببوو. خۆم نەدۆڕاندو وتم: (( نابێ حەسرەتی ڕابردوو بخۆم. دەبێ وەکو پیاو ئەم دۆڕاندنە قبووڵ بکەم)).

پێتان وایە ئەو بەوتنەوەی ئەم ڕستەیە کە (( نابێ بێڵم ڕابردوو ئازارم بدات )) ئەم کارەی ئەنجامدا؟ نەخێر، ئەم کارە زیاتر دەبووە هۆی ئەوەی ئەو بیر لەڕابردوو بکاتەوە. ئەو کارەی ئەو کردی ئەمە بوو. ڕووداوەکەی لەبیر بردەوەو بۆ داهاتوو دەستی کرد بەداڕشتنی بەرنامەو پلان. هۆتێل و ڕیستۆرانێکی کردەوەو کەوتە چاک سازی باروودۆخی وەرزشی بۆکسێن و ئەوەندە لەکارە بەسوودەکاندا نوقم بوو کە کاتی بۆ حەسرەت خواردن بۆ ڕابردوو نەبوو. ئەو کتێبی زۆری نەخوێندبووەوە بەڵام شوێن ئامۆژگارییەکی شکسپیر کەوتبوو: (( عاقڵان هەرگیز ماتەم ناگێڕن بۆ نوقسانی و کەموکوڕییەکان، بەڵکو بەشادمانی بەشوێن مەلهەمی زامەکانیاندا دەگەڕێن)).

جارێك چووم بۆ بەندیخانەی سینگ سینگ. ئەو شتەی بووە هۆی سەرسوڕمانی من ئەوە بوو کە زۆربەی بەند کراوەکان بە ئەندازەی خەڵکی ئازاد شادمان بوون. ئەم شتەم لەلای بەرپرسی ئەو کاتەی زیندانەکە باس کرد. ئەو وتی کاتێك زیندانیەکان سەرەتا دێنە ئەم شوێنە زۆر ڕووگرژو ترشاون بەڵام لەپاش تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێك ئەوانەی کە عاقڵترن کێشەو نەگبەتیەکانیان فەرامۆش دەکەن و هەوڵ ئەدەن ژیانی ناو زیندان بەخەم ساردی و ئارامی وەربگرن و کاتی باش بەرنەسەر. ئەو تەنانەت دەربارەی باخەوانێکی زیندانی قسەی دەکرد کە لەناو زینداندا سەوزەی دادەچەندو لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کارەدا بەردەوام گۆرانی دەوت. ئەو لەوبابەتە گەیشتبوو کە:

دەستی ڕۆژگار چارەنووسی ئێوە دەنووسێت و کاتێك نووسی
دەڕوات، نەزیرەکی و نەژەهری ئێوە نیو دێڕێکی لێ هەڵناوەشێنێتەوە
و نەتەواوی فرمێسکەکانتان وشەیەکی لێ پاك دەکاتەوە،

کەواتە نابێ فرمێسکەکان خەسارکەین. ڕاستە کە هۆکاری هەڵەکانی ڕابردوومان بووین، بەڵام مەگەر هەمووان هەر وانەبوون؟ تەنانەت ناپلیۆنیش یەك لەسێی تەواوی شەڕە گرنگەکانی دۆڕاند.

لەوانەیە هەڵەکانی ئێمە خراپتر نەبێ لەهەڵەکانی ئەو.

**یاسای سێهەم**: هەوڵ مەدەن خۆڵی بەر مشارەکە بیڕنەوە.

## کورتەی بەشی سێیەم

## چۆن خووی نیگەرانی لەپێش ئەوەی لەناوتان بەرێت لەناوی ببەن.

١- نیگەرانیەکان بەکاری زۆرو سەر قاڵ بوون لەمێشکی خۆتان دەرکەن.

٢- سەبارەت بەشتە کەم بایەخەکان هات و هاوار ساز مەکەن. ڕێگەمەدەن کێشەی بچووك کە مێژووی ژیانن ئێوە لەنا و بەرن.

٣- سوود لەیاسای ئەگەرەکان و ئامار وەرگرن بۆ کەمکردنەوەی نیگەرانیەکانتان. پرسیار لەخۆتان بکەن: (( ئەگەری ڕوودانی ئەم شتە چەندەیە؟))

٤- لەگەڵ شتانی بێ گەڕانەوەو نەگۆڕدا خۆتان بگونجێنن. کاتێك بارودۆخەکە لە سەروو توانای ئێوەوە لەبەرامبەری گۆڕاندا خۆڕاگری دەکات بەخۆتان بڵێن: (( ئاوایەو ناتوانێ جۆرێکی تر بێت )).

٥- سوود لەیاسای بڕینی زیان وەرگرن. بۆ خۆتانی دیاری بکەن کە ئەو شتە بەهای خۆنیگەران کردنی هەیەو زیاتر لەنرخی خۆی بۆی دامەچن.

٦- ڕابردوو لەبیرکەن. هەوڵ مەدەن خۆڵی بەرمشاربپڕنەوە.

## بابەتی یەکەم

# هەشت وشە کە دەتوانن ژیانی ئێوە بگۆڕن

چەند ساڵ لەمەوبەر لەڕادیۆ ئەم پرسیارە لەمن کرا؟ (( گەورەترین دەرسی فێربوون چی بوو؟ )) وەڵامەکەی ئاسان بوو. فێربووم شێوەی ئەندیشەو ڕوانینی ئێمە زۆر گرنگە. ئەگەر ئەندیشەی ئێوە بزانم خۆشتان دەناسم. ئەوە بیرەکانی ئێمەن کە ئێمە دروست دەکەن. بەهاو ڕوانینی ئێمە هۆکارێکە کە چارەنووسی ئێمە دیاری دەکات. ئیمرسۆن دەڵێت: (( مرۆڤ بریتیە لەو شتەی ڕۆژێک بیری لێ کردووەتەوە)). مەگەر دەکرێت بریتی بێت لەشتێکی تر؟

ئێستا بەدڵنیاییەوە دەزانم بناغەییترین کێشە یان تەنیا کێشەیەک ئێمە دەبێ بەرەوڕووی ببینەوە هەڵبژاردنی ئەندیشەی دروستە. بەم کارە کێشەکانی تر بەئاسانی چارەسەر دەبن. مارکۆس ئۆرلیۆس، فەیلەسوفێک کە بەسەر ئیمپراتۆری ڕۆمدا زاڵ بوو، ئەم وتەیەی لەهەشت وشەدا کورت کردووەتەوە: (( ژیانی ئێمە دروست بوونی ئەندیشەکانی ئێمەیە)).

ئەگەر بیرەکانمان شادبن شاد دەبین و بەپێچەوانەوە ئەگەر بیر لەترس بکەینەوە دەترسین و ئەگەر لەنەخۆشی نەخۆش دەکەوین. ئەگەر بیر لەشکست بکەینەوە بێ گومان شکست دەخۆین و ئەگەر خۆمان بە بەدبەخت بزانین خەڵك لێمان دوور دەکەوێتەوە. نامەوێ بڵێم ژیان ئەوەندە سادەیە. نا، تەنیا ئەو بۆچوونە بڵاو دەکەمەوە کەباشترە لەجیاتی ئەندیشەی نیگەتیڤ ئەندیشەی پۆزەتیڤمان لەمێشکدا بێت. واتە دەبێ ئێمە ئاگاداری کێشەکانمان بین نەک ئەوەی نیگەرانیان بین. بۆ نموونە کاتێك لەجادەیەکەوە دەپەڕینەوە ئاگامان لەکارەکەمانە بەڵام نیگەرانی نین. ئاگادار بوون واتە دیاری کردنی چۆنیەتی کێشەکەو هەنگاو نان بەرەو چارەسەرکردنی. نیگەرانی واتە سەر لێشێواوی و بێ ئەنجام بوون. پیاوێك دەتوانێت

لەو کاتەدا کە ئاگادارەو بیر لەکێشەکەی دەکاتەوە بەقیت و قۆزیو گوڵێك بەیەخەیەوە ڕێك بیرێت. بیرو باوەڕی ئێمە کاریگەریەکی یەکجار زۆری لەسەر توانای جەستەیی ئێمە هەیە.

دەروونناسی بەناوبانگی بەریتانی جی ئی هیدفیلد لەکتێبی (( دەروونناسی هێز))دا ئەم بابەتە بەجوانی دیمانە دەکات. ئەو دەنووسێت:

(( داوام لەسێ پیاو کرد خۆیان بخەنە بەر تاقیکردنەوەی کاریگەری تەڵقینی مێشك لەسەر هێزیان. ئەندازەی هێزیشیان بەهۆی (( دینامۆمەتر ))یکەوە دەپێورا. ئەم کەسانە لەسێ دۆخی جیاوازدا ئەم دینامۆمەترەیان بەتەواوی هێزەوە دەگووشی. کاتێك ئەوان لەحاڵەتی ئاساییدا ئەم کارەیان کرد بەشێوەی مامناوەندی ڕادەی هێزیان (١٠١) پۆند بوو.

دوکتۆرێك هیپنۆتیزمی کردن و بەوانی تەڵقین کرد زۆر لاوازو بێ هێزن، ئەم جارەیان ڕادەی مامناوەندی هێزیان بۆ(٢٩) پۆند کەم بووەوە. واتە کەمتر لە٣٠٪ی هێزی ئاسایی ئەوان (یەکێك لەم پیاوانە بۆکسینێکی پرۆفیشناڵ بوو، کاتێك تەڵقین بوو بێ هێزە بازۆڵەی وەکو منالّ شل بوو).

بۆ قۆناغی سێهەم تەڵقینیان پێکرا زۆر بەهێزن، ئەو کاتە ڕادەی هێزیان بەشێوەی مامناوەندی گەیشتە (١٤٢) پۆند. لەپاش هاتنەدەر لەحاڵەتی هیپنۆ تیزم چونکە ڕوانگەیەکی پۆزەتیڤ لەواندا دروست ببوو هێزی ئاسایی ئەوان ٥٪ زیاد ببوو.

بۆ سەلماندنی هێزی سیحراوی مێشك یەکێك لەسەیرو سەمەرەترین ڕووداوەکانی مێژووی ئەمریکاتان بۆ دەگێڕمەوە. دەکرا لەم بارەوە کتێبێك بنووسرێت بەلاّم من هەوڵ ئەدەم بابەتەکە بەکورتی باس بکەم.

شەوێکی ساردی مانگی ئۆکتۆبەر ماوەیەك لەپاش شەڕی ناوخۆیی ئەمریکا ژنێکی ئاوارەو داماو دەرگای ماڵی دایکە وێستەری کوتا کە هاوسەری فەرماندەیەکی خانەنشینی هێزی دەریایی بوو، کوتای. بەکردنەوەی دەرگاکە دایکە وێستەر ژنێکی لاوازو کزی بینی کە بەزۆر چل کیلۆ پێست و ئێسك بوو. ئەو ژنە خاتوو گلۆڤەر بوو وتی پێویستی بەخانوویەکە تا دەربارەی کێشەیەکی گەورە کە ئەوی زۆر سەرقاڵ کردووە، بیر بکاتەوە. دایکە وێستەر وتی: ((بۆچی لێرە نامێنیتەوە؟ من لەم خانووە گەورەدا بەتەنیام)).

ئەگەر زاوای دایکە وێستەر بۆ کاتی پشوو نەچوایە بۆ ئەوێ گلۆڤەر بۆ هەمیشە لەلای دایکە وێستەر دەمایەوە. بەڵام زاواکەی بە بینینی ئەو هاواریکرد ڕێگەنادات بەرەڵایەك لەماڵەکەدا بێت و ئەوی لەژێر بارانی زریاناویدا کردەدەرەوە. گلۆڤەر چەند خولەکێك لە بەر خانووەکەدا وەستا و پاشان بەدوای پەناگەیەکی تردا لەوێ دووركەوتەوە.

بەشی سەرنج ڕاکێشی داستانەکە ئەوەیە کە ئەو ژنە گەراڵە هەر لە ئەزەلەوە قەراربوو زیاتر لەهەر ژنێکی تر کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەو ئەندێشەی جیهانیان دانێت. ئەو ئێستاکە لەلایەن ملیۆنەها موریدەوە بە(( مێری بەیکەر ئێدی )) دەناسرێت. ئەو بناغە دارێژەری زانستی مەسیحیەت بوو. ئەڵبەت تا ئەو کاتە ئەو تەنیا نەخۆشی، خەم و بەڵای لەژیان بینیبوو. هاوسەری یەکەمی ماوەیەکی کەم لەپاش مەرگی مرد. هاوسەری دووەمی ئەوی بەجێهێشت و لەگەڵ ژنێکی مێردارا هەڵهات. ئەو ناچار بوو لەتاو هەژاری و دەستەنگی کوڕەکەی لەچوار ساڵیدا ئەوی سپارد بەشوێنێك و تا (٣١) ساڵی نەیبینیەوە. بەهۆی باری خراپی تەندروستیەوە خاتوو ئێدی ساڵانێکی زۆر ئاواتە خوازی زانستێك بوو کە خۆی ((زانستی شیفای مێشکی)) پێدەوت. بەڵام خاڵی وەرچەرخانی ئەو لەلین ماساچۆسێت بوو. لەناوەڕاستی شاردا ڕێی دەکرد، قاچی لەسەر سەهۆڵ خزاو درا بەشۆستە بەستووەکەداو لەسەر هۆش چوو.

بربڕەی پشتی ئەوەندە بەسەختی پێکرابوو کەتووشی ئیسپاسمی توند دەبوو، پزیشکەکەی پێیوابوو زیندوو نامێنێت. ئەگەر موعجیزەیەك ببێت و زیندوو بمێنێت هەرگیز توانای ڕێ ڕۆیشتنی نابێت. لەحاڵێکدا لەجێگەکەیدا ڕاکشابوو ئینجیلەکەی کردەوە و بەوتەی خۆی هێزی ئاسمانی ئەوی بەخوێندنەوەی ئەم ڕستانە ڕێنمایی کرد: (( بڕوانن کە پیاوێکی ئیفلیج کە لەسەر تەختەکەی ڕاکێشرابوو هات بۆ لای عیسا و عیسا بەوی وت: ڕۆڵەم، شاد بە کە تاوانەکەت بەخشرا....هەستە جێگەکەت کۆبکەرەوە و بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە. ئەو هەستا و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە)).

ئەم وتانەی مەسیح وەها هێزێکی لەئێدیدا دروست کرد کە ئەو هەر ئەو ساتە لەجێگەکەی هەستا و کەوتە ڕێ. خاتوو ئێدی وتی: ((ئەم خاڵی وەرچەرخانە بووە هۆی ئەوەی من بزانم چۆن چاك ببم و کەسانی تریش چۆن چاك بکەمەوە. متمانەیەکی

زانستیم پەیدا کرد کەهەر هۆکارێك مێشکەو هەر کاردانەوەیەك دیاردەیەکی مێشکیە)).

بەم جۆرە بوو کەمێری بیکرادی بووە دامەزرێنەری ڕەوتێکی نوێ بەناوی زانستی مەسیحیەت. ئەمە گەورەترین بیرۆکەی دانراوە لەلایەن ژنێکەوە کە لەتەواوی جیهاندا بڵاو بووەتەوە. لەوانەیە بڵێن ئەم پیاوە پڕوپاگەندە بۆ مەسیحیەت دەکات. بەڵام هەرچی تەمەنم دەچێتە سەر زیاتر بڕوا بە هێزی ئەندێشە پەیدادەکەم. لەپاش(٣٥) ساڵ وانەوتنەوە دەزانم کەپیاوان و ژنان دەتوانن ترس و نیگەرانیەکانیان بەهۆی گۆڕینی باوەڕو ئەندێشەکانیان لەخۆیان دووربکەنەوەو ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەن. ئەوەندەم لەم گۆڕانە سەرسوورهێنەرانە بینیوە کە چیتر بەلامەوە سەیر نیەو متمانەی تەواوم هەیە کە ئەم کارانە بەگۆڕینی ئەندێشەکان دێتە ئاراوە.

یەکێك لەم گۆڕانانەی دروست بوو لەگۆڕینی ئەندێشەیە بۆ یەکێك لەفێرکارانی من ڕوویدا. ئەو بەهۆی ترس و نیگەرانییەوە تووشی کێشەی دەروونی بوو. بەمنی وت:

(( سەبارەت بەهەموو شتێك نیگەران بووم، لەوەی کەکزو لاواز بووم؛ قژم ئەوەری، ئەوەی کە هەرگیز نەمدەتوانی پارەی تەواو بۆ ژن هێنان کۆبکەمەوەو ژیانێکی باشم نیە. لەوەی کە خەڵك چۆن دەربارەی من بیر دەکەنەوەو لەوەی برینی گەدەم هەبێت دەترسام.کارەکەمم بەجێ هێشت. وەکو دیگی هەڵمم لێهاتبوو کە کونی نیە. گوشارەکە ئەوەندە زۆر بوو کە دەروونم نەخۆش کەوت. ئەگەر تا ئێستا تووشی ئەم حاڵەتە نەبوون داوا لەخوا بکەن بەنسیبتانی نەکات. چونکە هیچ ژانێکی جەستەیی بەئەندازەی زەنگی مێشکێکی نەخۆش تاقەت پڕووکێن نیە.

ئەوەندە وەزعم شڕبوو کە نەمەتوانی لەگەڵ خێزانەکەیشمدا قسەبکەم. فیکرەکانم لەدەست دەرچوون و دەروونم بەترس پڕببوو. کەمترین دەنگ منی تووشی ترس دەکردو بێ هۆ دەگریام. هەموو ڕۆژێك خەمبار بووم و بیرم دەکردەوە هەمووان تەنانەت خودایش لەبیری کردووم. دەمویست خۆم لەڕووبارێکدا بخنکێنم و کۆتایی بەم وەزعە بێنم. بەپێچەوانەوە بڕیارمدا سەفەر بکەم بۆ فلۆریدا بەشکم شوێن گۆڕین ((جێ گۆڕکێ)) یارمەتیم بدات.

کاتێك سواری شەمەندەفەر بووم باوکم نامەیەکی پێدام و وتی تا نەگەیشتوومەتە فلۆریدا نەیکەمەوە. گەیشتمە فلۆریدا. چونکە لەگەرمەی وەرزی گەشتیاریدا چووبووم

بۆ ئەوێ هوتێلم دەست نەکەوت و ژوورێکم لەنا و گەراجدا گرت بەکرێ. ویستم کارێك بدۆزمەوە، بەلام نەمتوانی. کەواتە کاتم لەکەنار ئاوەکان دەبردە سەر. لەفلۆریدا تەنانەت خراپترببووم. نامەکەم کردەوە. باوکم نووسیبووی: ((کورم، ١٥٠٠میل لەماڵەوە دووری. بەلام حاڵت نەگۆڕاوە، وایە؟ دەمزانی باشتر نابیت، چونکە هۆکاری کێشەکانیشت لەگەڵ خۆت بردووە، واتە خۆت! جەستەو مێشکی تۆ تەندروستە. بارو دۆخ تۆی والێنەکردووە. بەڵکو ڕوانگەی تۆ بۆ باروو دۆخ کێشەی دروست کردووە. ئینسان ئەوەیە کەبیری لێدەکاتەوە. هەرکاتێك لەمەتێگەیشتی بگەڕێوە بۆ ماڵەوە، چونکە چارەسەر بوویت)).

نامەکەی باوکم تووڕەی کردم. هەرلەوێدا بڕیارمدا هەرگیز نەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. لەیەکێك لەشەقامە لاوەکیەکانی میامیدا پیاسەم دەکرد. گەیشتمە کلێسایەك کە ڕێو ڕەسمی ئاینی لەحاڵی بەرپابووندا بوو. چونکە هیچ شوێنێکم نەبوو خۆم کرد بەکلێساکەداو گوێم لەوتارێك گرت دەربارەی ئەم ئایەتە: (( هەرکەسێك بەسەر ڕۆحی خۆیدا زاڵ بێت بەهێزتر لەوکەسەیەکە شارێك داگیر دەکات )). کاتێك لەناو ماڵی خوادا گوێم لەقسەگەلێك گرت کە هاومانای نامەکەی باوکم بوو ئەو بیرە نابەجێیانە لەمێشکم ڕەوییەوەو تێگەیشتم چەندە بێ عەقلانە هەڵس و کەوتم کردووە کە دەمویست هەموو دنیا و خەڵکەکانی بگۆڕم، لەحاڵێکدا ئەو شتەی پێویستی بە گۆڕان بوو ئەو ڕوانگەیە بوو کە هەمان مێشکی من بوو.

ڕۆژی دوایی شتەکانم کۆکردەوەو بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتم. یەك هەفتە دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ سەر کارەکەم و چوار مانگ دوای ئەوە لەگەڵ کچێکدا کە دەترسام لەدەستم دەرچێت هاوسەر گیریم کرد. ئێستا خێزانێکی بەختەوەرم هەیە بە(٥) منداڵەوە. نیعمەتی خودایی هەم لەبواری مادەو هەم لەبواری مەعنەوییەوە منی گرتەوە. لەو سەردەمەدا سەر دەستەی کرێکاری شەوانەی کارگەیەکی بچووك بووم بە (١٨) کرێکارەوە، بەلام ئێستا چاودێری کارگەیەکی دروستکردنی کارتۆنم بە(٤٥٠) کرێکارەوە. ژیانم بەپیت ترو خۆشترەو هەست دەکەم لەبەها ڕاستەقینەکانی ژیان گەیشتووم.

ڕاستگۆیانە بڵێم لەوەی لەو دەورانە دوچاری ئەو کێشانە بووم خۆشحاڵم، چونکە تێگەیشتم هێزی فیکر لەسەر مێشك و جەستەی ئینسان چەندەیە. ئێستا فیکرەکانم

بە جۆرێك ڕێك دەخەم كە لەگەڵم بن نەك لەدژم. ئێستا تێدەگەم كە باوكم ڕاستی دەكرد. باروودۆخ منی نەخۆش نەخستبوو بەڵكو ڕوانینی من بۆ شتەكان هۆكاری كێشەكە بوو)).

بالێرەدا باس لەبەسەرهاتی ڕابێرت فالكۆن و هاوڕێكانی بكەین كە یەكەم كەسانێك بوون توانیان بچن بۆ جەمسەری باشوور. لەوانەیە سەفەری گەڕانەوەیان سەختترین سەفەری ئینسان بووبێت خۆراك و سووتەمەنیان تەواو ببوو. بەهۆی بایەكەوە كە بەخێرایی هەڵیكردبوو، لەگەڵ زەیقەتی و بۆرانی توندا بوو پانزە ڕۆژ نەیانتوانی ڕێگا بڕێ. توندی باكە ئەوەندە زۆر بوو كە درزی خستبووە سەهۆڵەكانی جەمسەری. ئەوان پێیان وابوو دەمرن. لەبەر ئەو ئەگەرە بڕێكی زۆر تلیاكیان بردبوو تاكو بە بەكارهێنانی لەئاسوودەیی و خەوێكی خۆشدا ڕۆبچن و ئیتر هەڵنەستنەوە. ئەڵبەت ئەوان بڕیاریان دابوو لەجیاتی تلیاك بەخوێندنەوەی گۆرانی شاد بمرن. دەستەیەكی گەڕۆك لەپاش هەشت مانگ لەنامەی خوا حافیزی ئەوان لەكەناری جەنازە بەستووەكانیاندا دۆزیبیانەوە.

بەڵێ، بەهەبوونی ئەندێشەی شاد دەتوانین كاتێك لەبەرداری مەرگداین یان كاتێك لەحاڵی بەستنداین چێژ لەژیان وەربگرین. جان میلتۆن دەڵێت:

مێشك شوێنی خۆی هەیە و لەدەروونی خۆیدا دەتوانێ بەهەشت لە دۆزەخ و دۆزەخ لەبەهەشت دروست بكات.

ناپلیۆن و هیلێن كلێر نموونە گەلێكی دیارن لەم وتەیەی میلتۆن.

ناپلیۆن كەم و زۆر هەرشتێك پیاوێك ئاواتی بكات لەبەردەستیدا بوو: دەسەڵات، شكۆ، دارایی. بەڵام ئەو بەسەنت هیلینای وتبوو: (( شەش ڕۆژی شادم لەژیاندا نەبینیوە )). لەحاڵێكدا هیلێن كلێری كوێر و كەڕوو لاڵ دەیوت:(( ژیان زۆر جوانە )). نیو سەدە ژیان ئەگەریش شتێكی فێری من نەكردبێت ئەوەی بەمن فێركردووە كە لەخۆتان زیاتر هیچ كەس ناتوانێت ئۆقرەییتان پێ ببەخشێت.

ئەڵبەت ئیمرسۆن لەوتاری كۆتایی (( بڕوا بە خۆبوون)). ئەمەی بەجوانی باسكردووە و من تەنیا دەیڵێمەوە: ((سەركەوتنی سیاسی، زیادبوونی داهات، باشبوونەوەی نەخۆش یان گەڕانەوەی هاوڕێیەكتان ئێوە شادمان دەكات و

بیردەکەنەوە ڕۆژانێکی باش چاوەڕوانتانە، بەڵام بڕوا مەکەن. تەنیا خۆتانن کە دەتوانن شادمانی بۆ خۆتان بەدیاری بێنن نەك هۆکارە دەرەکیەکان)).

((ئۆپیکتەتوس)) فەیلەسووفی ڕەواقی دەیوت ئێمە زیاتر لەتومورو غوددە دەبێ لەفیکری دەرکردنی ئەندێشە نادروستەکان لەمێشکمان بین. مۆنتانی، فەیلەسوفی ناوداری فەڕەنسی دەڵێت:(( مرۆڤ زیاتر لەوەی زیان لەکارەساتەکان وەربگرێت، لەفیکرەکانی خۆی دەربارەی کارەسات زیاتر زیان وەردەگرێت )). کەواتە ئەم ڕوانینی تەواوی وابەستەیە بەخۆمانەوە.

مەبەستم چیە؟ ئایا من ئەوەندە بێ شەرمم بەئێوە بڵێم : کاتێك لەگەرمەی کێشەو فشارەکاندا تەنگتان پێ هەڵچنراوە دەتوانن بە گۆڕانکاری لەئەندێشەکانتاندا ئاسوودە بن و ئەم کارە تەنیا بە ئیرادەو هەوڵدان جێ بەجێ دەبێت؟ بەڵێ! مەبەستم کوت ومت هەر ئەمەیە. ئەڵبەت شێوازی ئەم کارەیشتان پێ دەڵێم.

ویلیام جیمز، کەسێك کە لەدەروونناسیدا هاوتای بۆ پەیدا نەبووە دەڵێت: وادەردەکەوێ کردەوە پێڕەوی هەستە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم دووانە پێکەوەن و بەرێکخستنی کردەوە کە ڕاستەوخۆ تەئسیر لەئیرادەوە وەردەگرێت، دەتوانین ئەو هەستا نەمان کە تەئسیری ڕاستەوخۆ لەئیرادەوە وەرناگرن، ناڕاستەوخۆ ڕێك بخەین)).

مەبەستی ویلیام جیمز ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین بەشێوەی خێرا بەبڕیاردان هەستەکانمان بگۆڕین، بەڵکو دەتوانین کردەوەکانمان بگۆڕین. بە گۆڕانکاری لە کردەوەکانماندا بەشێوەی ناڕاستەوخۆ و خۆبەخۆ هەستەکانمان دەگۆڕین. ئەو لەدرێژەدا دەڵێ: ((کەواتە ڕێگەی بەدەستهێنانی خۆ خوازانەی شادمانی، ئەگەر شادمانی و سەرچڵی ژیانتان لەدەست چووە، ئەوەیە کە شاد هەڵس و کەوت بکەن و شاد قسە بکەن، بەجۆرێك کە دەڵێی شادی لەوێیە)). ئایا ئەم تەکنیکە بچووکە دێتە حاڵەتی کردەوە؟ خۆتان تاقی بکەنەوە. پێبکەنن. شانتان ئازاد بکەن و گۆرانی بڵێن. نازانن؟ فیکە لێدەن. نازانن؟ وریتە وریت بکەن. ئەو کاتە بۆتان دەرئەکەوێت مەبەستی ویلیام جیمز چیە. لەڕاستیدا ناکرێ لەحاڵێکدا بەجەستەی نیشانەی شادیتان پێوە دیارە بەڕۆح پەشێوو خەمناك بن.

ئەمە یەكێكە لەڕاستیە بچووكەكانی سروشت كە دەتوانێ لەژیانی ئێمەدا موعجیزە دروست بكات. ژنێك لەكالیفۆرنیا دەناسم كە دەتوانێ تەواوی نارەحەتیەكانی لەماوەی (٢٤) كاتژمێردا لەخۆی دوور بخاتەوە. ئەڵبەت ئەگەر ئەم نهێنیە بچووكەی بزانیایە. ئەو پیرو بێوەژنە. دەزانم كە وەزعێكی ناخۆشە، بەلاّم ئایا ئەو هیچ هەوڵێدا شادمان هەڵس و كەوت بكات؟ نا. ئەگەر پرسیار لەئەو بكەیت حاڵت چۆنە، وەلاّم ئەداتەوە: ((باشم))، بەلاّم ڕوخسارو دەنگی باس لەشتێكی تر دەكات. وادەردەكەوێت كەسێك لەلای ئەو بێت بێزار دەبێ.

ژنانێكی زۆر هەن كە وەزعیان لەو خراپترە. هاوسەرەكەی پارەی باشی بۆ ئەو بەجێ هێشتووە هەتا بتوانێت ئاسوودە ژیان بكات و منداڵەكانیشی خانوویان بۆ دابین كردووە. بەلاّم زۆر كەم بینیومە پێبكەنێت. هەمیشە گلەیی ئەكات كەسێ زاواكەی كەسانێكی پیسكەو خۆبەزلزانن و ئەمە لەحاڵێكدایە كە چەندەهامانگە لەماڵی ئەواندا میوانە. هەروەها گلەیی ئەوەی هەیە كچەكانی دیاری بۆ ناكڕن. ئەڵبەت خۆی پارەكانی بۆ دەورانی پیری بەوردی كۆدەكاتەوە. ئەم پیرەژنە بووەتە ئۆباڵی ئەستۆی خۆیی و خێزانەكەی. بەلاّم بۆچی؟ ئەو ئەتوانێ خۆی لەحاڵەتی پیرەژنێكی بەدبەختی ڕووترش بكاتە ئەندامێكی خۆشەویست و ئازیزی بنەماڵەكەی. ئەڵبەت ئەگەر بیەوێت تەنیا كارێك كەپێویستە بیكات ئەوەیە كە شادمان هەڵس و كەوت بكات و لەجیاتی ئەوەی خۆشەویستی و هەستەكانی لەتاڵی و ڕووترشیدا خەسار بكات بیدات بە دەوروبەرەكەی.

ساڵانێك لەمەوبەر كتێبێكی بچووكم خوێندەوە كە كاریگەری زۆری لەسەر من هەبوو. ناوی كتێبەكە ((ئەندێشەی مرۆڤ)) لەنووسینی جیمز ئالێن بوو، كورتەیەك لەم كتێبە بەم جۆرە بوو:

((ئینسان بۆی دەردەكەوێت بە گۆڕینی ڕوانینی سەبارەت بەجیهان و كەسانی دەوروبەری ئەوانیش دەگۆڕێن....ئەگەر كەسێك بەشێوەی بناغەیی ئەندێشەكانی خۆی بگۆڕێت لەو گۆڕانانەی بەسەر ژیانی فیزیكی ئەودا دێن سەری سووڕ دەمێنێت. خەڵك ئەو شتەی كە دەیانەوێ ڕایناكێشن بۆ لای خۆیان، بەڵكو ئەو شتەی هەن ڕایدەكێشن. ئەو بالاّ سروشتەی چارەنووسی ئێمە دیاری دەكات خودی ئێمەین. هەرشتێك كەسێك بەدەستی دێنێت ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەندێشەكانی ئەوە. تەنیا ڕێگەیەك كە مرۆڤ

دەتوانن دەست بگەیەنێتە سەر کەوتن و دەسکەوت، بەرز کردنەوەی ئەندێشەکانیەتی و لەغەیری ئەمەدا لاوان، چارەڕەش و سووک دەمێنێتەوە)).

بەگوێرەی کتێبی خولقان، خواوەند مرۆڤی بەسەر هەموو زەویدا زاڵ کرد. ئەڵبەت من هیچ حەزم لەم شانسە گەورەیە نیە. تەنیا شتێك کەدەمەوێت زاڵ بوونە بەسەر خۆمدا. جاخاڵی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە دەزانم هەر ساتێك ئیرادە بکەم بەشێوەیەکی سەر سوورهێنەر دەتوانم ئەم زاڵ بوونە تەنیا بەدەسەڵاتی کردەوەکانم بەدەست بهێنم. وەرن بادیسان بەوتەکانی ویلیام جیمزدا بچینەوە: ((زۆربەی ئەو شتەی ناوی دەنێین ناپاکی و ئەهریمەن، دەتوانین بە گۆڕینی ساکار لەڕوانینی ئەو کەسەی ڕەنج لەم ناپاکیانە دەبات، لەڕوانینی ترسنۆکانە بۆ ڕوانینێکی خەباتکارانە، بۆ چاکە بگۆڕین)).

وەرن بۆ کامەرانیمان خەبات بکەین.

وەرن بە پێڕەوی کردن لەعادەتی ڕۆژانەی هەڵس و کەوتی شادمان و ئەندێشەی بنیاتنەر بۆ بەختەوەری و شادمانیمان خەبات بکەین.

ئێستا سەرنج بدەنە ئەم بەرنامە ڕۆژانەیە. ناوی ((تەنیا بۆ ئەمڕۆ))یە و ئەوەندە بەسوودە کەمن سەدان بەرگ لەوەم چاپ کردووە و بڵاوم کردووەتەوە. بەسوود وەرگرتن لەم بەرنامەیە دەتوانین زۆر بەی نیگەرانیەکانمان کەم بکەینەوە و بەشی خۆمان لەشادی دنیا زیاد بکەین.

## ((تەنیا بۆ ئەمڕۆ))

١- تەنیا بۆ ئەمڕۆکە شاد دەبم. شادی لەدەروونەوە هەڵدەقوڵێت نەك لەڕووداوی دەرەکیەوە.

٢- تەنیا بۆ ئەمڕۆ هەوڵ ئەدەم خۆم لەگەڵ دەورووبەری خۆم بگونجێنم و هەوڵ ئەدەم دەورووبەرم وەکو خواست و ئارەزووی خۆم لێبکەم. خێزان، پیشە و بەختم هەروا کەهەن وەردەگرم و لەگەڵیاندا خۆم دەگونجێنم.

٣- تەنیا بۆ ئەمڕۆ خۆم پارێزگاری لە جەستەم دەکەم تاکو لەو پەڕی تەندروستیدا کار بکات.

٤- تەنیا بۆ ئەمڕۆ هەوڵ ئەدەم مێشکم بەهێز بکەم. شتێکی نوێ فێر دەبم. مێشکم بێ کار بەرەڵا ناکەم. شتێك دەخوێنمەوە کە پێویستی بەهەوڵدان بێت.



 

٥- تەنیا بۆ ئەمڕۆ بە دوو شێوە ڕاهێنان بە ڕۆحم دەکەم: بێ ئەوەی کەس بزانێت بۆ کەسێك کارێکی خێر دەکەم. لانی دوو شت کەنامەوێت ئەنجامی ئەدەم.

٦- تەنیا بۆ ئەمڕۆ بەهەیبەت، جوانپۆش و ڕووخۆش ئەبم. جوان جل لەبەر دەکەم، بەئارامی قسەدەکەم، بە ئەدەبەوە هەڵس و کەوت دەکەم. ئافەرین بە خەڵك دەڵێم و ڕەخنەیان لێناگرم و هەوڵی گۆڕین یان ڕێکخستنی خەڵك نادەم.

٧- تەنیا بۆ ئەمڕۆ هەوڵ ئەدەم ئەمڕۆ ژیان بکەم و نامەوێ کێشەکانی ژیان پێکەوە چارەسەر بکەم.

٨- تەنیا بۆ ئەمڕۆ بەرنامەیەکم دەبێ و ئەو کارانەی دەمەوێ ئەنجامی بدەم دیاری دەکەم.ئەگەر پێڕەویشی لێ نەکەم ئەوەم دەبێ و دوو ئافەتی پەلەکردن و دوودڵی لەخۆم دوور دەخەمەوە.

٩- تەنیا بۆ ئەمڕۆ نیو کاتژمێر بۆ خۆم دادەنێم و دەحەسێمەوە. لەم نیو کاتژمێرەدا بیر لەخودا ئەکەمەوە هەتا ڕوانینێکی قووڵتر بۆ ژیان پەیدا بکەم.

١٠- تەنیا بۆ ئەمڕۆ لەشادی، چێژو عەشق ناترسم و بڕوا دەهێنم ئەوانەی خۆشم دەوێن منیان خۆش دەوێت.

## یاسای یەکەم بۆ بەدەستهێنانی ڕوانگەیەکی بنیاتنەر:

بەشادی بیر بکەنەوە و هەڵس و کەوت بکەن تاکو هەست بەشادمانی و وزە بکەن.

بابەتی دووەم

## زیـــــــانەکانی نەفــــــــرەت.

چەند ساڵ لەمەوبەر لە پارکی یەلوستۆن شەوێک لەگەڵ کۆمەڵێک گەشتیاردا لەبەرامبەر درەختە سنەوبەرو کاجەکان دانیشتبووین و چاوەڕێی بینینی بوونەوەرێکی ترسناک واتە ورچی گریزلی بووین. کوتوپڕ ورچی گریزلی لەناو درەختەکانەوە هاتە دەرو بەرەو لای ئەو زبڵانەی چێشتخانەی پارک کەدانرابوو ڕۆیشت. پاسەوانێکی دارستان کەلەسەر ئەسپێک بوو دەربارەی ئەم ورچە چەند پێناسەیەکی کرد. ئەو وتی ورچی گریزلی ئەوەندە بەهێزە کەدەتوانێ تەواوی ئاژەڵانی دنیای ڕۆژئاوا ببەزێنێت بێجگە لەبۆ فالۆ و لەوانەیشە ورچی کودیاک ببەزێنێت. ئەو شتەی سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوە بوو کەتەنیا ئاژەڵێک کە لەلایەن ورچی گریزلیەوە ڕێگەی پێدرابوو خواردنی لەگەڵ بخوات ئیسکانکێک بوو. ئەڵبەت ورچیش دەیزانی دەتوانێ بە چەپۆکێک ئیسکانکەکە بکوژێت بەلام تەجرەبە فێری ئەوی کردبوو ئیسکانک بایی ئەو چەپۆکە ناهێنێت. منیش کاتێک منداڵ بووم لەدەوری پەرژینی کێڵگەکەمان ڕوو بەڕووی ئیسکانکی چوارپێ و پاشان کە گەورەبووم لەکوچەو کۆڵاندا ئیسکانکی دووپێ بوومەوە. تەجرەبەی تاڵ ئەوەی پیشانی منداوە کەنابێ لەبەرامبەر هیچ کامیاندا کاردانەوەم هەبێت.



کاتێک نەفرەتمان لەدوژمنی خۆمان هەبێت هێزی پێ ئەدەین تاکو خەو، ئیشتیاو پاڵەپەستۆی خوێن و تەندروستی و شادیمان بخاتە ژێر کاریگەریەوە. ئەگەر دوژمنانی ئێمە تێبگەن تا چ ڕادەیەک بوونەتە هۆی نیگەرانی و ئازادی ئێمە لەخۆشیدا هەڵدەپەڕن. نەفرەتی ئێمە زیانێک بەوان ناگەیەنێت بەڵکو شەوو ڕۆژی خۆمان دەکاتە حاڵەتێکی دۆزەخی.

بەبۆچوونی ئێوە ئەم وتەیە لەزمانی کێوەیە:(( ئەگەر کەسانی مەسلەحەت چی دەیانەوێ سوودتان لێوەربگرن پێوەندیتان ببڕن، بەڵام نەفرەتتان بەرامبەریان نەبێت. چونکە بەنەفرەت زیاتر لەوان زیان بەخۆتان ئەگەیەنن )).لەوانەیە بڵێن ئەمە قسەی کەسێکی ئایدیالیستە، بەڵام وانیە. ئەمە وتەیەکە لەسەر دەرگای فەرمانگەی پۆلیسی میلواکی نووسراوەو دەتوانن بیخوێننەوە.

نەفرەت چۆن زیان بە ئێوە دەگەیەنێت؟ بەشێوەی جۆراوجۆر. بەپێی گۆڤاری لایف، تایبەتمەندی کەسایەتی ئەو کەسانەی تووشی پاڵەپەستۆی خوێنن ڕقو توورەییە. کاتێک ڕقو توڕەیی دەبێتە هەمیشەیی، پاڵەپەستۆی خوێنو نەخۆشی دڵیش بەشێوەی هەمیشەیی دەردەکەوێت.

کەواتە دەبینن کاتێک عیسای مەسیح دەیوت: (( دوژمنانی خۆتان خۆش بوێت )) تەنیا وتاری ئەخلاقی نەدەخوێندەوە بەڵکو خەریک بوو بنەماکانی پزیشکی سەدەی بیستەمیشی بەیان دەکرد. کاتێک باسی لەلێبووردن دەکرد فێری دەکردین چۆن لەنەخۆشی پاڵەپەستۆی خوێن، نەخۆشی دڵو برینی گەدە خۆمان بەدوور بگرین.

یەکێک لەهاوڕێکانی من لەم ماوەدا جەڵدە لێیدا. پزیشک بەوی وت لەجێگەدا بخەوێتو بۆ هیچ شتێک توورە نەبێت.

پزیشکەکان دەزانن کاتێک دڵتان بێ هێزە یەک شتی عەسەبیو توورەیی دەتوانێ بتانکوژێت؟ وتەکەم ڕاست دەکەمەوە چونکە لەواشینگتۆن خاوەن ڕیستۆرانێکی کوشت. لەنامەیەکدا کە سەرۆکی پۆلیسی واشینگتۆن بۆی نووسیبووم هاتووە:((ئەم خاوەن ڕیستورانە لەبەر دەمەقاڵەیەک کە لەگەڵ چێشت لێنەرێکدا کە هەمیشە بەپیاڵەکەی ئەو قاوەی دەخواردەوە ئەوەندە توورە بوو کە بەدەمانچەکەی بەدوای چێشت لێنەرەکەدا دەستی کرد بەهەڵهاتن. ئەم پیاوە(٦٨) ساڵەیە هەر لەوێدا دڵی وەستاو مرد. بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوە لەمەرگە گوماناوییەکان ڕایگەیاند کە توورەییو ڕق بووەتە هۆی وەستانی دڵ)). کاتێک مەسیح دەیوت دوژمنانی خۆتان خۆش بوێت بێ گومان دەیوت تەنانەت دەکرێ بەم کارە جوانتر بن! هەمووومان ژنانێک دەناسین کە لەتاو توورەییو نەفرەتو ڕوو گرژی ڕوخساریان ئەوەندە چرچو تێک ترشاوە کەتەنانەت تەواوی چارەسەرە جوانکارییەکانیش جوانیان ناکات. تەنیا ڕێگا دڵێکی پڕلەسۆزو خۆشەویستیو لێبووردەییە.

ئەفرەت دەبێتە هۆی ئەوەی چێژی خواردن لەدەست بدەین. لەئینجیلدا هاتووە: ((خواردنی سەوزە لەشوێنێك کە عیشق هەیە، خۆشترە لەخواردنی گۆشتی برژاو لەشوێنێك کە ئەفرەت هەیە)).

ئایا دوژمنانی ئێمە لەبیستنی ئەوەی کەئەفرەتی ئێمە خەریکە دەمانپووکێنێتەوە خۆشحاڵ نابن، تەنانەت ئەگەر نەتوانین دوژمنەکانیشمان خۆش بوێت وەرن لانی کەم خۆمانخۆش بوێت. وەرن بائەوەندە خۆمان خۆش بوێت کە ڕێگە نەدەین ئەفرەتی ئێمە بەنیسبەتی دوژمنانمانەوە شادیو تەندروستیو ڕوخسارمان تێك بدات. شیکسپیر دەڵێ: ((بۆ سووتاندنی دوژمن کورە ئەوەندە گەرم مەکەن کە خۆتان بسووتێنێت)).

بابەسەرهاتی بەڕێز ((جۆرج ڕۆنا)) تان بۆ بگێڕمەوە. ئەو لەڤیەنا پارێزەر بوو بەڵام لەکاتی شەڕی دووەمدا هەڵهات بۆ سوید.لەوێ هیچ پارەی نەبوو، زۆر پێویستی بەکار هەبوو. بەهۆی ئەوەی دەیتوانی بە چەند زمان بنوسێتو بخوێنێتەوە، هیوادار بوو کارێکی وەکو وەرگێڕیی لەکۆمپانیایەکی هاوەردەو هەناردەدا بدۆزێتەوە. زۆربەی کۆمپانیاکان وەڵامیان نەدایەوە لەبەر شەڕ پێویستیان بەخزمەتێکی ئاوانیە، بەڵام ناوی دەنووسن. یەك ئەفەر نامەیەکی بەم شێوەیە بۆ نووسی: ((ئێوە دەربارەی کاری من چۆن بیر دەکەنەوە؟ من پێویستم بە وەرگێڕ نیە. ئەگەریش بمبوایە تۆم دادەمەزراند، چونکە سویدی نازانیت.نامەکەت پڕە لەهەڵە)).

خوێندنەوەی ئەم نامەیە جۆرج ڕۆنای ئەوەندە تووڕە کردبوو کە دەستی کرد بەنووسینی نامەیەك کە قەرار بوو وەڵامێکی توند بێت بۆ ئەو کابرا سویدییە، بەڵام بۆ ساتێك وەستامو بەخۆم وت: (( لەکوێوە دەزانی ئەو ڕاست ناکات؟ ڕاستە من سویدیم خوێندووە بەڵام لەبەر ئەوەی زمانی سەرەکی من نیە لەوانەیە هەڵەیشم بووبێت کە خۆم لێیان بێ ئاگام. باشتر وایە ئەگەر ئەمەوێت کارێك بەدەست بهێنم باشتر بخوێنمەوە. ئەگەر شێوەی قسەکردنی ئەو ناخۆش بوو نابێتە هۆی ئەوەی مەمنوونی نەبم. باشتر وایە نامەیەکی سوپاس گوزاری بۆ بنووسم)).

بۆیە جۆرج ڕۆنا نامە پێشووەکەی دڕاندو نامەیەکی تازەی بەم ناوەڕۆکەوە نووسی: (( زۆرت لێ مەمنوونم کە زەحمەتت کێشاوەو لەگەڵ ئەوەی پێویستت بە وەرگێڕ نەبوو نامەت بۆ نووسیم. بەداخەوەم کە فیکرەکەم دەربارەی کۆمپانیای ئێوە هەڵە بوو. ڕاستیەکەی ئەوە بوو من لەپاش پرسو ڕاناوی ئێوەم وەکو یەکێك

لەپێشڕەوانی ئەم بوارە دەست کەوت و لەو ڕووەوە ئەم نامەیەم بۆ نوسیت. هیچ ئاگاداری هەڵەکانم نەبووم و لەم ڕووەوە زۆر لەخۆم شەرمەزارم. هەوڵ ئەدەم بەجیدییەتێکی زیاترەوە زمانی سویدی بخوێنمەوە. زۆر سوپاس گوزارم کەبوونە هۆی ئەوەی من لەڕێگەی باش بوونی وەزعەکەدا هەنگاو بنێم)).

چەند ڕۆژ دوای ئەوە ئەو پیاوە داوای دیداری لەڕۆنا کردو ڕۆنا لەوێ دامەزرا. ئەو باش تێگەیشتبووکە ((وەڵامی نەرم تووڕەیی دوور دەخاتەوە)). لەوانەیە ئەوەندە چاک نەبین کە دوژمنانمان خۆش بوێت، بەڵام دەتوانین لەبەر تەندروستی و شادی خۆمان لێیان ببوورین و فەرامۆشیان بکەین.

کونفۆشیۆس دەڵێت: (( دزی لێکران یان حەق فەوتان تەنیا کاتێك ئازاردەرە کە بەردەوام ئەوانە لەمێشکتدا زیندوو بکەیتەوە)). ڕۆژێك پرسیارم لەکوڕی ژەنراڵ ئایزنهاوەر کرد: ((ئایا باوکت ڕق و نەفرەت لەخۆیدا دروست دەکات؟)) وەڵامی دامەوە: ((هەرگیز، ئەو یەك خولەکیش بۆ بیرکردنەوە لەو کەسانەی خۆشی ناوێن، تەرخان ناکات)).

پەندێکی کۆن دەڵێت: (( کەسێك کە ناتوانێت تووڕەبێت بێ عەقڵەو کەسێك تووڕە نابێ عاقڵە)). جارێك لەبێرنارد باڕۆك، پیاوی جێ متمانەی شەش سەرۆك کۆماری ئەمریکام پرسیار کرد: ((ئایا تا ئێستا هێرشی دوژمنەکانت زیانی بەتۆ گەیاندووە؟)) وەڵامی دایەوە: (( هیچ کەس ناتوانێ من سووك بکات یان ئازارم بدات. ڕێگەی ئەو کارە بەهیچ کەس نادەم)). سەبارەت بەمن و ئێوەیش هەربەو جۆرەیە. ئەگەر خۆمان ڕێگە نەدەین هیچ کەس ناتوانێت ئێمە سووك و لاواز بکات.

(( داروبەرد ئێسکەکانم دەشکێنن بەڵام وشەکان هەرگیز من لاواز ناکەن)).

زۆر جار دەچم بۆ پارکی نەتەوەیی جاسپەر لەکەنەداو بۆ سەیری یەکێك لەجوانترین چیاکانی جیهانی ڕۆژئاوا دەوەستم. ئەم چیایە بەشانازی سیستەرێك ناوی ((ئەدیت کارۆل))ی لێنراوە. ئەم پرسیارە لە (٢٢)ی ئۆکتۆبەری ١٩١٥وەکو قیدسێك لەبەرامبەر دەستەی تیربارانی ئەڵمانیەکاندا وەستا. تاوانی ئەو ئەوە بوو ئاگاداری لەسەربازانی فەرەنسی و بەریتانی لەخانووە بەلژیکیەکەی خۆیدا دەکردو ئەوانی دەگەیاندە هۆڵەندا. بەیانی ئەو ڕۆژەی مانگی ئۆکتۆبەر قەشە بۆ ئامادەکردنی بۆ تیرباران چوو بۆلای. ئەدیت دوو ڕستەی وت کە تائەمڕۆکە لەژێر پەیکەری

مۆنـۆمێنتی ئـەو لەلەنـدەن بـە بـرنج و گرانێـت پـارێزراوەو هـەمووان دەخاتـە ژێـر کاریگەرییەوە.

ئەو وتی:((تێگەیشتووم کە نیشتمان پەروەری بەس نیە. نابێ هیچ رق و نەفرەتێکم لـەهیچ کـەس هـەبێت)). یـەکێك لـەڕێگاکانی لێبووردن و فـەرامۆش کردنـی دوژمنـان ئەوەیـە کـە خۆمـان لـەئامانجێکی گـەورەترو مـەزنتردا نـوقم بکـەین. لـەم حاڵەتـەدا سـووکایەتی و دوژمنایەتیـەکان ئێمـە ئـازار نـادەن چـونکە ئێمـە هـەموو شـتێك لەبەر ئامانجە گەورەکەمان فەرامۆش دەکـەین. بابەسـەر هـاتێکی یـەکجار پڕ کێشەتان بۆ بگێڕمەوە:

لەگەرمـەی شـەڕی یەکـەمی جیهانیـدا لەئـەمریکا دەنگۆیـەك بڵاو بووەوە بەمجۆرەکە ئەڵمانیەکان لەگەڵ ڕەش پێستاندا هاودەستیان کردووەو ئەوان لـەدژی سپییەکان هـان ئـەدەن. لارنـس جـۆنز مامۆسـتایەکی ڕەش پێـست کـە لـەزانکۆی ئیـۆوا خوێنـدبووی کـەوتبووە بـەر گومـانی سـپی پێـستەکان. ڕۆژێـك کـە ئـەو لەکلێـسایەك وتاربێـژی بـۆ ڕەشـەکان دەکرد وتـی: ((ژیـان دارسـتانێکە هـەر رەش پێستێك دەبـێ بـە هـەر چەکێك بچێتە شەڕی)).. سپییەکان بەبیستنی وشەی چەك و شەڕ قەڵس بوو ئەویان کێشکرد تاکو هەم هەڵیواسن و هەم بیسووتێنن..لەم ناوەدا پیرە پیاوێك وتی باشتر وایە گوێ لەوتەکانی بگرین و جۆنز دەربارەی ئامانجەکەی کە یارمەتیدانی نەخوێنـدەواران بوو قسەی کرد. ئەو باسی لـەو سپی پێستانەکرد کە یارمەتی ئەویان دابوو بخوێنێت.. وتەکانی ئەو خەڵکی ئارام کردەوە. ئەو دامەزرێنەری قوتابخانەی لانس جۆنز بوو کە ئەمرۆکە لەئەمریکا زۆر بەناوبانگە.

ئۆپتیکۆس دەڵێت: ((سەرەنجام هـەر کەسێك ئاکامی خراپەکارییەکان دەبینێتەوە. ئەگەر ئەمە بزانین چیتر کەس تووڕەیی، ئێرەیی، تۆڵەو سووکایەتی و لێپێچینەوە بۆ هیچ کەسی تر بەڕەوا نازانێ))..

لەمێژووی ئـەمریکادا هـیچ کـەس بـە ئەنـدازەی لینکـۆڵن جێـی نـەفرەت و خەیانـەت نەبووە، بـەڵام بەوتـەی شایەتحاڵ نووسان ئەو هـەرگیز سەبارەت بە کەسەکان بەپێی نەفرەت یان خۆشەویستی دادوەریی نەدەکرد. ئەو دەیزانی فڵان کارە دوژمنەکەیشی دەتوانێ بەباشی ئەنجامی بدات.

ئەگەر بیدیایە کەسێك کە ئەوی ئازار داوە یان سوکایەتی بەو کردووە، شایستەی پلەو مەقامێکە لەسپاردنی ئەو مەقامە بەو هیچ گلەیی نەدەکرد. هەرگیز نەبینرا ئەو بەهۆی بۆچوونی تایبەتی خۆیەوە کەسێك لەسەر کار لابەرێت. هەندێك لەو کەسانەی ئەو بۆ پلەوپایەی گرنگ دایناببوون بە توندی رقیان لەو دەخواردەوەو رەخنەو سووکایەتیان پێدەکرد. بەلام ئەو دەیوت: ((نابێ کەسێك بەهۆی کارێکەوە کە کردوویەتی یان نەیکردووە ستایش یان رەخنەی لێ بگیرێت. ئێمە هەمووی دروست بووی هەل‌ومەرج‌و، رووداوەکان، خوێندەواری، خوو ویراسەین، ئەمانە مرۆڤ دروست دەکەن‌و تا هەتاهەتایە هەروا دەبێت))..

ئەو راست دەکات ئەگەر ئێمەش کوت‌ومت هەر بەو هەل‌ومەرجە جەستەیی‌و رۆحییەی دوژمنانمانەوە دروست بووینایەو هەمان هەل‌ومەرجمان تێپەڕاندبا بێگومان وەکو ئەوان هەلس‌وکەوتمان دەکرد. واتە نەماندەتوانی جۆرێکی تر بین، وەرن باخێرخوازی خەلك بین‌و ئەم دوعایەی سورپێستەکان بلێینەوە: ((ئەی رۆحی مەزن! هەتا دوو هەفتە لەجێی کەسێك نەبم، مەهێلە دادگەری لەبارەوە بکەم)) شوکری خودا بکەین کە بارودۆخی ژیان ئێمەی وەکو دوژمنان دروست نەکردووە. لەجیاتی ئەوەی سەبارەت بە دوژمنانمان رق‌و تولە بگرینە دل با دوعایان بۆ بکەین‌و هاودەردی‌و کۆمەك‌و لێبوردەییان پێشکەش بکەین.. لەبیرمە هەموو شەوێك باوکم ئەم رستانەی مەسیحی دەوتەوە: ((دوژمنانتان خۆش بوێت. بۆ ئەوانەی نەفرەت لەئێوە دەکەن داوای بەخشش بکەن. چاکە لەگەل ئەوانەدا بکەن کە نەفرەتیان لێتان هەیەو دوعا بۆ ئەوانە بکەن کەستەم‌و ئەشکەنجە بۆ ئێوە بەرەوا دەزانن))..

وەرن با نەفرەتمان لەدوژمنانمان نەبێت، چونکە زیاتر لەوان زیان بەخۆمان ئەگەیەنین. وەرن با خولەکێکیش بۆ بیرکردنەوە لەوانەی خۆشمان ناوێن بەفیرۆ نەدەین.

بابەتی سێهەم

بەئەنجامی ئەم کارە لەناسپاسی دلتان نایەشێت

لەم ماوەدا لەگەل خاوەن کارگەیەکی گەورە دیدارم کرد کە دلی لەناسپاسی خەلك زۆر پڕ بوو.. بە منیان وتبوو چارەکێك لەمەوبەر لەوبارەیەوە قسەی کردبوو، هەرواش بوو. ئەم رووداوە (١١) مانگ لەمەوبەر روویدا. ئەو پارەیەکی زۆری وەکو جەژنانە

دابوو بەکرێکارەکانی بەڵام هیچ سپاسیان نەکردبوو، هێشتا لەپاش (١١) مانگ لەم بابەتە زیاتر نەیدەتوانی سەبارەت بە هیچی تر قسە بکات.. لەوەی یەک دۆلاریشی پێدابوون پەشمان بوو..

کۆنفۆشیۆس دەڵێ: ((ئینسانی تووڕە بەردەوام پڕ لەژەهرە، ئەم پیاوە (٦٠) ساڵ ئەوەندە ژەهراوی بوو کە بەزەییم پیای هات. بە حیسابە کۆمپانیاکانی دابینکەری تەمەن ئێمە بە شێوەی مامناوەندی تا (٨٠) ساڵی دەژین، واتە ئەم پیاوە لەباشترین حاڵەتدا (١٤) یان (١٥) ساڵی تر دەژی و یەک ساڵ لەوەی ئاوا بەهۆی شتێکەوە کە روویداوەو تەواوبووە خەسار دەکات. باشتر وابوو لەجیاتی نەفرەت و سەرزەنشت پرسیاری لەخۆی بکردایە بۆچی کەس سوپاسی ئەوی نەکرد. لەوانەیە کرێکارەکانی لەڕادەبەدەر بگرتایەتە بەرکار. لەوانەیە دەرماڵەیان کەم بوو یان بیریان نەکردبووە جەژنانە ئەرکە نەک دیاری. لەوانەیە ئەوەندە رووگرژ بوو بێت کە کەس نەیدەوێرا بۆ سوپاسکردنیشی لەو نزیک بێتەوە یان لەوانەیە بیریان کردبووەتەوە بۆیە ئەم بڕە پارەی داوە بەوان هەتاوەکو باج نەیدا بەدارایی.. لەوانەیشە کرێکارەکان بێ ئەدەبو خۆبەزلزان بوون، یان ئەمە، یان ئەوە))..

منیش لەئێوە زیاتر لەم بابەتە نازانم بەڵام سامۆئیل جانسۆن دەڵێت: ((سوپاس میوەیەکە کە لەخاکی بە پیت و ئاگاداری زۆرەوە بەرهەم دێت. لەناو کەسانی هەرزەدا ناتوانین بیبینین)).. مەبەستم ئەوەیە کە ئەو خاوەن کارگەیە هەڵەیەکی مرۆیی و بێزارکەری کرد، واتە چاوەڕوانی سپاس و پێزانین لەخەڵك. دەڵێیت ئەو زاتی مرۆڤی نەناسیوە..

ئەگەر ئێوە ژیانی کەسێك نەجات بدەن ئایا چاوەڕوانی پێزانین و سوپاسن؟ پێدەچێت وابێت. بەڵام سامۆئیل لیبۆویتز کە پارێزەرێکی تاوانی کوشتن بوو ژیانی (٧٨) کەسی لەبەرامبەر دانیشتن لەسەر کورسی کارەبایی ڕزگار کرد، بەڵام هیچ کام لەوانە زەحمەتی بەخۆی نەدا سپاسی بکات. عیسای مەسیح (١٠)کەسی گولی لەئێوارەی یەك ڕۆژدا ڕزگار کرد، بەڵام تەنیا یەك کەسیان سوپاسگوزاری لێکرد. ئەو پرسیاری لەحەوارییەکان کرد ئەی ئەوانی تر لەکوێن؟ هەموویان بەبێ سوپاسگوزاری هەڵهاتبوون بۆ ماڵەوە. ئایا لەبەرامبەری ئەو چاکە بچووکانەی ئەنجامی ئەدەین دەبێ چاوەڕوانی وەرگرتنی سوپاس و پێزانین بین زیاتر لەوەی مەسیح وەریگرت؟

کاتێك دەگەینە کاروباری مادە، وەزعەکە خراپتریش دەبێ. ئەگەر تۆیەك ملیۆن دۆلار یارمەتی یەکێك لەناسراوەکانتان بەن چاوەڕوانی سوپاسگوزارین؟ باشە، براکەی من ئەو کارەی کردو ئەو ناسراوە بۆ ماوەیەك سوپاسگوزاری ئەو بوو. بەلام ئەگەر براکەم لەو دنیا بگەڕێتەوە دەبینێت هەر ئەو کەسە لەبەر ئەوەی ئەو(٣٥) ملیۆن دۆلاری بۆ کاری خێری بەسوود بۆ کۆمەل خەرج کردووە، بەردەوام نەفرینی ئەو دەکات.

باشتر وایە عاقڵو حەقیقەت بین بین. زاتی مرۆڤ ئاوایەو قەراریش نیە بگۆڕێت. مارکۆس ئورلیوس لەدەفتەری بیرەوەریەکانیدا ئاوای نووسیوە:((ئەمڕۆ دەچم بۆ دیدار خەڵکێك کە زۆر دەڵێن، خۆبەزلزانن، خۆخوازنو سپڵەن. بەلام لەبینینیان سەرم سووڕنامێنێ چونکە دنیایەك بەبێ ئەوان بۆم دیمانە ناکرێت)).

یەکەم خاڵێك دەمەوێت لەم بابەتەدا باسی لێوەبکەم ئەمەیە: زۆر ئاساییە کە مرۆڤ سوپاسگوزاری فەرامۆش بکات. ئەگەر ئێمە بەردەوام گلەیی لەم شتە بکەین خۆمان ئازاردەوە. پیرەژنێك دەناسم بەردەوام گلەیی لەتەنیایی دەکات. هیچ کام لەناسراوەکانی حەزیان لەدیداری نیە. دەزانن بۆ؟ چونکە هەرکات کەسێك دەچێت بۆ دیداری پیرەژنەکە چەند کاتژمێرێ دەربارەی ئەو چاکانەی ئەو بۆ براو خوشکەزاکانی کردوویەتی قسەدەکاتو پیاو وەڕەز دەکات. ئایا ئەم براو خوشکەزایانە دەچن بۆ دیداری ئەو؟ بەڵێ. جاری وایە لەڕووی هەستی بەر پرسیاریەتییەوە ئەم کارە دەکەن، بەلام نەفرەتیان لەم دیدارانە هەیە. کاتێك ئەو بەتەواوی لێپێچینەوەو سەرزەنشتو ناچارکردنەکان ناتوانێت کەسانی دەوروبەری بەلای خۆیدا ڕاکێشێت تووشی نەخۆشی دڵ دەبێتو پزیشکەکان دەڵێن بەهۆی ئەوەی کێشەکەی ئەو هەستیە هیچ کارێکی لەگەڵ ناکرێت. ئەو شتەی ئەم

پیرەژنە پێویستی پێیەتی خۆشەویستیو سەرنجە، بەلام ئەو ئەمە بەپێزانینو سوپاسگوزاری ناودەباتو چونکە داوای دەکاتو هەست دەکات حەقی خۆیەتی هەرگیز بەدەستی ناهێنێت. هەزاران کەس وەکو ئەم ژنە هەنو تەنیا ڕێگەچارە ئەوەیە کەدەست لەداواکاری هەڵبگرنو بێ هیچ چاوەڕوانیەك خەڵکیان خۆش بوێت.

ئایا ئەم وتەیە بەبڕوای ئێوە ئایدیالستیە؟ نا، وانیە. عەقڵی سەلیم حوکمی ئەمە دەکاتو ڕێگەیەکی باشە دەست پەیداکردن بەو شادییە دەمانەوێت. ئەمەم بەتەجرەبە



 

لەماڵی خۆمدا بینیوە. دایکم و باوکم بەردەوام بۆ شادی خەڵک بەخششیان دەکرد. خۆمان هەژار بووین و زۆربەی کات قەرزار بووین، بەڵام نەدەبووە ڕێگر لەوەی دایک و باوکم هەموو ساڵێك بڕێك پارە نەدەن بەهەتیو خانە. ئەوان چاوەڕوانی پێزانین نەبوون و لەدەروونەوە لەم کارە زۆر شادمان دەبوون. لەپاش ئەوەی گەورە بووم و ماڵەوەم بەجێ هێشت، هەموو ساڵێك لەپێش کریسمەسدا پارەیەکم دەنارد بۆ دایك و باوکم تاکو خەرجی ئاسایشی خۆیانی بکەن بەڵام ئەوان زۆربەی کات ئەم پارەیان بۆ کڕینی پێداویستی کەسانی تر خەرج دەکرد. ئەوان لەم ڕێگەوە چێژی یارمەتیدانی بێ چاوەڕوانیان لەدەروونی خۆیاندا وەردەگرت.

ئەرەستۆ دەڵێت:((کەسی نموونە بەردەوام چێژ لەیارمەتیدانی خەڵك وەردەگرێت و لەوەی خەڵك یارمەتی ئەو بدەن شەرم دەیگرێت چونکە چاکە کردن نیشانەی گەورەییە و وەرگرتنی چاکە نیشانەی بچووکی)). باوکی منیش وەکو ئەم کەسە نموونەی ئەرەستۆ وابوو.

خاڵی دووەم کە دەمەوێت لەم بەشەدا ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە: ئەگەر بەشوێن شادمانی و ڕەزامەندییەوەین باشتر وایە بیر لەپێزانین یان سوپاسگوزاری نەکەینەوە و لەبەر چێژی دەروونی یارمەتیدان ئەم کارە بکەین.

بەردەوام دایك و باوکم لەبێ سوپاسی منداڵان گلەییان کردووە. تەنانەت شالیر دەڵێت:((منداڵی ناسوپاس لەژەهری مار ناخۆشترە)). بەڵام بەڕاستی منداڵان بۆ دەبێ سوپاسگوزاربن، ئەگەر ئێمە ئەوانمان بەو شێوەیە پەروەردە نەکردووە؟

ناسوپاسی وەکو گیای بژار وایە و سوپاسگوزاری وەکو گوڵێکی سوور پێویستی بەپەروەردەیە پیاوێك دەناسم کە هۆکاری تەواوی بۆ گلەیی کردن لەناسوپاسی زۆر منداڵەکانی هەیە.

ئەو لەکارگەیەکی کارتۆن سازیدا زۆری زەحمەت دەکێشا و پارەیەکی کەمی بەدەست دەهێنا. لەگەڵ بێوە ژنێکدا هاوسەرگیری کرد و ئەو بێوەژنە ناچاری کرد پارەیەك بۆ ناردنی دووکوڕەکەی بۆ زانکۆ قەرز بکات. بەو دەرماڵە کەمەیەوە هەم دەبوا خەرجی ژیانی بکردایە و هەم قەرزەکەی بدایەتەوە، بەڵام هەرگیز گلەیی نەکرد. کەسیش سوپاسی ئەوی نەکرد. نەهاوسەرەکەی و نە زڕکوڕەکانی. ئەوان ئەم کارەیان وەکو ئەرك زانیبوو. کێ دەبێ سەرزەنشت بکرێت؟ کوڕەکان؟ بەڵێ، بەڵام دایکیان

زیاتر لەوان شایستەی سەرزەنشتە. ئەو نەیدەویست کوڕە گەنجەکانی هەستی قەرزارییان هەبێت، هەر بەو هۆیەوە سوپاسگوزاری بەخۆی و بەوان فێرنەکرد.

. وەرن با لەبیرمان بێت بۆ پەروەردەکردنی مندالآنی قەدرزان خۆمان سەرەتا کەسانێکی قەدرزان بین. لەبیرمان بێت کە مندالآن زوو فێردەبن، کەواتە ئاگامان لەقسەکانمان بێت و چیتر لەبەرچاوی مندالآندا چاکەی کەس بەکەم نەزانین. بەپێچەوانەوە چاکە بچووکەکانی خەڵك بەقەدرو پێزانین وەلآم بدەینەوە هەتا مندالآنمان فێربن و ئەم کارە لەواندا ببێتە عادەت.

## یاسای سێهەم بۆخۆپاراستن لەئازاری ناسوپاسی.

١- بەردەوام چاوەڕوانی ناسوپاسی بن و لەوە بێزار مەبن. لەبیرتان بێت یەك لەو(١٠) کەسە گولەی بەدەستی مەسیح شیفادران سوپاسی ئەویان کرد. زیاتر لەمەسیح چاوەڕوانی پێزانین نەبین.

٢- لەبیرمان بێت کە ڕێگەی ڕەزامەندی و خۆشبەختی داواکردنی قەدرزانی نیە. بەڵکو یارمەتی و بەخشش بۆ چێژی دەروونی ئەو.

٣- قەدرزانی تایبەتمەندییەکی دەسکەوتیە، کەواتە ئەگەر منداڵی قەدرزانمان دەوێت دەبێ فێریان بکەین.

بابەتی چوارەم

## ئایا ئامادەن ئەو شتەی هەتانە بەیەك ملیۆن دۆلار بیفرۆشن؟

سالآنێکی زۆرە هارۆڵد ئەبووت دەناسم. ئەو لەوە پێش بەڕێوەبەری وتاربێژییەکانی من بوو. ڕۆژێك لەکانزاس سیتی ئەوم بینیو ئەو بە ئۆتۆمبیلەکەی منی گەیاندە کێڵگەکەمان. لەڕێدا پرسیارم لێکرد بەچ تەکنیکێك خۆی لەنیگەرانیو بێ تاقەتی دوور دەخاتەوەو ئەو داستانێکی سەرنج ڕاکێشی بۆ من گێڕایەوە:

((زەمانێك زۆر خۆم دەخواردەوە بەڵام ڕۆژێکی بەهاری لەساڵی (١٩٣٤)دا لەحاڵێکدا لەسەر جادەیەك پیاسەم دەکرد ڕووداوێکی سەیرم بۆ ڕێکەوت کەمنی لەناڕەحەتیەکان دوورستەوەوە. ئەم دیمەنە تەنیا چەند چرکەی خایاند بەڵام لەو چەند چرکەدا دەرسێکی گەورەم وەرگرت کە لەدەساڵی ڕابردوودا دەستم نەکەوتبوو. دوو ساڵ دوکانێکی خۆراکم بەڕێوەدەبرد بەڵام دوچاری قەرزی زۆر بوومو حەوت ساڵی تەواو بۆ دانەوەی قەرزەکانم کارم کرد. شەممەی پێشووی ئەو ڕۆژە دوکانەکەم داخستبوو تەواوی ئاواتەکانم، ئیرادەو باوەڕم دۆڕاندبوو. خەریك بوو بەرەو بانك دەڕۆیشتم هەتا پارەیەك بە قەرز وەرگرمو بچم بۆ کانزاس سیتی، بەڵکو کارێك پەیدا بکەم. هەروا کە بەجادەکەدا دەڕۆیشتم پیاوێکم بینی کە دوو قاچی نەبوو، لەسەر تەختەیەك کە چەرخی لەژێردا دانابوو دانیشتبوو، بەیارمەتی دوو دار لەسەر زەوی لێی دەخوڕی. بەپانتایی جادەکەدا پەڕییەوەو کاتێك دەیویست خۆی لەجۆگەکە بەرز بکاتەوە چاوی بەمن کەوت کە سەیرم دەکرد. بەبزەیەك وتی:((هەلەو. ڕۆژێکی خۆشە. وانیە؟)) بەبینینی ئەم دیمەنە لەوەی ئەوەندە خۆم بەدبەختو دۆڕاو دەبینی شەرمەزار بووم. ئەگەر ئەو بێ قاچ خۆشحاڵ بوو، بڕوا بەخۆ بوونی زۆر بوو، بێ گومان من بەقاچەوە دەمتوانی. چووم بۆ بانكو دوو بەرامبەری ئەو قەرزەی دەمویست داوام کرد. قەرزەکەم وەرگرتو هاتم بۆ کانزاس سیتیو کارێکی باشم پەیدا کرد)). جارێك پرسیارم لەئێدی ریکنباکەر کرد ئەو کاتە لەبەلەمە نەجاتەکاندا لەگەڵ هاوڕێکانی

(٢١) ڕۆژ لەزەریای ئارامدا سەرگەردانو بێ هیوا بوون گەورەترین دەرسێك فێر بوو چی بوو؟ وەڵامی دایەوە:((گەورەترین دەرسێك لەو(٢١) ڕۆژەدا فێربووم ئەوە بوو کە ئەگەر ئاوی خواردنەوەو خۆراکت هەبێت چیتر حەقت نیە گلەیی لەهیچ بکەیت)).

لەگۆڤاری تایمدا وتارێك دەربارەی مفەوەزێك چاپ کرابوو کە پارچەیەك بەر قورگی کەوتبوو. ئەو حەوت جار خوێنی بۆ گۆڕدرا. ڕۆژێك لە لەتەکاغەزێکدا بۆ پزیشکەکەی نووسی:

((ئایا زیندوو دەمێنم؟)) پزیشك وتی بەڵێ. دیسان نووسییەوە:((ئایا دەتوانم قسەبکەم؟)) وەڵامی پزیشك ئەمجارەیش بەڵێ بوو. مفەوەزەکە ئەمجارە نووسی:((باشە، کەواتە چیتر نیگەرانیم نیە)).

ئێوەیش دەتوانن هەرئێستا پرسیار لەخۆتان بکەن:((نیگەرانی چیم؟)) ئەمجا دەبینن کەهۆکاری نیگەرانیەکەی ئێوە بابەتێکی کەم بایەخە.

کەمو زۆر ٩٠٪ی ژیانی ئێمە لەجێی خۆیداو لەسەر حەقەو ١٠٪ی نابەجێیە. ئەگەر بمانەوێ شاد بین دەبێ تەرکیز بکەینە سەر ئەو٩٠٪ە و چاوپۆشی لەو ١٠٪ بکەینو ئەگەر توورەیی، ڕووگرژیو نەخۆشیمان دەوێت دەتوانین پێچەوانەی ئەم کارە ئەنجام بدەین واتە چاوپۆشی لە ٩٠٪ە کە بکەین. لەزۆربەی کڵێساکانی سەردەمی کرامویل لەبەریتانیا ئەم دوو وشە دەبینرێت:((بیربکەرەوەو شوکرانە بژێر بە)). دەبێ ئەم دوو وشەیە لەدڵیشماندا بنوسین. دەبێ بیر لەوشتە بکەینەوە کەهەمانەو شوکرانە بژێری پەروەردەگار بین لەبەر هەموو بەخششو نیعمەتەکانی.

جاناتان سوێفت، نووسەری ڕۆمانی گەشتەکانی گالیوێر، پڕ زیانترین کەسی ڕەشبینی ناو ئەدەبی بەریتانیا بووە. ئەو ئەوەندە لەلەدایك بوونی خۆی ناڕازی بوو کەساڵیادی لەدایك بوونی جلی ڕەشی دەپۆشیو بەڕۆژوو دەبوو. بەو حاڵەیشەوە ئەم کەسە ڕەشبینە بەردەوام هێزێکی وزە بەخشو شادمانی دەورووژاندو دەیوت:((باشترین پزیشکانی دنیا دوکتۆر ڕێژیم، دوکتۆر ئارامیو دوکتۆر شادین)).

ئێمەیش دەتوانین هەرکاتژمێرێك لەژیانمان بەخۆڕایی سوود لەخزمەتەکانی دوکتۆر شادی وەربگرینو ئەم کارە تەنیا بەئەندێشە دەربارەی ئەو نیعمەتانەی هەمانە، دەکرێت. نیعمەت گەلێك کە لەگەنجینەی ئەفسانەیی عەلی بابا بەنرخترن. ئایا بە ملیارەها دۆلار ئامادەن چاوەکانتان بفرۆشن؟ ئەی دەستو قاچو گوێو منداڵانو

خێزانەکەتان و دایك و باوکتان؟ دەبینن هیچ کەس نیعمەتەکانی خۆی لەگەڵ هەموو سەروەتی دنیا ناگۆڕێتەوە. بەڵام زۆر کەم قەدری ئەم نیعمەتانە دەزانین. ئێمە بەشێوەی گشتی زیاتر بیر لەوە دەکەینەوە کە نیمانە تا ئەوەی هەمانە.

بەڕێز پالمێر بۆی گێڕامەوە چۆن بینینی نیوەی بەتاڵی پەرداخەکە خەریك بوو ژیانی لەناو دەبرد:

((کاتێك لەسەربازی گەڕامەوە چوومە ناو بازاڕی کارو کارگەیەکم کردەوە. کارەکان باش دەچووە پێشەوە بەڵام کوتوپڕ کێشەکان دەستی پێکرد. پارچەو مادە سەرەتاییەکان کەم بوو. ئەم شتە منی زۆر نیگەران کردبوو. ئەوەندە ڕووگرژو مۆن ببووم (ئەڵبەت لەو کاتەدا خۆم ئاگام لێنەبوو) کەنزیك بوو خانەوادەکەم لەدەست بدەم. ڕۆژێك سەربازێکی پیرو کەمئەندام کە لەکارگەکەی مندا کاری دەکرد پێی وتم:((جۆرێك هەڵس و کەوت دەکەیت ئەڵێی تەنیا کەسی گرفتدار لەم دنیایەدا تۆیت! بابڵێین بۆ ماوەیەك ناچاری کارگەکەت داخەیت. ئەبێ بەچی؟ دیسان دەیکەیتەوە. سەیری من کە. دەستێك و نیوە دەموچاوم لەدەستداوە، بەڵام گلەیی ناکەم. زۆرم پێ خۆش بوو لەجیاتی تۆ بوومایە. باشتر وایە بۆڵەبۆڵ و گلەیی وەلاوە بنێیت، ئەگەرنا تەندروستی و بەختەوەریت لەدەست ئەدەیت)). ئەم قسانە منی وشك کرد. تێگەیشتم چەندە وەزعم باشەو بڕیارمدا هەر ئەو کەسەی پێشووبم)).

لۆگان پیر ساڵ سمیت دنیایەك زانستی لەیەك ڕستەدا گونجاندووەو دەڵێت:((دەبێ دوو ئامانجمان لەژیاندا هەبێت. سەرەتا بەدەست هێنانی ئەو شتەی دەمانەوێ و پاش چێژ لێ وەرگرتنی. تەنیا عاقڵترین خەڵکەکان دەگەن بە ئامانجی دووەم)). ئایا دەتانەوێ بزانن چۆن دەتوانن تەنانەت قاپ شۆردن بکەن بە تەجرەبەیەکی سەرنج ڕاکێش؟ بەڵێ؟ کەواتە کتێبی (دەمویست ببینم) لەنووسینی بۆرگیلدداڵ بخوێننەوە.ژنێك ئەم کتێبەی نووسیوە کە کەم و زۆر نیو سەدە کەم و زۆر کوێر بووە. ئەو دەنووسێت:((تەنیا یەك چاوم هەبوو، ئەو تاقە چاوەیش بەجۆرێك بەبرین و پێست داپۆشرابوو کە تەنیایەك کونی بچووك لەلای چەپیەوە هەبوو. من تەنیا لەو کونەوە توانای بینینم هەبوو. ئەگەر بمویستایە کتێبێك بخوێنمەوە دەبوایە لەبەر ڕوخسارمدا بمگرتایەو بەسەختی لەو کونەوە سەیرم بکردایە. ئەڵبەت ئەو ڕێگەی نەدا کەسێك ڕەحمی پێ بکات یان ئەو بەجیاواز دانێت. کاتێك منداڵ بوو بۆ یاری لی لی لەسەر



 

زەوی ڕادەكشا و تەواوی هێڵەكانی لەبەر دەكرد. ئەو ئەندازەو هێڵی زەوی یارییەكەی موو بەموو لەمێشكدا هەڵگرتبوو، لەویارییانەی پێویستی بە هەڵهاتن بوو، شارەزایی چاكی پەیدا كردبوو. ئەو بە كتێبی خەت درشت خوێندنەوەی دەستپێكرد. كتێبەكانی ئەوەندە لە چاوی نزیك دەكردەوە كە برژانگەكانی بەر لاپەڕەكان دەكەوت. ئەو توانی بڕوا نامە لەدوو زانكۆی بڕوا پێكراو وەربگرێت. بڕوانامەیەكی بەكالۆریوس لەزانكۆی مینە سووتا و ماستەرێك لەزانكۆی كۆڵۆمبیا.

ئەو لەمامۆستاییەوە لەلادێیەكی بچووك گەیشتە پلەی مامۆستای وێژەو ڕۆژنامەوانی لەزانكۆی ئاگۆستانا و (١٣) ساڵ لەوێ وانەی وتەوە. ئەو دەڵێت:((بەردەوام لەوە دەترسام بینایم بەتەواوی لەدەست بدەم)).بەڵام كاتێك گەیشتە (٥٢) ساڵ موعجیزەیەك ڕوویدا. نەشتەرگەری بۆ كراو توانای بینینی (٤٠) ئەوەندە زیادی كرد. ژیان بۆ ئەو حاڵەتێكی تری وەرگرت و ئیتر هەمووشتێك تەنانەت قاپ شۆردنیش سەرنج ڕاكێش بوو بۆی. ئەو دەیوت:((یاریم بە كەفەكان دەكردو دەستم دەكرد بەكەفە سپیەكەداو بڵقێكی بچووكم لەبەر تیشكدا دەگرت و لەبینینی ئەو كۆڵكە زێڕینە بچووكەی لەنا و ئەودا ئەمدی چێژم وەردەگرت)). ئەو كتێبەی بەم چەند وشەیە تەواو كرد:((ئاه، خودای گەورە شوكرانە بژێرم)). بیر بكەنەوە. ئەو لەسەر ئەوەی دەتوانێت قاپ بشوات یان فڕینی چۆلەكە سەیركات مەمنوونی خوایە. منو ئێوە دەبێ لەخۆمان شەرمەزاربین. ئەوەندە لەنیعمەتەكاندا نوقم بووین كە چیتر چێژ وەرگرتنمان فەرامۆش كردووە.

**یاسای چوارەم** بۆ وەستاندنی نیگەرانی و دەستپێكردنی ژیانێكی شاد.

نیعمەتەكانتان ببژێرن، نەك گرفتەكانتان.





 

بابەتی پێنجەم

## خۆتان بناسن و بزانن هاوشێوەتان لەسەر زەوی نیە.

ماوەیەك لەمەوبەر نامەیەكم لەلایەن خاتوو ئەدیت ئالریند بەدەست گەیشت كە لەكارۆلینای باكور دەژی. ئەو لەنامەكەیدا نووسیبووی:((لەدەورانی منداڵیدا زۆر هەستیارو شەرمن بووم. بەردەوام خەفەتم لەقەڵەوی دەخواردوو سەركوڵمە زلەكانم منی قەڵەوتر لەخۆم پیشان ئەدا. دایكم ژنێكی مۆدێرن نەبوو، بڕوای بەوە نەبوو جل وبەرگ دەبێ جوان بێت و بۆ جوانی لەبەر بكرێت. ئەو دەیوت:((جلی بەرین و فراوان ئەمەنی زۆرەو جلی تەسك و تروسك زووهەڵدەتەقێت)). منیشی بەم فەلسەفەوە پۆشتە دەكردەوە. هەرگیز نە ئەچووم بۆ میوانی و هیچ سەرگەرمیەكم نەبوو. كاتێكیش چووم بۆ خوێندنگە دووریم لەخەڵك دەكردو تەنانەت خۆم لەوەرزش ئەدزییەوە. شەرمن بوونم وەكو نەخۆشی لێهاتبوو.

لەگەڵ پیاوێكدا هاوسەر گیریم كرد كە چەندین ساڵ لەمن گەورەتر بوو بەڵام دیسان نەگۆڕام. بنەماڵەی مێردەكەم كەسانێكی خۆڕاگر بوون و بڕوا بەخۆبوونیان زۆر بوو. ئاواتم ئەوە بوو وەكو ئەوان بوومایە. زۆرم هەوڵدا وەكو ئەوانم لێبێت بەڵام نەكرا. هەرچی ئەوان هەوڵیان ئەدا من لەناو خۆم بێننەدەر من خراپتر دەچوومە ناو خۆم. ئەوەندە عەسەبی و بێتاقەت ببووم كە دووریم لەهەموو دۆستانم دەكردو تەنانەت لەدەنگی پاسەوانی دەرگا دەترسام. بەڵام بۆ ئەوەی هاوسەرەكەم تێنەگات لەناو خەڵكدا زۆر شادمان هەڵس و كەوتم دەكردو تەواوی وزەم بۆ چەند ڕۆژ لەدەست ئەدا. سەر ئەنجام ئەوەندە دەستەوستان كەوتم كە بڕیارم دا بەخۆكوشتن.

یەك قسە بەشێوەی بێئاگایانە منی گۆڕی. خەسووم دەربارەی گەورەكردنی منداڵەكانی قسەی دەكرد. ئەو وتی:((هەرشتێك ببوایە بەوانم دەوت خۆیان بن)).

بەڵێ، ئەم قسە کە(خۆیان بن) ژیانی منی گۆڕی. زوو تێگەیشتم کێشەی من ئەوە بوو دەمویست خۆم بخەمە قاڵبی کەسانی ترەوە. قاڵبێك کەهی من نەبوو.

بەیەك شەو گۆڕام‌و بوومە خۆم. دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە لەبارەی خۆمەوەو ویستم خۆم بناسم. دەربارەی مۆدەو ڕەنگ ورد بوومەوەو ئەو جلانەی هەستم دەکرد زیاترم لێدێت لەبەرم دەکرد. هەوڵمدا هاوڕێیانی نوێ پەیدا بکەم. بوومە ئەندامی گرووپێك‌و بە بەشداری لەچالاکیەکانیاندا وردە وردە بڕوا بەخۆبوون‌و شەهامەتم پەیدا کرد. ئەم کارەم زۆری پێچوو بەڵام توانیم لەم ڕێگەوە خۆشبەختی بەدەست بێنم. ئەم دەرسەم لەپەروەردەکردنی منداڵەکانیشمدا خستەکار: ((هەرشتێك ڕوو بدات خۆتان بن)). هیچ کەس بەدبەختتر لەو کەسە نیە کە دەیەوێت کەسێکی تر بێت بێجگە لەوەی بە عەقڵ‌و بەجەستە هەیە. ئەم ئاواتە خوازی لەهاوشێوە بوون لەگەڵ کەسێکی تر زەمینەی زۆربەی ناڕەحەتیە عەسەبییەکان، دەروونیەکان‌و کەم‌و کوڕییەکانە. لەم ماوەدا پرسیارم لەبەرپرسی دامەزراندنی هێزی کاری کۆمپانیای نەوتی سۆکۆنی وەکیوم کرد:((گەورەترین هەلەیەك کە خەڵك لەکاتی داواکردنی کارو دامەزراندندا دەیکەن چیە؟)) ئەو دەبوا وەڵامەکەی بزانیایە چونکە دیداری لەگەڵ(٦٠) هەزار کەس کردبوو، کتێبێکی بەناوی ((شەش ڕێگا بۆ کار وەرگرتن)) نووسیوە. ئەو وەڵامی دایەوە: ((گەورەترین کێشەو گرفتی داواکاران ئەوەیە کە خۆیان نین. واتە لەدیدارەکاندا وەڵامێك ئەدەنەوە کە بیر دەکەنەوە ئێوە ئەتانەوێ بیبیستن. هیچ کەس کەسانی ماستاوچی خۆش ناوێت)).

کچێکی بلیت فرۆشی شەمەندەفەرێکی ناو شار ئەم دەرسە بەزەحمەتێکی زۆرەوە فێر بوو. ئەو ئاواتی ئەوە بوو ببێتە گۆرانی بێژ بەڵام ڕوخساری نەیدەهێشت. دەمی زۆر گەورە بوو، ددانەکانی ناڕێك بوون‌و دەمی تەواو دانەدەخرا. یەکەم جار کەلەناو کۆڕدا گۆرانی وت هەوڵیدا بە لێوی ددانەکانی داپۆشێت، بەڵام ئەنجامی ئەم کارە ساختە بەرچاوکەوتن‌و گاڵتە بوونی ڕوخساری بوو.

پیاوێك لەو یانە شەوانەدا دەنگی بیست‌و بەتوانای ئەوی زانی. چووە پێش بۆ لای‌و بێ شەرم پێی وت:((من کاری تۆم بینی. دەمزانی تۆ دەتویست ددانەکانت داپۆشیت)). ئەم وتەیە کچەکەی زۆر شەرمەزار کرد. ئەو پیاوە درێژەی پێدا:((بەڵام بۆچی؟ئایا ددانە گەورەکە دەردەکەوێت بە تاوانێك دەژمێردرێت؟ باشتر وایە خەمی

ددانەکانت نەخۆیو دەمت بە ئاسوودەیی بکەیتەوە. ئەگەر بینەر هەست بکات تۆ بەهۆی ددانەکانتەوە شەرم ناکەیت ئاواتە خوازی دەمو ددانت دەبێت. لەکوێوە دەزانی، لەوانەیە ئەم ددانانە داهاتووی تۆ دروست بکەن)).

کاس دەلی ئەم پەندەی وەرگرتو عەیبی ددانەکانی فەرامۆش کرد. دەمی کردەوەو ئەوەندە بەتواناوە دەستی کرد بە گۆرانی وتن کە بووە ئەستێرەی سینەماو ڕادیۆ. کۆمیدیاکارانی تر ئێستا دەیانەوێ لاسایی ئەو بکەنەوە.

منو ئێوەیش وەها توانایەکمان هەیە کەواتە بۆچی نیگەرانی ئەوە بین هاوشێوەی خەڵك نین. ئێوەیش شتێکی نوێن لەدنیادا. لەسەرەتای دنیاوە هەتا ئێستا کەسێك کوتومت وەکو ئێوە پەیدا نەبووە و نابێت. زانستی جینات فێرمان دەکات کەتێکەڵی (٢٤)کرۆمۆسۆمی باوكو (٢٤)کرۆمۆسۆمی دایك ئێوەی بەم شێوەیە دروست کردووەو ئەم کرۆمۆسۆمانە هەڵگری هەموو ئەو شتانەیە ئێوە بە ویراسی وەرتانگرتووە.تەنانەت لەپاش هاوسەرگیری دایكو باوکتان ئەگەری ئەوەی ئێوە بەم شێوەو تایبەتمەندییەوە لەدایك بن یەك لەبەرامبەری سێسەد هەزار ملیارە، واتە ئەگەر سێسەد هەزار خوشكو براتان هەبێ لەوانەیە یەکیان هاوشێوەی ئێوە بێت. من بەدڵنیایی تەواوەوە دەربارەی ئەو خاڵە کە ئینسان دەبێت خۆی بناسێتو خۆی بێت قسەدەکەم چونکە ئەم بابەتە لەتەجرەبەیەکی تاڵو بەنرخەوە فێر بووم. کاتێك یەکەم جار لەکێڵگەکانی گەنمەشامی میسۆرییەوە پێم نایە نیویۆرك چوومە کۆلیجی هونەرە دراماتیکەکان. ئاواتم ئەوە بوو ببمە ئەکتەر. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە بیرم دەکردەوە فیکری زۆر زێڕینم هەیە. کورتە ڕێگەیەکی سادە کە نەمدەتوانی تێبگەم بۆچی بە مێشکی کەسانی تردا نایەت. فیکرەکەم ئەمە بوو. دەمویست تەواوی ئەکتەرە بەناو بانگەکانی ئەو سەردەمە بخەمە بەردەم.لێکۆڵینەوەیەکی وردو خاڵە چاك و پۆزەتیڤەکانی ئەوان پێکەوە تێکەڵ بکەمو لاساییان بکەمەوەو بەم شێوە ببم بە ئەکتەرێکی زێڕین. ساڵانێك لەتەمەنم بە لاسایی کردنەوەی خەڵك بەفیڕۆدا هەتا بگەم بەو ڕاستیە کە نابێ هەوڵ بدەم کەسێکی تر بمو هەر نایشکرێت کەسێك بم بێجگە لەخۆم. دەبوایە دەرسم لەم بابەتە وەربگرتایە بەڵام وانەبوو. ساڵەها دوای ئەوە دەستم کرد بە کتێبێك دەربارەی وتووێژە بازرگانیەکان کە هەستم دەکرد باشترین کتێب بێت لەجۆری خۆیدا. دەمویست فیکرە جۆراو جۆرەکان لەنووسەرەکانی تر وەربگرمو تەواویان لەکتێبێکدا کۆبکەمەوە. یەك ساڵی تەواو سەرقاڵی قەڵاکردنی بیرۆکە

جیاوازەكان بووم بەڵام نووسراوەكەم ئەوەندە ساختەیی بوو كە هیچ كەس نەیدەتوانی بیخوێنێتەوە. دیسان ئاگاداری هەڵەكەم بوومەوە.زەحمەتی یەكساڵەكەم فڕێداو بەخۆمم وت:((تۆ دەبێ خۆت بیت، بەتەواوی بێ توانایی و هەڵەكانتەوە)). پاشان كتێبێكی بچووكم لەباوەڕەكانی خۆم نووسی. سێروڵتەر ڕاڵی دەڵێت:((من ناتوانم كتێبێك بنووسم كە یەكسان بێ لەگەڵ كاری شیكسپیر، بەڵام دەتوانم كتێبێك لەخۆمەوە بنووسم)).

شارلی شاپلین، ویل ڕاجەرز، مێری مارگرێت مەك برایر، ژان ئۆتری وملیۆنەها كەسی تر

وەكو من دەرسێك فێربوون كە هەوڵ ئەدەم لەڕووی تەجرەبەوە بەیانی بكەم.

كاتێك چارلی چاپلین یەكەم فیلمی خۆی دروست دەكرد دەرهێنەران پێداگربوون ئەو لاسایی كۆمێدیاكارێكی ئەڵمانی بكاتەوە، بەڵام كاتێك ئەو شێوازی خۆی دەرنەهێنابوو سەركەوتنی بەدەست نەهێنا. كاتێك مارگارێت مەك برایر بۆ یەكەم جار لەڕادیۆدا بەرنامەی پێشكەش كرد هەوڵی ئەدای لاسایی كۆمێدیاكارێكی ئیر لەندایی بكاتەوە، بەڵام ئەویش تاكاتێك وەكو خۆی واتە كچێكی ساكاری خەڵكی میسۆری لێنەهات سەركەوتنی بەدەستنەهێنا. هەروەها كاتێك ژنە ئۆتری شێوەزاری تەكساسی خۆی گۆڕی، وەكو شارییەكان جلی پۆشی و وتی خەڵكی نیۆیۆركە هەمووان لەپاشەسەر پێی پێكەنین بەڵام كاتێك بانجۆی خۆی بەدەستەوە گرت و گۆرانی ناوچەكەی وتەوە بووە ناودارترین گالەوەڕێنی سینەما.

ئێوە لەم جیهانەدا شتێكی نوێن. لەم بابەتەوە شادمان بن و هەوڵ بدەن باشترین سوود لەو شتەی سروشت بە ئێوەی بەخشیوە وەربگرن. لێكۆڵینەوەكان دەریانخستووە هونەر زاتی و تایبەتە بە مرۆڤ. ئێوەیش وەكو خۆتان دەتوانن گۆرانی بڵێن یان شێوەكاری بكەن. دەزانن كە دەبێ خۆتانبن واتە ئەو شتەی بارودۆخ و دەوروبەر و تەجرەبەكان و بۆماوەیی دروستی دەكات. چ چاك و چ خراپ، هەركەسێك دەبێ لەئۆركسترادا سازی خۆی بژەنێت.

ئیمێرسۆن لەوتاری ((بڕوا بەخۆبوون))دا دەنووسێت:((لەژیاندا هەركەسێك دەگاتە ئەو خاڵە كە ئیرەیی،نەزانی و لاسایی كردنەوەو خۆكوشتن كە هەركەسێك دەبێ خۆی بەو جۆرە قبووڵ بكات كە هەیە. ئەگەرچی جیهان پڕە لەچاكەكان بەڵام بەرهەمەكەی ئەو هەر لەو پارچە زەوییەوە دەڕوێت كە لەبەردەستدایە. هێزی دەروونی ئەو

لەجیهاندا دوورە لەدەستی هەر کەسێك و تەنیا خۆی دەزانێ چ توانایییەکی هەیەو تا هەوڵ نەدات خۆیشی ئەو ڕاستیە نازانێت)).

**یاسای پێنجەم** بۆ دروست کردنی ڕوانگەیەکی بنیاتنەر:
لاسایی کەس نەکەینەوە، خۆمان بناسین و خۆمان بین.

## بابەتی شەشەم

# چێژ لەو شتەی هەتانە وەربگرن

## (ئەگەر یەك دانە لیمۆتان هەبێ دەتوانن ئاو لیمۆ دروست بکەن)

کاتێك خەریك بووم ئەم کتێبەم دەنووسی سەردانی رابێرت ماینیارد، سەرۆکی زانکۆی شیکاگۆم کرد تاکو پرسیاری لێبکەم بە چ تەکنیکێك خۆی لەنیگەرانی، دڵەڕاوکێ و قەلەقی پاراستووە. رابێرت وەڵامی دایەوە:((هەمیشە بەگوێی پەندی یەکێك لەدۆستانم دەکەم. ئەو دەیوت: ئەگەر یەك لیمۆت هەیە شەربەتی لیمۆی پێ دروست کە)).

ئەمە کوت‌ومت ئەو کارەیە کە ئینسانی عاقڵ دەیکات، بەڵام مرۆڤی نەزان ئەگەر لیمۆیەك نەسیبی ئەو بێت دەینێتە کەنارو لەبەختی خراپ‌و شانسی شووم گلەیی دەکات، لەبەرامبەر دنیادا دەوەستێت‌و خۆی دەخاتە بەدبەختیەوە. کەسی تێگەیشتوو دەرس لەم بێ بەختیە وەردەگرێ‌و هەوڵ ئەدا بەباشترین شێوە سوود لەو لیمۆیە وەربگرێت. ئالفرێد ئەدلێر لەپاش چەندەها ساڵ لێکۆڵینەوە دەربارەی هێزە شاراوەکانی مرۆڤ

دەگاتە ئەو ئەنجامە کە یەکێك لەسەر سووڕهێنەرترین توانا دەروونیەکانی مرۆڤ گۆڕینی نێگەتیڤە بۆ پۆزەتیڤ.

ئێستا تیشك دەخەینە سەر داستانی خاتوو تەلما تامپسۆن کە توانی ئەم کارە ئەنجام بدات:

((ساڵانی شەڕ هاوسەرەکەم نێردرا بۆ ئۆردووگایەکی سەربازی لەبیابانی ماجووی کالیفۆڕنیا و من بۆ ئەوەی لەو نزیك بم گواستمەوە بۆ ئەوێ. ئەمە لەحاڵێکدا بوو کە من نەفرەتم لەو شوێنە بوو. زۆربەی کات هاوسەرەکەم بۆ ڕاهێنان لەبیابان بوو، من لەکەپرێکی بچووکدا بەتەنیا دەمامەوە. گەرماکەی تاقەت پڕووکێن بوو، هیچ

هاودەمێکم نەبوو. سوور پێستەکان و مەکسیکیەکان ئەو ناوچەیەش ئینگلیزییان نەدەزانی. ئاو و خۆراکمان لەهەموو شوێنێك پڕبوو لەخۆڵ.

ئەوەندە سەختیم دەکێشا کە بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. نامەیەکم نووسی و وتم یەك چرکەی تر ناتوانم بەردەوام بم. بێنم. دەمەوێ لێرە بڕۆم و بگەڕێمەوە بۆ ماڵی باوکم. باوکم بە دوو ڕستە وەڵامی دابوومەوە، دوو ڕستەیەك کە بۆ هەمیشە لەمێشکمدا دەمێنێت و ژیانمی بەتەواوی گۆڕی:

((دوو دانە زیندانی لەپشتی میلەکانەوە سەیری دەرەوەیان دەکرد، یەکیان قوڕوچڵپاوی ئەبینی و ئەوەیتر ئەستێرەکانی دەبینی)).

چەندەها جار ئەم دوو دێڕەم خوێندۆتەوەو هەستی شەرمم هەبوو. بڕیارمدا بەدوای ئەستێرەکاندا بگەڕێم و بزانم لایەنی ڕۆزە تیقی بارودۆخی ئێستای من چییە؟ لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا بوومە دۆست و کاردانەوەی ئەوان بووە هۆی سەرسووڕمانی من. کاتێك ئاواتە خوازی خۆم بۆ چنین و گۆزە گەری دەربڕی ئەوان شت گەلێکیان کردە دیاری بۆ من کە بە گەشتیارەکانیان نەدەفرۆشت. سەرنجم ئەدایە شێوە سەیرو سەمەرەکانی کاکتوسەکان و یو کاکان. شت گەلێك دەربارەی سەگەکانی ئەو بیابانەوە فێربووم و بەردەوام ئاوابوونی هەتاوم سەیردەکرد. بەدوای ئەو گوێچکە ماسیانەدا دەگەڕام کە لە ملیۆنەها ساڵ لەمەو بەر کاتێك ئەم بیابانە ڕاخەری زەریا بوو، بەجێ مابوون. چ شتێك گۆڕابوو؟ بیابان و خەڵکەکانی هەر ئەوانە بوون. ئەوە ڕوانگەی من بوو گۆڕابوو، تەجرەبەیەکی ناخۆش و تاقەت پڕووکێنم گۆڕی بۆ بەسەرهاتێکی پڕشەوق و دڵفڕێن. ئەوەندە لەژیانی ئەوێ شادمان بووم کە ڕۆمانێکم بەناوی ((گردە درەوشاوەکان)) لەبارەی بیابانی ماجوویەوە نووسی. من لەزیندانێك خۆم دروستم کردبوو سەیری دەرەوەم کردبوو،ئەستێرەکانم دۆزیبووەوە.

یۆنانیەکانی کۆن (٥٠٠) ساڵ لەپێش لەدایك بوونی مەسیحدا دەیانوت: ((باشترین شتەکان سەختترینیانە)). ئێمرسۆنیش لەسەدەی بیستەمدا دەڵێت:((هەستی ڕەزامەندی زۆربەی کات لەچێژ وەرگرتنەوە نیە، بەڵکو لەسەرکەوتنەوەیە)). واتە زاڵ بوون بەسەر سەختیەکان و بەدەستهێنانی هەستی سەرکەوتن. واتە شەربەت دروست کردن لەلیمۆیەك.

جارێك چووم بۆ دیداری خاوەن كێڵگەیەك كە شەربەتی لەلیمۆی ژەهراویش دروست كردبوو. كێڵگەكەی ئەو لەفلۆریدایە. كاتێك ئەو كێڵگەی كڕیبوو خاكی ئەوێ ئەوەندە وشك بوو كە نەدەكرا میوەی لێ بەرهەم بێنن نە بەرازی تیا پەروەردە بكەن. تەنیا دووشت لەوێ دەست دەكەوت: ماری زەنگۆڵەدار و بەڕوو. ئەو بڕیاریدا بازرگانیەك بەم مارە زەنگۆڵەدارا بخاتە ڕێ‌و دەستی كرد بە دروست كردنی كۆنسێرو (خواردنی ناو قوتو) كردی گۆشتی مار. ئێستا لەپاش چەند ساڵ گەشتیارەكان لەسەرانسەری دنیاوە دێن بۆ كێڵگەكەی ئەو. لەوێ بینیم كە ژەهری مارەكانی ئەو دەنێردرێت بۆ تاقیگەكان هەتا دەرمانی لێ دروست بكەن. پێستی مارەكان لەپارچەی پچووكدا بۆ دروست كردنی جانتا و پێڵاوی ژنانە دەفرۆشرێت بەكارگەكان‌و گۆشتەكەیان بەشێوەی كۆنسێرو بەتەواوی دنیادا بڵاو دەبێتەوە. ئەو بەلیمۆی ژەهراوی شەربەتی دروست كردبوو.

(٣٥) ساڵە وانەی پەروەردەكردنی گەورە تەمەنان دەڵێمەوە و بۆم دەركەوتووە یەكێك لەگەورەترین پەشیمانیەكانی خەڵك ئەوەیە كە بۆچی نەچوون بۆ زانكۆ.ئەوان پێیان وایە نەبوونی بڕوانامەی زانكۆ عەیبێكی گەورەیە. ئەڵبەت من دەزانم ئەم فكرە ١٠٠٪ دروست نیە چونكە كەسانێكی سەركەوتووم بینیوە كە تەنیا خوێندنی دواناوەندییان هەبووە. هەر بەوهۆیەوە زۆر جار داستانی پیاوێكیان بۆ دەگێڕامەوە كە خوێندنی سەرەتاییشی نەبووە. ئەو لەهەژاری‌و سەختیدا گەورە ببوو. كاتێك باوكی مرد هاوڕێكانی كۆبوونەوە هەتا تابوتێكی بۆ دروست بكەن. لەپاش ئەوە دایكی ڕۆژی (١٠) كاتژمێر لەكارگەی دروست كردنی چەتر كاری دەكردو لەماڵیشەوە تانیوەشەو پینەوپەڕۆی خەڵكی دەكرد تاكو بژین.

ئەم كوڕە لەكڵێسای گەڕەكەكەیاندا چووە ناو دەستەی شانۆ و ئەوەندە چێژی لەم كارە وەرگرت كە بڕیاریدا دەست بداتە مەوعیزەگەری. ئەم كارە ئەوی بردە ناو سیاسەت‌و لەسی ساڵیدا بەئەندامی لیژنەی یاسادانانی نیویۆرك هەڵبژێردرا، بەڵام ئامادەیی بۆ ئەم كارە نەبوو. ئەو بەمنی وت تەنانەت ئەم پلەو لیژنەیە چی دەكات. كاتێك ئەو چووە دەستەی پاراستنی دارستانەكانەوە نەیدەزانی دەبێ چی بكات. كاتێك چووە ناوكۆمیسیۆنی بانكەوە ئەوەندە سەری لێ شێوابوو كەدەیویست شكست قبووڵ بكات‌و ئیستقالە بدات.

بەڵام بەپێچەوانەوە بڕیاریدا ڕۆژی (١٦)کاتژمێر بخوێنێتەوەو خۆی لەنەزانی دەرباز بکات. ئەم هەوڵە بووە هۆی ئەوەی ئەو لەناوبانگی ناوچەییەوە بگاتە ناوبانگی نەتەوەیی. ناوی ئەو ئاڵ سمیت بوو. ئاڵ سمیت چوارجار بووە قایم مەقامی نیویۆرك. شەش زانکۆی بەناو بانگ پلەی دکتۆرای فەخری پێشکەشی ئەو کرد کە تەنانەت خوێندنی سەرەتاییشی تەواو نەکردبوو. ئاڵ سمیت وتی ئەگەر ئەو (١٦) کاتژمێرکاری ڕۆژانەیە بۆ گۆڕینی نیگەتیف بۆپۆزەتیف و لەبەین بردنی عەیب و بێ توانایییەکانی نەبوایە هیچ کام لەم سەرکەوتنانەی حاسڵ نەدەکرد. نیچە دەیوت:((پیاوی بەهێز نەك هەر پێویستی و سەختیەکان تەحەممول دەکات بەڵکو ئەوانی خۆش دەوێت)).

هەرچی زیاتر لەسەر پیاوانی گەورەو سەرکەوتوو دەخوێنمەوە زیاتر پەی بەو ڕاستیە دەبەم کە زۆربەی ئەوان بەهەبوونی عەیبێکەوە کارەکانیان دەست پێکردووە کە ئەوانی بەرەو هەوڵی زیاتر ڕاکێشاوە. ویلیام جیمز دەڵێت:((عەیبەکانی ئێمە بەشێوەی چاوەڕوان نەکراو دەبنە یارمەتیدەری ئێمە)).

بەڵێ، ئەگەری ئەوە هەیە کە شیعری میلتۆن بەهۆی نابینایی و مۆسیقای بەتهۆڤن بەهۆی نەبیستنەوە باشتر پشکووتبێت. ئەگەر داستۆفسکی و تۆلستۆی لەژیاندا ڕەنجیان نەکێشایە، لەوانەیە هەرگیز نەیانتوانیایە ڕۆمانە نەمرەکانیان بنووسن.

چارلزداروین دەڵێت:((ئەگەر ئەوەندە زەلیل نەبوومایە نەمدەتوانی ئەوەندە زەحمەت بکێشم و سەرکەوتن بەدەست بێنم)). هەر ئەو ڕۆژەی داروین لەبەریتانیا لەدایك بوو لەئەیالەتی کەنتاکی ئەمریکایش منداڵێك هاتە دنیا کە بەعەیب و کەم و کوڕیەکانیەوە توانی بگاتە مەقامێکی گەورە. ئەو ئەبراهام لینکۆڵن بوو. ئەگەر ئەو لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەندا لەدایك بوایەو پەروەردە بوایە، ئەگەر بچوایە بۆ زانکۆی هاروارد و ژیانێکی ئاسوودەی هەبوایە، لەوانەیە نەیتوانیایە لەوتاری دووەم دەوری سەرۆك کۆماری، وەها وتارێکی پرسەنگ و نەمر بخوێنێتەوە. وتە گەلێك کە تائەو ڕۆژە هیچ حاکمێك بەو جوانیە نەیکردووە:((بێ نەفرەت و بەنیەتی خێرخوازانەوە بۆ هەمووان......))

ئێمرسۆن لەکتێبی ((توانای بینین))دا دەنووسێت:((پەندێکی ناوچەی ئەسکەندەناڤی دەڵێت ((بای شەماڵ وایکینگی لەوایکینگەکان دروست کرد)). کێ

دەڵێ خۆشی و نەبوونی کێشە بەتەنیا دەتوانێت خەڵک چاک یان خراپ بکات؟ کوتومت بەپێچەوانەوە، کەسانێک کە هەست بە چارەڕەشی دەکەن تەنانەت لەناو پەڕی قازیشدا ئەو هەستەیان هەیە. لەتەواوی مێژوودا کامەرانی ڕووی لەکەسانێک کردووە کە لەهەر دۆخێکدا بەرپرسیارێتی و ئەرکی خۆیان جێ بەجێ کردووە)).

بیهێنینە بەرچاومان ئەوەندە دووچاری دابەزینی ورە بووین کەهەست دەکەین هیچ شانسێکمان بۆ چاککردنی وەزعمان نیە. ئەو کاتە دەبێ سەرنج بدەینە دوو هۆکار. دوو هۆکار کەپێمان دەڵێن بۆچی دەبێ هەوڵ بدەین و بۆچی دەکرێ هەموو شتێک بەدەست بێنین و هیچ نەدۆڕێنین.

**هۆکاری یەکەم:** سەرکەوتن بە ئێمەیە.

**هۆکاری دووەم:** تەنانەت ئەگەر سەریش نەکەوین هەوڵدان بۆ باشتر کردنی بارو دۆخەکە دەبێتە هۆی ئەوەی لەجیاتی گەڕانەوە بۆ دواوە بیر لەپێشکەوتن بکەینەوە. ئەم هەوڵە توانای داهێنانی ئینسان ئازاد دەکات و دەبێتە هۆکاری ڕۆیشتنمان بەرەو پێشەوەو دەرفەت و ئاواتێکمان بۆ حەسرەتی ڕابردوو، بێ بەشبوونەکان نابێت.

ئۆل بۆڵ یەکێک لە ویۆلۆنیستە بەناو بانگەکان لەحاڵێکدا ئاهەنگێکی لەیەکێک لەکۆنسێرتەکانیدا دەژەند تووشی کێشە بوو. یەکێک لەسیمەکانی ویۆلۆنەکەی پچڕا، بەڵام ئەو بەسێ سیمەکەی تر ئاهەنگەکەی تەواوکرد. ژیان ئەمەیە. ئەگەر بەچوار سیم نەکرا بەسێ سیم دەبێ بیکەیت.

**یاسای شەشەم** بۆ دروستکردنی ڕوانگەیەکی بنیاتنەر:

کاتێک چارەنووس لیمۆیەک دەکاتە نەسیبمان دەبێ شەربەتی لێ دروست بکەین.

بابەتی حەوتەم

## شێوەی دەرمانی خەمۆکی لە(١٤) ڕۆژدا.

لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا خەڵاتێکی (٢٠٠)دۆلاریم بۆ خاوەنی باشترین و بەسوودترین نامە بەناوی ((چۆن بەسەر نیگەرانیدا زاڵ بین)) دانا. سێ دادوەر لەهەڵبژاردنی براوەدا یارمەتی منیان ئەداو بەهەر جۆر بێت دوو نامەم بەدەست گەیشت کە ئەوەندە باش بوون، دادوەرەکان وتیان فەڕی یەکیان بدەین بەسەر ئەوی تردا. لەم ڕووەوە خەڵاتەکەمان لەنێوان ئەو دووانەدا دابەش کرد. ئێستا گوێ لەم بەسەرهاتە بگرن کە بەدەستی بەڕێز سی ئار بێرتۆن نووسراوە:

((کاتێك نۆ ساڵان بووم، دایکم لەدەستداو لە(١٢) ساڵیدا باوکیشم مرد. باوکم کوژرا بەڵام دایکم ڕۆژێك ناخافڵ ماڵەوەی بەجێهێشت و هەرگیز نە ئەوو نە ئەو دوو خوشکەی لەگەڵ ئەو ڕۆیشتبوون نەم بینینەوە. ئەو تەنانەت نامەیشی نەدەنووسی تا ئەوەی (٧) ساڵ ڕابوورد. باوکم لەگەڵ شەریکەکەی کافەیەکی بچووکی کڕیبوو کاتێك باوکم لە گەشتێکی کاریدا بوو شەریکەکەی کافەکەی فرۆشت و هەڵهات. لەڕێگەی تەلەگرافەوە باوکم لەم شتە ئاگادار کردەوە و ئەو لەحاڵێکدا بەپەلە بەرەو ماڵەوە دەهات لەپێدادانێکی ئۆتۆمبێلیدا کوژرا. دوو پوورەکەم (خوشکی باوکم) (٣) دانە لەمنداڵەکانیان وەرگرت، بەڵام من و براکەم سپێردراین بەخەڵکی شارەکە. ماوەیەك لەگەڵ خێزانێکی هەژاردا ژیام، بەڵام بۆ نەگبەتی گەورەی ماڵەکە کارەکەی لەدەست داو ئیتر نەیاندەتوانی من ڕابگرن. پاشان ژن و مێردێك بەناوی لافتین منیان برد بۆ مەزراکەیان کە (١١) میل لەشارەوە دوور بوو. بەڕێز لافتین لەشارەوە دوور بوو کە پیرەپیاوێکی ٧٠ ساڵان بوو بە منی وت کاتێك درۆنەکەم و دزی نەکەم و گوێڕایەڵی بم دەتوانم لەوێبم. ئەم سێ فرمانە لەئینجیل وەرگیرا بوو، پێڕەویم لەوانە دەکرد. منیان نارد بۆ خوێندنگە بەڵام هەر هەفتەی یەکەم لەبەرخاتری لوتی گەورەم گاڵتەیان

پێکردمو به (کەر)و (توتکه هەتیو) ناویان بردم که به گریانەوه گەڕامەوه بۆ ماڵەوه. زۆرم حەز ئەکرد شەڕیان لەگەڵ بکەم بەڵام بەڕێز لافتین وتبووی: (کەسێك که خۆی لەشەڕی لادەدات بەهێز تره لەو کەسەی شەڕ دەکات). منیش تا ئەو ڕۆژەی یەکێك لەمنداڵەکان ڕیقنەی باڵندەی فڕێنەدا بۆ دەمو چاوم شەڕم نەدەکرد. کاتێك ئەو کارەی کرد باش کوتامو چەند هاوڕێیەکم پەیدا کرد.

بەڕێز لافتین کڵاوێکی تازەی بۆ کڕیبووم که لەبوونی زۆر خۆشحاڵ بووم، ڕۆژێك یەکێك لەکچەکان لەسەری فڕاندمو پڕی کرد لەئاو و کڵاوەکەم خراپ بوو. ئەو کچه وتی ویستوومه سەرم تەڕبێت نەکاو سەرم لەوشکیدا قڵەش بەرێت.

هەرگیز لەقوتابخانه نەدەگریام بەڵام که دەگەیشتمەوه بۆ ماڵەوه فرمێسکەکانم دەهاتنه خوارەوه. خاتوو لافتین به منی وت ئەگەر یارمەتی ئەوان بدەم ئیتر ئەوان ئازاری نادەن. منیش بەقسەم کرد.زۆر دەرسم دەخوێندو یارمەتی ئەوانی ترم ئەداو منداڵەکان ئازاریان نەئەدام. لەوکاتەدا لەگەڕەکی ئێمه دوو جووتیار مردنو یەکێکیش هاوسەرەکەی بەجێهێشت. کەواته لەچوار بنەماڵەدا یەك پیاو مابوو، ئەویش من بووم. لەڕێگەی قوتابخانه دەچووم بۆ مەزراکانیانو دارم بۆ ئەشکاندن، مانگاکانیانم ئەدۆشیو حەیوانەکانم ئاو ئەدا. لەبەر ئەم یارمەتیانەم هەمووان منیان خۆشدەویستو وەکو دۆستێکی نزیك وەریانگرتبووم. کاتێك گەورە بوومو بۆ یەکەم جار لەهێزی دەریاوانیەوه بۆ پشوو هاتمەوه(٢٠٠) خاوەن کێڵگە هاتن بۆ دیدارمو هەستی ڕاستەقینەی خۆیان بۆ دەرخستم. ئەوەنده سەرگەرمی یارمەتیدانی خەڵك بووم که ئیتر نیگەرانیو دڵه ڕاوکێم نەبوو)).

سەرنج ڕاکێشترین ڕستەیەك تا ئێستا لەقەڵەمی دەروونناسێکەوه خوێندوومەتەوه ئەو ڕستەی ئالفرێد ئۆلەره که بەنەخۆشه خەمۆکەکانی خۆی دەڵێ:((ئێوه دەتوانن بەم کاره لەماوەی (١٤) ڕۆژدا چارەسەربن. بیربکەنەوه چۆن دەتوانن هەموو ڕۆژێك یەك کەس شادبکەن)). ئەم وتەیه تۆزێك نامۆ سەیر دەکرێت، هەر بۆیه هەست دەکەم دەبێ وەکو شیکردنەوه کورتەیەك لەکتێبی نموونەیی ئالفرێر ئۆلەر بەناوی ((مانای ژیان)) لێرەدا بێنم:

((ماخۆلیا وەکو سەرکەشیەك لەبەرامبەری کەسانی تر بەمەبەستی بەدەست هێنانی سەرنج، پشتیوانی، هاودەردییەو نەخۆش لەتاوانی خۆیەوەیەتی دوچاری خەمۆکی

دەبێت. یەکەم بیرەوەری نەخۆشێکی ماخۆلیایی زۆربەی جار شتێکی هاوشێوەی ئەمەیە:((دەمویست لەسەر تەختەکەدا ڕاکشێم، بەڵام براکەم لەوێ خەوتبوو. ئەوەندە گریام تا ناچاربێت بڕوات)). ماخۆلیاییەکان زۆربەی کات دەیانەوێ بە خۆکوشتن تۆڵە لەخۆیان بسێننەوە. کەواتە یەکەم کارێك پزیشکی دەروونی دەبێ بیکات ئەوەیە کە ڕێگەنەدات ئەوان بیانوویەك بۆ خۆکوشتن پەیدا بکەن. خودی من وەکو یەکەم یاسا بەوان دەڵێم:((کارێك کە حەزت لێی نیە مەیکە)). سادە بەرچاو دێت، بەڵام بەبڕوای من ئەم ڕستەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی کێشەکە. بۆ نموونە دەڵێم:((ئەگەر ویستت بچی بۆ سینەما یان بۆ سەفەر، بچۆ، بەڵام ئەگەر لەڕێدا ئەگەر فیکرت گۆڕا درێژەی پێ مەدە)). ئەم کارە هەستی توانایان پێ دەبەخشێت. لەلایەکی ترەوە ئەم کارە لەگەڵ شێوەی ژیانی نەخۆشدا ئەوەندەیش سادە ڕێك ناکەوێت. چونکە نەخۆش دەیەوێ فەزیلەتی هەبێت و ئەگەر کەیانی دەوروبەر لەگەڵیدا هاوڕابن چیتر ڕێگەیەك بۆ باڵا تربوون و دەسەڵاتداری نامێنێتەوە. هەرگیز لەناو نەخۆشەکانمدا حاڵەتی خۆکوشتنم نەبووە.

وەکو عادەت نەخۆش دەڵێ:((بەڵام هیچ کارێك نیە حەز بکەم ئەنجامی بدەم)). بۆ ئەو وەڵامە ئامادەم چونکە دەیەوێ تەواوی ڕۆژەکە لەجێگەکەیدا بمێنێتەوە. دەزانم ئەگەر لەگەڵیدا هاوڕا نەبم دەست ئەکات بەرقە بەرایەتی و شەڕ دەکات، کەواتە دەڵێم باشە. یاسای دووەم ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕەوشی ژیانی ئەواندا دژایەتی هەیە:((ئەگەر هەموو ڕۆژێك یەك کەس شاد کەن لە(١٤) ڕۆژدا چارەسەر دەبن)). ئەوان هەمیشە لەفیکری ئەوەدان چۆن کەسێك بێزار بکەن. لەبەرامبەری ئەم یاسایەدا زۆربەی کات دەڵێن تەواوی تەمەنیان ئەمەیان کردووەو من داوا لەوان دەکەم بەکارە چاکەکانیاندا بچنەوە. بەوان دەڵێم شەوانە کەناتوانن بخەون کاتێك بۆ پەیداکردنی ڕێگەیەك بۆ شادکردنی کەسانی تر دادەنێن. کاتێك ئەنجامەکەی لەوان دەپرسم دەڵێن:((دوێشەو هەر چوومە ناو جێگا خەوم لێکەوت)). ئەڵبەت ئەم کارانە دەبێ زۆر دۆستانە ئەنجام بدرێت.

هەندێکیش دەڵێن: ئەوەندە عەسەبی و نیگەرانم کە هەر ناتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم)). منیش بەوان دەڵێم:((هیچ هەوڵ مەدە نیگەرانیەکەت ڕاگریت بەڵکو لەکەناری ئەم بابەتەدا بیر لەوەیش بکەرەوە)). تائێستا هیچ نەخۆشێك نەیوتووە بیری لەم

یاسایانە کردبێتەوە. مەبەستی من تەنیاو تەنیا بەرز کردنەوەی هەستی کۆمەڵایەتی و هاوکاری ئەوانە. هەر لەگەڵ ئەوەی هەستی هاوکاری لەواندا دروست ببێت و خۆیان لەگەڵ کەسانی تر بێننە یەك ڕادە، چارەسەر بوون)). دوکتۆر ئولەر بەئێمە دەڵێ هەر ڕۆژێك کارێکی چاك ئەنجام بدەین. بەڵام کاری چاك چییە؟ موحەمەد، پێغەمبەری ئیسلام دەڵێت:((کاری چاك ئەوەیە بزەی شادی لەسەر ڕوخساری ئینسانێك دروست بکەن)).

بەڵام بۆچی یارمەتیدانی خەڵك و هەوڵ بۆ شادکردنیان دەبێ وەها کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر نەخۆشان هەبێت؟ چونکە هەوڵدان بۆ شادکردنی خەڵك ئەوان لەبیر کردنەوە لەخۆیان کە هۆکاری نەخۆشییەکەیانن دەگێڕێتەوە. خاتوو ویلیام تیمۆن پێویست نەبوو دوو هەفتە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی شادکردنی خەڵك و چارەسەری خۆی کات تەرخان بکات. ئایا ئەو بەیەك ڕۆژ بووە ئالفرێر ئولەر؟ ئەڵبەت وانیە! ئەو(١٣) جار لەو باشتر بوو. چونکە توانی لەیەك ڕۆژدا چارەسەر بێت نەك (١٤) ڕۆژ. ئەو ئەم کارەی بەیارمەتیدانی چەند هەتیو ئەنجامدا. بەسەرهاتەکەی بەم جۆرە بوو:((مانگی دیسەمبەری (٥) ساڵ لەمەوبەر پەژارە و خەمۆکی تەواوی دەروونی منی گرتبووەوە. لەپاش چەندین ساڵ ژیانی شاد هاوسەرەکەم لەدەستدابوو، بەنزیکبوونەوەی پشووی کریسمەس هەستم تادەهات خراپتر دەبوو. هەرگیز هیچ کریسمەسێکم بەتەنیا نەبردبووە سەر. زۆربەی دۆست و ناسراوەکان داوایان لەمن کردبوو کریسمەس لەگەڵ ئەوان بم، بەڵام تاقەتی هیچ جۆرە شادیو خۆشییەکم نەبوو. ڕۆژێك مابوو بۆ کریسمەس کچەکەم کاتژمێر (٣)ی دوانیوەڕۆ بەجێهێشت و لە شەقامەکاندا کە پڕبوو لەخەڵکی شادمان، پیاسەم دەکرد. ئەم دیمەنانە یادەوەرییەکانی ڕابردووی لەمێشکی مندا زیندوو دەکردەوەو ئەم فیکرە کە دەبێ بەتەنیا بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە قابیلی تەحەممول نەبوو. نەمەتوانی بەری فرمێسکەکانم بگرم. کاتژمێرێك کە هەروا بێ مەبەست دەسووڕامەوە خۆم لەبەرامبەری گەراجی پاسەکاندا بینییەوە بیرم هاتەوە من و هاوسەرەکەم بۆ بێ تاقەتی زۆر جار سوار پاسێك دەبووین کە نەماندەناسی، بۆیە سواری یەکەم پاس بووم کە هاتە پێشەوە. لەپاش ماوەیەك شۆفێرەکە ڕایگەیاند کۆتایی هێڵەکەیەو من دابەزیم. تەنانەت ناوی ئەو شارەم نەدەزانی. شارێکی بچووك و ئارام بوو. چاوەڕێ پاس بووم تابگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. لەم حاڵەدا کەمێك لەشەقامێکی

لاوەکیدا پیاسەم کرد. کاتێك لەپەنای کڵێسایەکەوە تێدەپەڕیم دەنگی ئۆرگ منی ڕاکێشایە ناوەوە. هیچ کەس لەژەنیاری کیبۆردەکە زیاتری لێنەبوو. بێ ئەوەی جێی سەرنج بم لەسەر یەکێك لەکورسیەکان دانیشتم. برسیەتی و مۆسیقا خەوی لێ خستم.

کاتێك بەئاگا بوومەوە نەمدەزانی لەکوێم. لەبەرامبەرمدا دوو منداڵ کە دیار بوو هاتبوون بۆ سەیری درەختی کریسمەس، وەستابوون. یەکێك لەوان کە کچێکی منداڵ بوو وتی:((پێموابێ پاپا نوئێل ئەوی هێناوە)). کاتێك هەستام منداڵەکان ترسان و من بەوانم وت ئازاریان پێ ناگەیەنم. پرسیارم لێکردن دایك و باوکیان لەکوێیە. بەڵام ئەوان هەتیو بوون. درەختی کریسمەسم پیشاندان و چکلێت و دیاریم بۆ کڕین. دەتگوت تەنیاییەکەم بە سیحرێك ڕەوییوەتەوە. ئەم تەجرەبەیە گرنگی شادکردنی خەڵك و پێویستی ئەوەی فێری من کرد. بۆم دەرکەوت کە شادی دەگوازرێتەوە، واتە بە شاد کردنی خەڵك شادییان لێوەردەگرین)). دەتوانم بە داستانی کەسانێك کە بە لەبیر کردنی خۆیان بە تەندروستی و شادمانی گەیشتوون، کتێبێك بنووسم. بۆ نموونە وەرن باس لەداستانی مارگرێت تایلۆرییتس بکەین. ئەو یەکێك لەژنانی بەرچاو لەناو هێزی دەریاوانی ئەمریکا بوو. ئەو ڕۆماننووسە، بەڵام هیچ کام لەڕۆمانەکانی بە ئەندازەی ئەو ڕووداوەی لەو بەیانیە وادە دراوەدا کە ژاپۆنیەکان هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی ئێمە لەپێرل، سەرنج ڕاکێش نیە. لەو کاتەدا زیاد لەیەك ساڵ دەبوو خاتوو ییتس بەهۆی نەخۆشی دڵەوە زۆربەی کات لەجێگەدا کەوتبوو. درێژترین ڕێگەیەك دەیتوانی بیبڕێت ڕێگەی چوونی بۆ ناو حەوشەی ماڵەکەی بوو بۆ خۆدانە بەر هەتاو. تەنانەت لەوحاڵەتەیشدا دەبوایە پاڵی بە خزمەتکارەکەیەوە بدایەتەوە. ئەو لەو کاتەدا چاوەڕێی چاکبوونەوە نەبوو، پێیوابوو تەواوی تەمەنی لەو وەزعەدا دەبێت. ئەڵبەت ئەگەر ئەو بەیانیە ژاپۆنیەکان هێرشیان نەکردنایەتە سەر بەندەری پێرل و ئەویان لەبێ دەربەستی دەرنەهێنایە هەروایش نەبوو.

((کاتێك ئەم شتە ڕوویدا هەموو شتێك تێکەڵ و پێکەڵ بوو. بۆمبێك ئەوەندە لەنزیکی ماڵی ئێمە هاتە خوارەوە کە شەپۆلەکەی منی لەتەختەکەم فڕێدا خوارەوە. سەیارە بار هەڵگرەکانی سوپا دەچوون بۆ پایەگا ئاسمانی و دەریاییەکان تاکو ژن و منداڵی سوپاییەکان بگوازنەوە بۆ قوتابخانەکان خاچی سوور تەلەفۆنی بۆ ئەو ماڵانە

بەدركی ژووری زیادەیان بوو تاكو خێزانی سوپاییەكان جێبكەنەوەو چونكە دەیانزانی من لەپەنای تەختەكەمدا تەلەفۆنم هەیە داوایان لەمن كرد وەكو ناوەندێكی زانیاری كار بكەمو ئاماری گواستنەوەكانم هەبێت. سوپاییەكان بۆ ئاگادار بوون لە شوێنی گواستنەوەی خێزانەكانیان تەلەفۆنیان بۆ من دەكرد.

هاوسەری من زیندوو بوو، من هەوڵم ئەدا كەسانێك كە لەحاڵی هاوسەرەكانیان بێ ئاگا بوون، شاد بكەمو لەگەڵ بێوەژناندا هاودەردی بكەم. سەرەتا بە خەوتنانەوە وەڵامی تەلەفۆنەكانم ئەدایەوە، پاشان لەسەر تەختەكەم دانیشتم. سەرەنجام ئەوەندە سەرگەرمو پرشەوق بووم كە نەخۆشی جەستەییم لەبیر كردو لەسەر كورسی پشت مێزەكەم دانیشتم. لەوەبەدواوە چیتر لە(٨) كاتژمێر شەوی خەوانەم زیاتر نەگەڕامەوە بۆ ناو جێگە. تێگەیشتم كە یارمەتی بەكەسانێك كە بارودۆخی خراپتر لەخۆمیان هەیە دەبێتە هۆی لەبیركردنی وەزعم. ئەگەر ژاپۆنیەكان هێرشیان نەكردایە تەواوی تەمەنم نیوە فەلەج دەمامەوە چونكە لەتەختەكەمدا ئاسوودە بوومو پیام ڕادەگەیشتن و بەردەبەرە خەریك بوو ئیرادەو مەیلی چاكبوونەوەم لەدەست ئەدا.

ڕووداوی بەندەری پریل یەكێك لەناخۆشترین بەڵاكانی ئەمریكا بوو، بەڵام بۆ من یەكێك لەباشترین ڕووداوەكان بوو. ئەم قەیرانە هێزێكی بە من بەخشی كە هەرگیز بیرم نەدەكردەوە بتوانم بەدەستی بێنم. ئەو كارەساتە تەركیزی منی لەسەر خۆمەوە گواستەوە سەر خەڵكو بووە هۆی ئەوەی لەژیاندا ئامانجێكی بنەڕەتیو گرنگ پەیدا بكەم. چیتر كاتی ئەوەم نەبوو بیر لەخۆم بكەمەوە)). یەك لەسەر سێ ئەو كەسانەی دەچن بۆ لای پزیشكی دەروونی دەتوانن بە شێوەی مارگرێت خۆیان دەرمان بكەن. واتە مەیل بۆ یارمەتیدانی خەڵك لەخۆیاندا دروست بكەن. ئەمە بۆچوونی من نیە، بەڵكو بۆچوونی كارل یۆنگە. ئەو دەڵێت:((نزیكی یەك لەسەر سێی نەخۆشەكانی من هیچ كێشەیەكی دەروونی كە حاڵەتی ڕاستەقینەی هەبێت نیانە، بەڵكو لەبێ مانایی و بۆش بوونی ژیانیان لەئازارو ڕەنجدان)). واتە كەسانێك كە ئاسوودە خوازن و دەیانەوێ كەسێ ئەوان لەژیانیاندا بگرێتە ئەستۆ، واتە لەشەمەندەفەری ژیان دوا لەكەونو هەموو كەسێك بێجگە لەخۆیان سەرزەنشت دەكەن.

لەوانەیە ئێستا بەخۆتان بڵێن:((ئەم داستانانە كاریگەری لەسەر من دروست ناكات. منیش ئەگەر لەجیاتی مارگارێت لەبەندەر بوومایە، یان شەوی كریسمەس ئەو دوو

هەتیوەم بدیایە هەر ئەو کارانەم دەکردو هەستم بۆیان دەردەبڕی، بەلام وەزعی من جیاوازە. من ژیانێکی یەکدەستم هەیە، هەشت کاتژمێر کار لەسەریەك تاقەت پڕووکێنەو هیچ ڕووداوێکی تایبەتم بۆ ڕوونادات. چۆن دەتوانم ئارەزوومەندی یارمەتیدانی خەڵك ببم؟ هەر بۆچی دەبێ ئەم کارە بکەم؟ چ سوودێکی بۆ من هەیە؟))

پرسیارێکی دادگەرانەیە. هەر چەندە ژیانی ئێوە یەکدەست بێت، بەهەرحاڵ چەند کەسێك لەڕۆژدا دەبینن. چ هەڵس و کەوتێکتان لەگەڵ ئەوان هەیە؟ ئایا بەبێ دەربەستی سەیری ئەوان دەکەن یان گرنگی نادەنە هەستەکانی ئەوان؟ بۆ نموونە نامەبەری گەڕەکەتان. ئایا دەزانن ماڵی لەکوێیە؟ هەرگیز داواتان لێکردووە وێنەی هاوسەرو منداڵەکانیتان پیشان بدات؟ ئەی شاگردی سۆپەرمارکێت؟ یان ڕۆژنامە فرۆش. یان بۆیاخچی سەر سووچی شەقامەکە؟ ئایا هەرگیز ئارەزوومەندییەك بۆ ئەوان یان ژیانی ئەوانتان پیشان داوە؟ هیچ پێویست ناکات تۆ چاکسازێکی کۆمەڵایەتی یان فلۆرانس نایتینگەلی دووەم بیت هەتا دنیا بگۆڕیت ئەوەندە بەسە دنیای تایبەتی خۆت بگۆڕیت. دەتوانی هەر لەبەیانییەوە دەست بەم کارە بکەیت.

چ سوودێکی هەیە بۆتان؟ شادمانی، ڕازی بوون و هەیبەت. ئەرەستۆ ئەم حاڵەتە بە ((لەخۆبایی بوونی پیرۆز)) ناودەبات. زەردەشت دەڵێت:((یارمەتیدانی خەڵك ئەرك نیە، بەڵکو چێژە چونکە شادمانی و تەندروستی مرۆڤ زیاد دەکات)). بنجامین فرانکلینیش بەکورتی و بە شێوەیەکی سادە دەڵێت:((کاتێك چاکە لەگەڵ خەڵك دەکەن لە ڕاستیدا خەریکن باشترین کار بۆ خۆتان ئەکەن)).

بیر کردنەوە لەخەڵك نەك هەر ئێوە لەنیگەرانی دوور دەخاتەوە بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی دۆستانێکی زۆر بە دەست بێنن. بەلام چۆن؟ منیش ئەم پرسیارەم لەپرۆفیسۆر ویلیام لیۆن فیلیپس کردو ئەو ئاوا وەڵامی دامەوە: ((ڕێناکەوێت بچمە هۆتێل، دوکان یان سەرتاشخانەیەك ببم و قسەیەکی خۆش لەگەڵ کەسانێك لەوێن، ئەکەم هەوڵ ئەدەم بەم قسانە لەگەڵ ئەواندا وەکو کەسێکی جیاواز نەك چەرخێکی لەماتۆڕی کۆمەڵدا هەڵس و کەوت بکەم. بۆ نموونە کچێك کە لەدوکانێك فرۆشیارە، پێی دەڵێم چاوی یان قژی زۆر جوانە، یان پرسیار لەکابرای سەرتاش دەکەم ئایا لەوەی بەردەوام بەسەرپێوەیە قاچی نایەشێت؟ لەوانەیە بپرسم تا ئێستا چەند سەری تاشیوە یان چۆن بووە هاتووەتە ناو ئەم کارە. پیشاندانی ئارەزوومەندی سەبارەت بە خەڵك ئەوان



 

پڕ لەشادی دەکات. زۆربەی کات دەست لەگەڵ ئەو خزمەتگوزارە لێ ئەدەمەوە کە جانتاکانی منی هەڵگرتووە و ئەم کارە ئەم شادمانو پڕ وزە دەکات. جارێك لەشەمەندەفەردا بۆ خواردنی نیوەڕۆ چوومە ڕیستۆرانەکەی. ئەو ڕۆژە هاوینیە بە شێوەی نائاسایی گەرم بوو، ڕیستۆرانەکە بەو هەموو خەڵکە وەکو کورەی لێهاتبوو. ماوەیەکی زۆری پێچوو تا کابرا خشتەی خواردنەکانی بۆ هێنام. بەوم وت:((ئەڵبەت چێشت لێنەرەکان لەچێشتخانەکە چاك چاك گەرمایانە)). کابرا دەستی کرد بە بۆڵە بۆڵ. سەرەتا وامزانی بەسەر مندا بۆڵە بۆڵ دەکات، بەلام گوێم گرت دەڵێت:((هەمووان گلەیی دەکەن. (١٩) ساڵە گوێ لەم پرتەو بۆڵانە دەگرم، بەلام ئێوە یەکەم کەسن لەبیری چێشت لێنەرەکاندان. خۆزگە گەشتیاری وەکو ئێوە زۆر بوایە)). ئەو شتەی خەڵك چاوەڕێی دەکەن لەئێوە تەنیا کەمێك سەرنجە. جاری وایە کە بەشەقامەکاندا دەڕۆمو پیاوێك لەگەڵ سەگەکەی دەبینم دەربارەی جوانی سەگ شتێکی پێدەڵێم. چەند هەنگاوێك کە ڕەت دەبم، دەگەڕێمەوەو دەبینم ئەو کابرایە خەریکە نازی سەگەکەی دەکێشێ. ئافەرینی من دەبێتە هۆی ئەوەی ئافەرینی ئەوان نوێ ببێتەوە.

جارێك شوانێکم بینیو وتم بە بڕوای من سەگەکەی ئەو نموونەیە. داوام لێکرد بۆم بگێڕێتەوە چۆن پەروەردەی کردووە. کاتێك وتوویژ تەواو بوو گەڕامەوەو بینیم قاچەکانی پێشەوەی لەسەر شانی شوانەکە داناوەو شوانەکە نازی دەکێشێت. بەم کارە هەم شوانەکە، هەم سەگو هەم خۆم شاد کردبوو)).

ئایا بەبڕوای ئێوە کەسێك کە ئاوا هەڵسو کەوت دەکات هەرگیز پێویستی بە پزیشکی دەروونی دەبێ؟ نا. بەهیچ جۆرێك. پەندێك هەیە ئاوا دەڵێت:((ئەو دەستەی گوڵی سوور ئەدا بەدیاری خۆیشی بۆنی خۆش دەبێت)).

ئەکا بیر بکەنەوە ئەم قسانە هەمووی پڕوپاگەندەی ئایینیە؟ لەوانەیە بەخۆتان بڵێن هەر حیسابیش بۆ خەڵك ناکەنو دەتانەوێ شوێن پارە پەیداکردن بکەون. ئەگەر وایە حەقتانە شوێن مەبەستەکەی خۆتان بکەون بەلام لەم حاڵەتەدا ئەڵبەت هەموو فەیلەسوفانو مامۆستایانی مرۆڤایەتی هەڵەیان کردووە. هەموو گەورەکان تەنانەت ڕەشبین ترینەکانیش دانیان بەمەدا ناوە کە ئەگەر تەنیا لەفیکری خۆتاندابن بەهرەیەکی زۆر لەژیان نابەن.

تیئۆدۆر درایزەر دەڵێت:((ئەگەر قەراربێت مرۆڤ چێژ لەژیانی وەربگرێت، دەبێ هەوڵ بدات ژیان نەك هەر بۆ خۆی، بەڵکو بۆ کەسانی تریش خۆش بکات، چونکە شادی ئینسان لەگرێوی شادی خەڵکدایە)).

**یاسای حەوتەم** بۆ نەهێشتنی نیگەرانیو دروستکردنی ڕوانگەیەکی بنیاتنەر: خۆتان لەڕێگەی گوێدان بە خەڵك فەرامۆش کەن. هەموو ڕۆژێك کارێکی چاکە ئەنجام بدەن هەتا بزەیەکی ڕەزامەندی لەسەر لێوی مرۆڤێك دروست بکەن.

## کورتەی بەشی چوارەم

# حەوت ڕێگە بۆ دروستکردنی ڕوانینێکی بنیاتنەر

**یاسای یەکەم:** وەرن با مێشکی خۆمان بە ئەندێشەی تەندروستو هیواو دۆستی پڕکەین چونکە ژیانی ئێمە هەر ئەو شتەیە کە فیکری ئێمە دروستی دەکات.

**یاسای دووەم:** هەرگیز نەفرەتمان لەدوژمنان نەبێت چونکە بەم کارە زیاتر زیان بەخۆمان ئەگەیەنین، تەنانەت یەك خولەکیش کات بۆ بیرکردنەوە لەو کەسانە نەکەینەوە کە خۆشمان ناوێن.

یاسای سێهەم:

١- لەجیاتی دڵ ئێشان لەناسووپاسی لەبیرمان بێت کە لەو (١٠) کەسە گولەی کە بەدەستی عیسا شیفایان پەیدا کرد تەنیا یەك کەسیان سووپاسی ئەوی کرد. نابێ زیاتر لەعیسا چاوەڕێی پێزانین بین.

٢- لەبیرمان بێت کە باشترین ڕێگەی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی بەخششە بەبێ چاوەڕوانی سوپاس.

٣- بزانین کە سوپاسو قەدرو پێزانین سەمەرەی پەروەردەیەکی دروستە. کەواتە ئەگەر دەمانەوێ منداڵێنێکی قەدرزانمان هەبێت دەبێ فێریان بکەین وابن.

**یاسای چوارەم:** نیعمەتەکانتان ببژێرن نەك کێشەکانتان.

**یاسای پێنجەم:** وەرن بالاسایی خەڵك نەکەینەوە، بەپێچەوانەوە خۆمان بناسینو خۆمان بین.((ئیرەیی نەزانینەو لاسایی کردنەوە خۆکوشتنە)).

**یاسای شەشەم:** کاتێك ڕۆژگار لیمۆیەك دەکاتە نەسیبتان دەبێ شەربەتی لێ دروست بکەن.

**یاسای حەوتەم:** وەرن بەدیاری کردنی کەمێك شادی بۆ خەڵك خەمی خۆمان لەبیر بەرینەوە.(( کاتێك چاکە لەگەڵ خەڵك دەکەن لەڕاستیدا باشترین خزمەت بە خۆتان ئەکەن)).

بابەتی یەکەم

## دایكو باوكم چۆن بەسەر نیگەرانیەكانیاندا زاڵ دەبوون؟

هەروا كە لەوەپێشیش وتم من لەكێڵگەیەك لەمیسۆری لەدایك بووم و گەورە بووم.
وەكو زۆربەی خاوەن كێڵگەكان ژیانی ئێمە لەو كاتەدا سەخت بوو، دایكو باوكم زۆر قانع بوون. باوكم لە مەزراكە كاری دەكرد و دایكم مامۆستا بوو. ئەو نەك جلەكانی ئێمەی دەدوری بەڵكو ئەو سابوو نەكەشی خۆی دروستی ئەكرد كە جلەكانمانی پێ ئەشۆرد.

زۆر كەم پارەی دانراومان هەبوو، بێجگە لە یەك جار لە ساڵدا كە بەرازەكانمان دەفرۆشت. هێلكەو ڕۆنە كەرەمان لەگەڵ قاوەو شەكرو ئاردا ئەگۆڕییەوە. هەموو ڕۆژێك یەك میل پیادەڕەویم دەكرد تادەگەیشتمە قوتابخانە. تەنانەت كاتێك پلەی سەرما گەیشتە ٢٨پلە، دیسان بەپێ دەچوم بۆ قوتابخانە، تا ١٤ساڵی پۆتینم نەبوو، كاتێك منداڵبووم نەگونجاو دەهاتە پێش چاوم كەقاچی ئینسان لە زستاندا وشك ببێت.

لەگەڵ ئەوەی دایكو باوكم ڕۆژانە ١٦ كاتژمێر كاریان دەكرد بەو حاڵەیشەوە هەمیشە قەرزارو چارە ڕش بووین. یەكێك لەیادەوەرییەكانی منداڵیم دیمەنێكە كە لافاوی ڕوبارەكە تەواوی كێڵگە گەنمەشامی و ئالفەكانی ئێمەی لەناوبرد. لەماوەی ٧ ساڵدا ٦ ساڵی بەروبومی ئێمە بە هۆی لافاوەوە لەناوچوو، هەموو ساڵێك بەرازەكانمان بەهۆی كۆلێراوە دەمردن و ئێمە ناچار دەبووین بیانسوتێنین. ئێستاش دەتوانم بۆنی توندی سووتانی گۆشتی بەراز هەست پێبكەم..

ساڵێك لافاو نەهات و ئێمە گەنمەشامی زۆرمان دوورییەوە. بەرازمان كڕی و گەورە مان كرد؟ بەڵام ئەگەر لافاویش بهاتایە هیچ لەوەزعەكە نەدەگۆڕا، چونكە نرخی بەرازی

پەروار لەبازاڕدا دابەزی و هیچمان دەست نەکەوت. هەر کارێکمان دەکرد زیانی مادیمان پێدەگەیشت.

لەبیرمە باوکم چەند دانە جاشەکەری کڕی و سێ ساڵی تەواو بەخێوی کردن، بەڵام ئاخری لەژێر نرخەکەی خۆیەوە فرۆشتنی.. لەپاش ١٠ ساڵ کاری سەخت و تاقەت پڕووکێن نەک یەک پەنابامان نەبوو، بەڵکو زۆریش قەرزار بوبووین. کێڵگەکەی بەکرێگرتە بوو، باوکم بەردەوام لەلایەن بانکەوە هەڕەشەی لێدەکرا ئەگەر قەرزەکانی نەداتەوە کێڵگەکەمان لێ دەسێنن.

باوکم تەمەنی ٤٧ ساڵ بوو، لەپاش ٣٠ ساڵ کاری سەخت لەقەرزاری زیاتر هیچی نەبوو. ئەم دۆخە بۆ ئەو تەحەممول نەدەکرا.. تەندروستی و خۆراکی لەدەست چوو.. لەپاش ئەو هەموو کارە سەختە لەمەزراکەدا دەبوایە بۆ ئەوەی ئیشتیای بچوایەتە سەر خۆراک دەرمانی خۆراکردنی بخواردایە. دایکم لەم دواییانەدا دەیوت کاتێک باوکم بۆ دۆشینی مانگاکان دەرۆیشت و درەنگ ئەگەڕایەوە، ئەو دەترسا باوکم خۆی کوشتبێت. ڕۆژێک کە لەبانک گەڕابووەوە و دیسان ئاگاداری هەڵوەشانەوەی ڕەهنی زەوییەکەی پێبوو، لەسەر پردێک وەستابوو، ماوەیەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا تێکەوتبوو ئایا لەپردەکەوە خۆی بخاتە ناو ڕوبارەکەو کۆتایی بەژیانی بێنێت یان نا؟

چەند ساڵ دوای ئەوە باوکم بۆی گێڕامەوە تەنیا هۆکارێک کە خۆی لەپردەکەوە نەخستبووە خوارەوە ئەوەبوو کە ژنەکەی هەمیشە بڕوای بەوە بوو ئەگەر ئیمانمان بە بەزەیی خودا هەبێت و گوێڕایەڵی فرمانەکانی بین، هەموو شتێک بەڕێی خێردا دەڕوات. دایکم ڕاستی دەکرد.. سەرەنجام هەموو شتێک بەخێر تەواو بوو، باوکم ٤٢ ساڵی تری لەشادی و کامەرانیدا بردە سەر.

لەماوەی ساڵانی دەستتەنگی و کاری سەختدا دایکم هەرگیز دوچاری ترس و نیگەرانی نەبوو. ئەو ناڕەحەتییەکانی خۆی لەسەر نوێژو کاتی دوعادا لەگەڵ خودا باس دەکردو هەموو شەوێک بەشێک لەئینجیلی دەخوێندەوە.. ویلیام جیمز کاتێک مامۆستای فەلسەفە بوو لەزانکۆی هارڤارد دەیوت: ((باشترین دەرمانی نیگەرانی باوەڕی ئایینیە))..

دایکم داوای لەمن دەکرد خۆم بکەمە وەقفی ئایین. سەرەتا دەمویست ببمە مەوعیزەگەری بیانی، کەواتە چوون بۆ زانکۆو لەگەڵ ڕابوونی چەند ساڵێک گەلێک

گۆڕانکاری لەمندا دروست بوو. ئیکۆلۆژی، زانست، فەلسەفەو ئایینەکانی ترم دەخوێندەوەو دەربارەی هەندێك پەروەردەو بۆچوونی دۆگماکان دوچاری گومان و ناباوەڕی بووم. ئەم شتە منی سەر لێ شێواو کردبوو، چونکە نەمەزانی باوەڕم بەچی بێت. چیتر واتایەکم لەژیاندا نەدەبینی و دەستم لەنوێژکردن هەڵگرت، پرسیاری زۆر لەمێشکمدا دروست بوبو.

ئایا تا ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارانە دەزانم؟ نا. هیچ کەس ناتوانێت ڕەمزو نهێنی ئەم جیهانە پێناسە بکات. دروست وەکو ئەوە وایە ئێمە دەربارەی مەکینەی ئۆتۆمبێل، کارەبا یان تەنانەت لەشی خۆمان زانیاری تەواومان نەبێت، بەڵام نەبوونی زانیاری دەبێتە هۆی ئەوەی سوودی لێوەرنەگرین؟ ئەوەی کە من لەنهێنی ئایینی و دوعا تێنەگەم نابێتە هۆی ئەوەی نەتوانم لەو ژیانی بەپیت و خۆشترەی ئایین دروستی دەکات چێژ وەرگرم.

فەیلەسوفی بەناوبانگ، سانتیانا دەڵێت:((مرۆڤ نەخولقاوە بۆ ئەوەی سەر لەکاری ژیان دەربێنێت، بەڵکو خولقاوە بۆ ئەوەی بژی)).

ئەم شتانە بووە هۆی ئەوەی من تێگەیشتنێکی نوێم لەئایین هەبێت. چیتر هیچ ئارەزوومەندی جیاوازییە جیاکەرەوەکانی کلیسانیم بەڵکو ئارەزوومەندی خزمەتێکم کە ئایین بە مرۆڤی دەکات. ئایین ئیمان، هیواو دڵنیری دێنێتە بەرهەم. ترس و نیگەرانی و کێشە لەمرۆڤ دوور دەخاتەوەو ئامانج و ڕەهەند بە ژیانی دەبەخشێت. فرانسیس بیکۆن(٣٥٠) ساڵ لەمەوبەر دەیوت:((زانینی کەمی فەلسەفە مێشکی ئینسان بەرەو بێ ئیمانی دەبات، بەڵام زانینی قووڵی فەلسەفە دەگاتە ئامانج)).

لەبیرمە سەردەمێك خەڵك دەربارەی دژایەتی نێوان زانست و ئایین قسەیان دەکرد، بەڵام ئێستا ئەم بابەتە کۆن بووە چونکە زانست گەلێکی نوێ وەکو دەروونناسی ئەو شتە ئەڵێت کە مەسیح دەیوت. بۆچی؟ چونکە دەروونناسان تێگەیشتوون کە دوعا و باوەڕی ئایینی ترس و نیگەرانی لەناو دەبات. ئەوان دەزانن:((کەسێك کە بەهێزو بەقووڵی ئایینی بێت، هەرگیز دەروونی پەشێو نابێت)).

ئەمڕۆ کە دەروونناسان ڕۆڵی مەوعیزەگەرانی نوێ دەگێڕن. ئەوان بەئێمە نالێن ئایینی بین هەتا لەئاگری دۆزەخ بپارێزرێن، بەڵکو دەڵێن ئایینی بین تاکو لەئاگری

دۆزەخی ئەم دنیایە کە ترس و نیگەرانی و نەخۆشی عەسەبی و دەروونیە، پارێزراو بین.

مەسیح دەڵێت:((تەنیا دروشتی بناغەیی لەئاییندا هەیە: ئەوەی کە عاشقی خواوەندبین و دراوسێکان و کەسانی دەوروبەرمان وەکو خۆمان خۆش بوێت)).

هەرکەس ئەم کارە بکات زانراوو نەزانراو ئاییینیە. بۆ نموونە خەزوورەی من ناچێ بۆ کلێسا، بەڵام یاساکان و ئەوشتەی وەحی دەیڵێت بەتەواوی بەڕێوەی دەبات و خۆی بە ئائیرادی دەزانێت. بەڵام ئەو شتەی ئینسان دەکاتە مەسیحی نە وەرگرتنی عەقڵانی ئەوە لەسەر باوەڕێکی تایبەت و نەهەماهەنگی ئەو لەگەڵ یاسایە، بەڵکو هەبوونی ڕۆحی ئاییینیە و بەشداری کردنە لەشێوەیەکی تایبەت لەژیاندا.

ئەگەر لەبیرمان بێت وتم کە دادوەرانی ئەو کێبەرکێیەی دامنابوو لەنێوان دوو نامەدا هیچ جیاوازییەکیان دانەنا. یەکەم داستانمان خوێندەوەو ئێستا دەچینە سەر دووەم داستان. داستانی ژنێك کە بۆی دەرکەوت بەبێ خودا ناتوانێت ژیان بەرەوپێش بچێت. ناوی ئەو ناڵێم و ناوی ماری کوشمەن بەکار دێنم. چونکە ئەو نەوەو منداڵانێکی هەیە کە لەوانەیە لەناو هێنانی ئەو ڕازی نەبن. بەهەرحاڵ داستانەکە تەواوی ڕاستە. بەم جۆرەیە:

((لەدەورانی دابەزینی ئابووری ئەمریکادا هاوسەرەکەی من لەحەفتەدا(١٨) دۆلار دەرماڵەی هەبوو. جاری وابوو ئەم (١٨) دۆلارەیشمان دەست نەدەکەوت، چونکە کاتێك مێردەکەم بە هۆی نەخۆشی پشووی وەردەگرت دەرماڵەیەکی وەرنەدەگرت و بەداخەوە دوچاری نەخۆشی جۆراو جۆر بوو. ئەو خانووە بچووکەی بەدەستی خۆمان دروستمان کردبوو لەدەستماندا. پەنجا دۆلاریش قەرزاری دوکاندارێك بووین.

من جلم بۆ دراوسێکان دەشۆرد و لەجلی کۆن جلم بۆ (٥)منداڵەکەم دابین دەکرد. ڕۆژێك ئەو کابرا دووکاندارەی(٥٠) دۆلارەکەیمان لابوو کوڕە پانزە ساڵەکەی تۆمەت بارکرد بە دزینی چەند دانە قەڵەم دار. کوڕەکەم ئەم بەسەرهاتەی بۆ من گێڕایەوەو من دەمزانی ئەو زۆری پێناخۆش بووەو سووکایەتی پێکراوە. ئەم ڕووداوە بوو کە تەنگی بەمن هەڵچنی و بێزاری کردم. ئەوەندە شێت ببووم کە کچە پێنج ساڵەکەمم برد بۆ ژووری نووستنەکەم و کون وکەلەبەرم گرت و بەلۆعەی غازم کردەوەو بە کچەکەمم وت لەسەر تەختەکە لەپاڵ مندا ڕاکشێت هەتا کەمێك بخەوین. هەروا کە دەنگی غازەکەم

لەبۆرییەکەیەوە دەبیست دەنگی مۆسیقا لەچێشتخانەکەوە دەهات. لەبیرم چبوو رادیۆکە بکوژێنمەوەو ئەم مۆسیقا کۆنەی بلاو دەکردەوە:

مەسیح چ دۆستێکی پڕ بەهایە

کەتاوانەکانی ئێمە دەگرێتە ئەستۆی خۆی

چ ئارامی و ئۆقرەییەك کە دەتوانین

هەموو کێشەکانمان لەگەڵ خودا باس بکەین

ئاخ! جاری وایە ئەو ئۆقرەیی لەنا و دەبەین و

بێهوودە ڕەنج دەکێشین

چونکە هەمووشتێك لای خودا باس ناکەین

کاتێك ئەم گۆرانیەم بیست پەیم بە هەڵەی خۆم برد. تەواوی ئەم ماوەیە هەوڵم دابوو بەتەنیا کێشەکانم بگرمە ئەستۆ. هەستام، پەنجەرەکانم کردەوەو تەواوی ئەو رۆژەم بە دۆعاو پارانەوە بردە سەر. هێدی هێدی دەتگوت دۆعاکانم وەرگیرابێت، دۆخەکە تۆزێك باش بوو. لەیانەیەك کارم پەیدا کرد. یەکێك لەکوڕەکانم بۆ ئەوەی خەرجی زانکۆکەی دەربێنێت لەکێڵگەیەك کاری دەکردو من جار جار گۆرەویم دەفرۆشت. ئێستا منداڵەکانم گەورە بوون و سێ نەوەی زۆر چاکم هەیە. جاری وایە لەوەی دەمویست خۆم بکوژم هەست بەشەرمەزاری دەکەم. بەو کەسانەی دەیانەوێ خۆیان بکوژن دەڵێم تەمەنی سەختی و چارەڕەشیەکان کورتن. هەرگیز دەست نەدەنە ئەم کارە بێ عەقلانەیە)).

دوکتۆر کارل یۆنگ دەنووسێت: لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا کەسانێك لەوڵاتە پێشکەوتووەکانەوە ڕاوێژیان لەگەڵ من کردوەو سەدان نەخۆشم چارەسەر کردووە. لەناو تەواوی نەخۆشەکانی سەرووی (٣٥) ساڵەوە یەك نەخۆش نەبوو کە گرفتە سەرەکیەکەی پەیدا کردنی ڕوانگەی ئایینی سەبارەت بەجیهان نەبێت. بەشەهامەتەوە دەتوانین بڵێین هەرکام لەوان ئەو شتەی ئایینەکانی دنیا لەسەدە بەردەوامەکاندا بەپێڕەوانی خۆیان بەخشیوە، ونیان کردووەو هیچ کام لەوان بەبێ دۆزینەوەی ڕوانگەی ئایینی چاك نابن)).

ویلیام جیمز دەڵێت:((ئیمان یەکێکە هێزە گرنگەکانی مرۆڤو نەبوونی نشستە)). تەنانەت مەهاتما گاندی ئەگەر باوەڕی پتەوی نەبوایە دوچاری شکست دەبوو. ئەمە

خۆی لەژیاننامەکەیدا دەنووسێت:((ئەگەر دوعا نەبوایە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر شێت دەبووم)).

کاتێك بێ هیواو دەستەوستان دەکەوین زۆربەی کات ڕوودەکەینە خودا. پەندێکی کۆن دەڵێت:((لەبنکی چاڵدا هیچ کافرێك نابینیت)). بەڵام بۆچی ئەوەندە سەبر بکەین هەتا داماو بێ هیوا بکەوین. چونکە هێزی خۆمان ڕۆژانە بەدوعا پتەو نەکەین تا نەگەینە ڕادەی بێ هیوایی؟ هەرکات هەست دەکەم فشاری کارو کەمی کات منی لەمەعنەویات دوور کردووەتەوە زوو خۆم دەگەیەنمە کلیسایەك تا ئەندێشەکانم بلاو بکەمەوە.

لەماوەی شەش ساڵێك کە خەریکی نووسینی ئەم کتێبە بووم سەدان حاڵەتم خستووەتە بەر لێکۆڵینەوە لەو کەسانەی توانیویانە بە هێزی دوعا بەسەر کێشەکانیاندا سەرکەون. وەرن بۆ نموونە بەسەرهاتی کتێب فرۆشێك بەناوی ئانتۆنی لەبەرچاو بگرین:

((بیست و دوو ساڵ لەمەوبەر نووسینگەی پارێزەری خۆمم داخست هەتا نوێنەرایەتی کۆمپانیایەکی کتێبە یاساییەکانی ئەمریکایی بەدەستەوە بگرم. شارەزایی من فرۆشی کۆمەڵێك کتێبی یاسایی بوو بەپارێزەران. کتێب گەلێك کە بۆ پارێزەرانی زۆر پێویست بوو. بۆ ئەم کارە پەروەردەی تەواوم بینیبوو، دەمتوانی تەواوی کۆبوونەوەکان بەڕێوەبەرم و لەبەرامبەری هەر ڕەخنەیەکدا وەڵامی گونجاو بدەمەوە. لەپێش هەر دیدارێکدا لەبارەی ئەو کەسەوە کەمێك زانیاریم کۆدەکردەوەو لەدیدارەکەدا بەشارەزایی تەواوەوە سوودم لێوەردەگرت. تەنیا کێشەم ئەوە بوو کە هیچ داواکارییەکم بە دەست نەدەگەیشت.

بەرەبەرە شەهامەت و بڕوابەخۆ بوونم لەدەستداو ئەو پارەیەی دەستم دەکەوت بەشی بژێوی ژیانمی نەدەکرد. چیتر لەوەی بۆ پەیداکردنی بازاڕ دیدار لەگەڵ خەلك بکەم دەترسام. زۆربەی کات لەپشتی نووسینگەی پارێزەرەکانەوە دەوەستام یان لەبیناکە دەڕۆیشتمە دەرەوەو تۆزێك پیاسەم دەکردو دیسان دەگەڕامەوەو بەوەها ترسێکەوە دەرگام دەکردەوە کە ئاواتم دەخواست کڕیارەکە لەنوسینگەکەی نەبێت.

وەزعی پارەم زۆر خراپ بوو، کۆمپانیاکە ئاگاداری کردبوومەوە ئەگەر نەتوانم بازاڕی زیاتر پەیدا بکەم یارمەتیەکەی دەبڕێت. هاوسەرەکەیشم بەردەوام داوای



 

پارەی دەکرد هەتا پارەی پسوولەکان بدات و پێداویستی (٣)منداڵەکەمان دابین بکات. نووسینگەی پارێزەرییەکەیشم لەشارەکەی خۆمدا داخستبوو، موشتەرییەکانم لەدەست چبوو. نەپارەی کرینی بلیتم پێبوو بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە و نەپارەی هوتێل. گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم لەتاو داماوی دەمویست خۆم لەپەنجەرەکەوە فڕێدەمە خوارەوە، بەڵام نەمەوێرا. نەمدەزانی واتای ژیان چیەو بۆچی دەبێ ئەوەندە ئازار بکێشم.

بەهۆی ئەوەی هیچ یارمەتی و فریاد ڕەسێکم نەبوو ڕوو لەخودا کردو داوام لێکرد ڕووناکیەکم بۆ بنێرێت و من لەم تاریکیە ڕزگار بکات. داوام لەخودا کرد یارمەتیم بدات کتێبەکانم بفرۆشم خەرجی ژن و منداڵەکانم پەیدا بکەم.

چاوم کردەوە ئینجیلێک لەسەر مێزەکە بوو. هەڵمگرت و مژدەکانی مەسیحم خوێندەوە کە دەیوت:

((خەمی ژیان مەخۆن کەچی دەخۆن و چی دەنۆشن. خەمی گیان و لەشیشتان نەبێ کەچی لەبەردەکەن. ئایا ژیان ئەم خۆراك و پۆشاکەیە؟ سەیری باڵندەکان بکەن کە نەدەکێڵن و نەدروێنە دەکەن و نەکۆدەکەنەوە، بەڵام نیعمەتی خواوەند ڕسق و ڕۆزییان دەگەیەنێت. ئایا ئێوە لەوان گەورەترنین؟ بۆیە سەرەتا ڕوویکەنە قاپی خوداو دروستکاربن. ئەو کاتە تەواوی ئەم شتانە بەدەست دێنن)). لەپاش دوعاو خوێندنەوەی ئەم بەشە موعجیزەیەك ڕوویدا. ترس و نیگەرانیەکانم ڕەوینەوەو بەمتمانە لەدڵەوەو ئیمانێکی سەرکەووتوانە خەوتم.

بەیانی ڕۆژی دوایی بۆ دیداری موشتەرییەکانی زۆر پڕشەوق بووم. بەمتمانەی تەواوەوەو بڕوا بەخۆ بوون چوومە نووسینگەی یەکەم موشتەری و دەم بەپێکەنین و بەسەر بەرزی خۆمم پێ ناساند. ئەو ڕۆژە گرێبەستی زۆرم پێگەیاند. لەو ڕۆژە بەدواوە بوومە ئینسانێکی نوێ و گرێبەستەکانم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبوو. ئەو شەوە، (٢٢) ساڵ لەمەوبەر دەتگوت دیسان لەدایك بوومەتەوە. بەیانی ئەو شەوە ڕواڵەتم هەر ئەو ڕواڵەتە بوو کە چەندەها حەفتە شکستی بەدیاری بۆ هێنابووم، بەڵام شتێك لەدەروونمدا گۆڕابوو. هێزێکی گەورەکە لەپێوەندیمەوە لەگەڵ خودا سەرچاوەی گرتبوو. مرۆڤی تەنیا بەئاسانی شکست دەخوات، بەڵام مرۆڤێك لەهێزی بێ زەواڵی خودایی لەدەروونیدا زیندووە شکست ناخوات. ئەمەم لەژیانی خۆمدا تەجرەبە کرد

که داوا بکەن تا پێتان بدرێت. تەقە لەدەرگا بدەن هەتا لێتان بکرێتەوە. کاتێك خاتوو ئەل سی بێرد خەڵکی ئیلینۆیز ڕوو بەڕووی بەلایەك بووەوە، دۆزییەوە کە چۆك دادان و وتنەوەی ئەم دوعایە دەتوانێت بگاتە ئارامی و ئۆقرەیی:((خودایە ئیرادەی تۆ موقەدەر بێت، نەك خواستی من)).

ئەو لەنامەکەیدا بۆمن ئاوای نووسیوە:((ڕۆژێك عسر زەنگی تەلەفون لێدرا. (١٤) جار جەرەس لێدرا تامن بوێرم و وەلامی بدەمەوە. دەتوانم لەنەخۆشخانەوە تەلەفۆن دەکەن. کورە بچکۆلەکەم نەخۆشی مەنەنژیتی هەبوو، من هەرسات لەترسی ئەوەدا بووم هەواڵێکی خراپم پێبگات. پزیشکەکان دەترسان نەخۆشیەکە چووبێتە ناو مێشکی کە لەوحاڵەتەدا ئەگەری دروست بوونی تۆمۆرو پاشانی مەرگی هەبوو.....بەڵێ، تەلەفونەکە لەلایەن نەخۆشخانەوە بوو، پزیشکی کورەکەمان داوایکرد بە پەلە بچم بۆ ئەوێ.

لەوانەیە بتوانن ئەو ترسەی من و هاوسەرەکەم لەژووری چاوەڕوانیدا هەمانبوو بیهێننە بەرچاو. هەمووان منداڵەکانیان لەباوەشدا بوو، بەلام ئێمە باوەشمان بەتاڵبوو، ئاواتی ئەوەمان دەکرد بتوانین جارێکی تر کورەکەمان لەئامێزبگرین. کە چوینە ژوورەوە روخساری پزیشکەکە دەروونی ئێمەی پڕ لەترس کردو وتەکانی ترسی ئێمەی زیاد کرد. ئەو وتی تەنیا ٢٠٪ ئەگەری زیندوومانی کورەکەمان هەیەو داوای لێکردین ئەگەر پزیشکێکی تر دەناسین بچین بۆ لای.

لەئوتومبیلەکەدا هاوسەرەکەم گریاو وتی لەدەستدانی ئەو منداڵەی پێ تەحەموول ناکرێت. پێکەوە قسەمان کردو بڕیارماندا بچین بۆ کڵێساو داوا لەخوا بکەین ئیرادەی ئەو موقەدەر بێت نەك خواستی ئێمە. لەکڵێسا ئەم وشانەم وتەوەو هەر لەوساتەدا ئۆقرەیی بەسەرمندا زاڵبوو.

ئەو شەوە بەئاسوودەیی خەوتم. چەند ڕۆژ دوای ئەوە دکتۆر تەلەفۆنیکردو وتی کورەکەمان ئەو قەیرانەی تێپەڕاندووە))..

پیاوانێك دەناسم کە ئایین تایبەت بە ژنان و منداڵان دەزانن. ئەوان پێیان وایە پیاوانی راستەقینەی تەنیا شەڕ دەکەن و بێ یارمەتی سەردەکەون. بەلام ئایا ئەم کەسانە دەزانن کە زۆرێك لەپیاوانی دنیا هەموو ڕۆژێك دوعا دەکەن؟ جەك دەمپیسی دەیوت هەرگیز بەبێ دوعاکردن ناچێتە ناو جێگە یان بەبێ شوکرانە بژێری نان

ناخوات. ئەم قارەمانەی یاری و بۆکسێن لەپێش لێدانی زەنگی هەر راندێکی یارییەکەش دوعا دەکات تاکو خواوەند لەسەرکەوتندا یارمەتی بدات.

ئێدی رێکنباکەر بڕوای وایە دوعا ژیانی ئەوی پاراستووە. ئەو هەموو رۆژێك دوعا دەکات. کانی مەك دەڵێ بەبێ دوعاکردن خەوی لێناکەوێت.

کاتێك ژەنراڵ ئایزنهاوەر بە فرۆکە چوو بۆ بەریتانیا هەتا فەرماندەیی هێزەکانی ئەمریکایی و بەریتانی بگرێت بە دەستەوە تەنیا یەك کتێبی پێبوو، ئەویش ئینجیل بوو.

ئەم کەسانە بەباشی لەوتەی ویلیام جیمز تێگەیشتبوون: ((مرۆڤ دەبێ پێوەندی لەگەڵ خودا هەبێت چونکە تەنیا کاتێك باوەشی خۆمان بۆ لای ئەو کردەوە باشترین چارەنووسمان بۆ دەردێت))..

کەسانێکی زیاتریش هەموو رۆژێك پێبەندی ئەم شتە دەبن.

دکتۆر ئالسیس کارل کە خەڵاتی نۆبلی بە هۆی نوسینی کتێبی: ((مرۆڤ و شتە نەناسراوەکانی)) بەدەستهێنا لەدیمانەیەکدا وتی: ((دوعا بەهێزترین جۆری وزەیە کە هەر کەسێك دەتوانێ بەدەستی بێنێت. هێزی دوعا وەکو هێزی راکێشانی زەوی راستەقینەو هەستپێکراوە. وەکو پزیشکێك کەسانێکم بینیوە کە لەپاش شکستە دەرمانە جۆراوجۆرەکان بەهێزی باوەڕو دوعا چاك بوونەتەوە.. هەروا کە بینیم دوعا سەرچاوەی رووناکی و وزەیە... بەدوعا مرۆڤ هەوڵدەدات توانای سنورداری خۆی بەپێوەندیدان بەهێزی بێکۆتایی خواوەندەوە زیاد بکات. کاتێك دوعا دەکەین خۆمان بە ئیرادەیەکی کامڵەوە دەبەستینەوە کە جیهان دەگەڕێنێت و داوا لەو دەکەین بۆ پڕکردنەوەی عەیب و کەموکورییەکانمان بەشێك لەدەسەڵاتەکەی ببەخشێت بە ئێمە))..

گلێن ئارنۆڵد وتاربێژییەکەی خۆی دەربارەی چۆنیەتی: زاڵبوون بەسەر نیگەرانیدا بەمجۆرە دەستپێکرد: ((هەشت ساڵ لەمەوبەر، جارێك کلیلی دەرگایماڵەکەم سوڕاندو پێموابوو دوایین جارە دەرگای خانووەکەم قوفڵ دەدەم. سواری ئۆتۆمبێلەکەم بووم بەرەو روبار بەڕێکەوتم. شکستێکی تەواوم خواردبوو. دنیا بچووکەکەم لێك ترازابوو.. کارەکەم نزیك بە لەناوچوون بوو، دایکم بەرەو مەرگ لەماڵەوە راکشا بوو. هاوسەرەکەم دوو گیان بوو، خەرجی دکتۆر رۆژ لەدوای رۆژ زیاد دەبوو. هەموو شتێکمان لەدەستی بانکدا بوو. تەنانەت قەرزم لەحیسابی دابینی

کۆمەڵایەتیش وەرگرتبوو.. دەمویست کۆتایی بە ژیانم بێنم. کاتێك چەند میلێکم بڕی ئۆتومبیلەکەم لاداو لەسەر عەرزێك دانیشتمو وەکو منداڵ کەوتمە گریان. بڕیارمدا لەجیاتی نیگەرانیو ترس بەشێوەیەکی بنیاتنەر بیربکەمەوە. بەخۆمم وت وەزعم چەندە خراپە؟ ئایا دەکرا لەمە خراپتر بێت؟ ئایا بەڕاستی هیوایەك بۆ باشبوونی دۆخەکە نییە؟..

لەو ساتەدا بڕیارمدا کێشەکانم بسپێرمە دەستی خوداو دەستم بۆ دوعا هەڵبڕی. کوتوپڕ شتێکی سەیر روویدا، هەر ئەوەندە کێشەکانم سپارد بە دەستی هێزێکی گەورەوە، رۆحو گیانم پڕبوو لەئۆقرەییەك کە چەند مانگ بوو بە خۆمەوە نەدیبوو.. یەك کاتژمێری تر لەویا دوعام کردو پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو وەکو منداڵێکی تازە لەدایکبوو خەوتم. رۆژی دوایی بەبڕوا بە خۆبوونەوە هەستامو چونکە خودام لەگەڵ بوو ترسم نەبوو. چووم بۆ فرۆشگایەکی گەورەو داوای کارم کرد. ئێستا کە سەیری رابردوو دەکەم لەوەی خەموخەفەت منی بەرەو روبار راکێشا تاکو رێنوێنی خواوەند بەدەست بێنم، شادمانم. ئێستا متمانەو ئۆقرەییەك لەخۆمدا هەست پێدەکەم کە هەرگیز بیرم نەدەکردەوە بێتەدی))..

بۆچی باوەڕی ئایینی وەها ئۆقرەیی هێمنیو هێزێك بەرهەم دێنێت؟ وەرن باسەرنج بدەینە وەڵامەکەی ویلیام جیمز: ((شەپۆلەکانی سەر دەریا هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر ئارامی قوڵایی دەریا نییەو بۆ کەسێك دەستی دەگاتە ڕاستی گەورە ترو بەربلاوتر شەپۆلەکانی چارەنوس بچوك بەرچاو دێن. کەسێك کە بەڕاستی ئایینیە لەرزە ناخاتە دەرونی خۆیەوەو پڕە لە ئۆقرەییو ئامادەی ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی))..

ئەگەر نیگەرانو قەلەقین بۆچی دەستەوداوێنی خودا نەبین؟ هەروا کە ئیمانۆڵ ئیل کانت دەڵێت: ((بڕواتان بەخوا هەبێت، چونکە وەها ئیمانێك پێویستی هەموانە)).. بۆچی خۆمان بەئیرادەیەکی کامڵەوە گرێ نەدەین کە جیهان هەڵدەسوڕێنێت؟ تەنانەت ئەگەر ئێوە باوەڕی ئایینیشتان نەبێت دیسان دوعا زیاتر لەوەی بیری لێدەکەنەوە بەسوودە بۆتان. چونکە دوعا رێگەی کاری کردەوەییە، واتە دوعا کردن.

سێ پێویستی سەرەکی دەروونی هەر کەسێك پڕ دەکاتەوە:

١- دوعاکردن یارمەتی ئێمە دەدات ئەو شتەی بەڕاستی ئێمە ئازار دەدات لەقاڵبی وشەکاندا بیهێنینە سەر زمان. لەبابەتی یەکەم لەبەشی دووەمدا بینیمان کە

چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی ناڕوون و نادیارن کەم و زۆر ناکرێت. دوعا وەکو ئەوە وایە کێشەکەمان بنوسین. بۆ چارەسەرکردنی کێشە دەبێ لەقاڵبی وشەدا بیهێنینە سەر زمان.

٢- دوعا یەکەم هەنگاوە بەرەو کردەوە. هیچ کەس نیە بەردەوام دوعا بۆ شتێك بکات بەڵام بۆ بەدیهاتنی هەنگاوێکی کردەوەیی هەڵنەگرێت. ئەگەر دوعا بەهێزترین جۆری وزەیە کە مرۆڤ دەتوانێ بەدەستی بێنێت کەواتە بۆچی سوود لەم وزەیە وەرنەگرین؟ بۆچی هەر ئێستا ئەم کتێبە داناخەن بچن بۆ ژووری خۆتان و دەست بۆ دوعا هەڵبڕن تاکو خودا، الله، مەولا، یان هەر ناوێکی تر کە لەو هێزە بێ کۆتاییەی دەنێن، یارمەتیتان بدات تاکو: ئۆقرەیی بەدەست بێنن، لەجیاتی نەفرەت خۆشەویستی دروست بکەن و لەجیاتی رق و قین بەخشش و شادی بەخەم.. ئارام ببینەوەو ئارام بکەنەوە، تێیان بگەن و تێتان بگەن. خۆشتان بوێت و خۆشیان بوێن. چونکە لەبەخششدایە کە دەبەخشرێین و مەرگدایە کە نەمر دەبین.

بابەتی یەکەم

## لەبیرتان بێت کەس شەق لەسەگی تۆپیو هەڵنەدات.

چەند ساڵ لەمەوبەر شتێك روویدا کە هەموو کۆمەڵی خوێندەواری ئەمریکای خستە جوڵەو تەواوی کاربەدەستانی کاروباری پەروەردە لەبەرئەوە هاتن بۆ شیکاگۆ.. پیاوێك کە چەند ساڵ لەمەوبەر توانیبووی بەخزمەتکاری، دارشکاندن، وانە وتنەوەی ئەهلی و فرۆشیاری خوێندنی خۆی لەزانکۆی بیل تەواو بکات، ئەمڕۆکە لەپاش (٨) ساڵ لەحاڵی وەرگرتنی پلەی سەرۆکایەتی زانکۆی شیکاگۆ، یەکێك لەدەوڵەمەندترین و ناودارترین زانکۆکانی ئەمریکا بوو.. مامۆستاکانی مِن لەم هەڵبژاردنە نارازی بوون و نارەزایەتی و رەخنە وەکو باران بەسەر ئەودا دەباری. تەنانەت رۆژنامەکانیش لەگەڵیاندا بوبوە هاودەنگ کە ئەو زۆر گەنج، بێ ئەزموون و خاوەنی بیرورای بێ مانایە. ناوی ئەو رابێرت هاچیز بوو..

رۆژی هەڵبژاردنی ئەو یەکێك لەهاورێکانی بە باوکی رابێرتی وت: ((ئەمڕۆ بەیانی رۆژنامەم دەخوێندەوەو لەوەی وتاری سەرنوسەر زۆر خراپەی لەسەر رابێرت نوسیبوو زۆر سەرم سوورما)).. باوکی رابێرت وەڵامی دایەوە: ((بەڵێ، زۆریش توند بوو، بەڵام لەبیرت بێت کەس شەق لەسەگی تۆپیو هەڵنادات)) و هەرچەندە کەسێك گرنگتر بێت رەخنەکانی سەبارەت بەو توندترە.

شازادەی وێلز: ئیدواردی هەشتەم کاتێك مێرمنداڵبوو ئەم راستیەی بە کوتەك خواردن بۆ دەرکەوت. کاتێك لەکۆلیجی دارت ماوت کە هاوسەنگی ئاکادیمیای دەریایی ئێمەیە دەرسی دەخوێند رۆژێك لەحاڵێکدا چاوی بەگریان بوو روبەڕوی یەکێك لەئەفسەرەکان بوەوە. ئەفسەرەکە هۆی گریانەکەی پرسی، بەڵام ئیدوارد خۆی لەوەڵامدانەوە لائەدا تاکو سەرەنجام پێداگری زۆری ئەفسەرەکە بووە هۆی

رونبونەوەی بەسەرهاتەکە. ئیدوارد وتی هاوپۆلەکانی بەشەق لیی دەدەن. ئەفسەر خوێندکارەکانی کۆکردەوەو داوای لێکردن هۆکاری ئەم شتە بڵێن. لەپاش خۆبەدەستەوەنەدان و پارێزی زۆر وەڵامی ئەوان ئەمە بوو: ((دەمانویست کاتێك بوینە ئەفسەر بڵێین شەقمان لەشا هەڵداوە!))..

کەواتە ئەم جارە ئەگەر کەوتنە بەر ئازارو رەخنە بزانن کە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی رەخنەگر هەست بە سربوون و گرنگی بکات. زۆربەی کات ئەم رەخنانە بەو مانایە کە ئێوە لەحاڵی سەرکەوتن و شایانی گرنگیپێدانن. زۆربەی خەڵك لەوەی کەسانی خوێندەوار یان کەسانێك کە لەخۆیان سەرکەوتووترن ئەدەنە بەر جوێن و خراپە باسکردن، چێژی زۆر وەردەگرن..

بۆ نموونە چەند ماوەیەك لەمەوبەر لەرادیۆدا بەرنامەیەکم بۆ رێزگرتن لەژەنراڵ ویلیام بۆت، دامەزرێنەری سوپای سەوز کە یارمەتی هەژارانی ئەدا، بەرێوەبرد لەپاش ماوەیەك پیرەژنێك نامەیەکی بۆ نووسیم و قسەی خراپی بە ژەنراڵ ویلیام وت و ئەوی تۆمەتبارکرد کە ٨ ملیۆن دۆلار لەو پارانەی بۆ هەژاران کۆکراوەتەوە دزیویەتی. ئەڵبەت ئەم تۆمەتە تەواو نابەجێ بوو بەلام ئەو ژنە نەك بەدوای راستیەوە، بەڵکو بەدوای ئەوەوە بوو بە ناوزڕاندنی کەسێك کە زۆر بالا مەقامتر بوو لەو، هەست بە رازی بوون بکات..

ئەو نامەیەم فرێدایە ناو زبڵدانەوەو زۆر شوکری خودام کرد لەگەڵ ژنێکی ئاوادا نە بوومەتە هاوسەر. شۆبنهاوەر چەندەها ساڵ لەمەوبەر ئەم بابەتەی بەجوانی خستووەتە روو، ((کەسانی پەست چێژێکی زۆر لەهەڵەکانی گەورەکان دەبەن))..

ناتوانین سەرۆکی زانکۆ بە کەسێکی پەست لەقەڵەم بەین بەلام یەکێك لەسەرۆکانی زانکۆی بیل بەناوی تیمۆتی دوایت لەوەی پیاوێك کە مورەشەح بوو بۆ وەرگرتنی سەرۆکایەتی کۆمار، بخاتە بەر رەخنەو گازندە زۆر شاد دەبوو. بۆ نموونە دەیوت: ((ئەگەر ئەم کەسە بێتە سەرۆك کۆمار، ژنان و کچانی ئێمە تووشی خۆ فرۆشتنی یاسایی دەبن و ئێمە شایەتی لەناوچوونی بەهاکان و ژێر پێکەوتنی مرۆڤایەتی و مەعنەویات دەبین))..

دەتانەوێ ناوی ئەو سەرۆك کۆمارە بزانن؟ تۆماس جێفرسۆن. هەر ئەو تۆماس جێفرسۆنە نەمرە؟ نوسەری کتێبی ((راگەیاندنی سەربەخۆیی))و پشتیوانی دیموکراسی؟ بەڵێ، خۆیەتی.

بەبڕوای ئێوە کام سەرۆك کۆمارەی ئەمریکایان بە ریاباز، فێڵبازو تۆزێك باشتر لەپیاو کوژان ناوبردو کاریکاتەرەکەی ئەویان لەحاڵێکدا سەری لەژێر تیغدا بوو، خەڵك بەو پێدەکەنین، لەرۆژنامەدا چاپ کرد؟ بەڵێ، جۆر واشینگتۆن..

لەوانەیە مرۆڤ لەم ماوەدا گۆڕابێت. با داستانێکی تر بخوێنینەوە، دەریاوان پیری دۆزەرەوەیەك بوو کە لەساڵی ١٩٠٩دا بە چوون بۆ جەمسەری باکور بەهۆی عارەبانەو سەگەوە، تەواوی دنیای تووشی سەرسوڕمان کرد. ئەمە کارێك بوو کە پیاوانێکی دلێری زۆر چەندەها سەدە لەهەوڵی ئەنجامدانیدا بوون بەڵام بێ سەرکەوتن لەرێی ئەو ئامانجەدا گیانیان دۆڕاند. دەریاوان پیریش نزیك بوو لەسەر مارەق بێتەوەو هەشت پەنجەی قاچی بەهۆی بەستنەوە بڕوابوونەوە. ئەو ئەوەندەی سەختی کێشا بوو کە دەترسا شێت ببێت. ئەڵبەت ئەو ناوبانگەی ئەو دەریکرد بوو بووە هۆی ئەوەی ئەفسەرانی پایەبەرزترو لەو زۆر توورە بن. ئەوان ئەویان تاوانبارکرد بەوەی بەناوی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە پارەی حکومەت لەجەمسەری باکوور دەکاتە خەرجی رابواردن. ئەوان ئەویان تاوانبارکرد بەوەی بە ناوی لێکۆڵینەوەی زانستیەوە پارەی حکومەت لەجەمسەری باکور دەکاتە خەرجی رابواردن. ئەوان ئەوەندە ئاگریان بەم تۆمەتو هەڵبەستەوە نا کە خودی سەرۆك کۆمار ناچار بە دەستێوەردان بوو، ئەوی بێ تاوان ناساند. ئایا ئەگەر ئەو لەواشینگتۆن نوسینگەیەکی هەبوایە دوچاری ئەم کێشانە دەبوو؟ نەخێر، ئەو ئەوەندە گرنگ نەدەبوو کە ئێرەیی خەڵك بوروژێنێت.

بۆ رزگاربوون لەزیانی رەخنەی نابەجێ بدەنە یاسای یەکەم:

لەبیرتان بێت کە رەخنەی نابەجێ زۆربەی کات وەکو ئافەرین وایە لەبەرگی ساختەدا هیچ کەس شەق لەسەگی تۆپیوی هەڵنادات.

بابەتی دووەم

## لەزیانی ڕەخنەی نابەجێ پارێزراوبن

ماوەیەك لەمەوبەر دیدارێکم لەگەڵ یەکێك لەسەختگیرترین فەرماندەکانی ناوگانی دەریایی ساز کرد. ئەو کەسێك نیە لەژەنراڵ سەمدەلی باتلەر. ئەو وتی لەدەورانی لاویدا زۆر ئاواتە خوازی ناوو ناوبانگ بوو، دەیویست کاریگەری زۆری لەسەر خەڵك هەبێت. لەو زەمانەدا کەمترین ڕەخنە دڵی ئەوی ئەشکاند، بەڵام سی ساڵ خزمەت لەهێزی دەریاوانی ئەوی ڕاهێناوە. ئەو دەڵێت ئەوەندە سوکایەتی و جوێنی بیستووە کە ئێستا ئەگەر سووکایەتی پێبکەن زەحمەت بەخۆی نادات سەیری کابرا بکات.

لەبیرمە چەند ساڵ لەمەوبەر هەواڵنێری ڕۆژنامەی سان هات بۆ دیداری یەکێك لەوانەکانی من و لەوتارەکەیدا وانەکەی گرتە بەر گاڵتەو سووکایەتی. من زۆر پێم ناخۆش بوو، ئەم بابەتەم بەتەلەفون بەسەر نووسەر ڕاگەیاندو وتم لەجیاتی گاڵتە پێکردن ڕاستیەکان چاپ کەن. ئەڵبەت ئەمڕۆکە لەم کارەم شەرمەزارم. زۆربەی خەڵك ڕەخنە بچووکەکان وەردەگرن. لەدواییدا بۆم دەرکەوت نیوەی خوێنەرانی ڕۆژنامەکە ئەم وتارە ناخوێننەوە. نیوەی ئەو کەسانەی خوێندوویانەتەوە بەلایانەوە بێ مانا بووەو ئەو دەستەش کە لەخوێندنەوەی شادمان بوون لەپاش چەند هەفتە بەتەواوی فەرامۆشیان کردووە.

ئێستا دەزانم خەڵك زۆر گرنگی نادەن کە لەبارەی من و ئێوەوە چی دەوترێت. ئەوان زۆر بەی کات لەفیکری خۆیاندان. ژانە سەرێك بۆ ئەوان گرنگترە لەمەرگی من و تۆ. تەنانەت ئەگەر هەموو دۆستانیشمان خەیانەتمان لێ بکەن و گاڵتەم پێبکەن نابێ دوچاری خۆ خواردنەوە بین. بەپێچەوانەوە وەرن بیری بێنینەوە ئەم شتە بۆ مەسیحیش ڕوویدا. یەکێك لە(١٢) حەوارییەکانی لەبەر بڕێك پارە کە بەپارەی

ئەمڕۆکە دەکاتە (١٩) دۆلار خەیانەتی لەعیسا کرد. یەکێکی تر (٣) جار وتی هەر نایشیناسێت. واتە لەهەر (٦) هاوڕێی خۆشەویست یەکیان خەیانەتی لەو کرد. ئێمەیش دەبێ چاوەڕوانی زیاترمان لەدۆستانمان هەبێت.

چەند ساڵ لەمەوبەر بەو ڕاستیە گەیشتم کە ئەگەر چی ناتوانم بەر لەڕەخنەی نابەجێ بگرم، بەلام دەتوانم کاری گرنگتر بکەم. واتە ڕێگە نەدەم ئەم تۆمەتانە من ئازار بدەن. بابەتەکە شی بکەینەوە: مەبەستی وتەکەی من ئەوە نیە کەچاوپۆشی لەهەر ڕەخنەیەك بکەین، بەڵکو بەبێ ڕەخنە نا دادگەرییەکان بە چاوپۆشی لەبیر کەین.

جارێك ئەلنۆر رۆزوێلت پرسیارم لێکرد چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕەخنەو گازەندە ئیرەیی ئامێزەکان دەکات، چونکە ئەو ڕەخنە گرو دۆستانێکی زۆری هەبوو. زیاتر لە هەموو ئەو ژنانەی لەو دەورانەدا لە کۆشکی سپی دەژیان. ئەو وتی کاتێك کچێکی گەنج بوو زۆر شەرمن بووو ترسی لە قسەکردن هەبوو، چونکە نەیدەویست بکەوێتە بەر ڕەخنە. ڕۆژێك داوای یارمەتی لە پوری کرد هەتا بەسەر ئەم ترسەدا زاڵ بێت. پوری ئاوای وەلام دابووەوە:((تا کاتێك لەحەق بوونی خۆت دڵنیایت ڕێگە مەدە قسەی خەڵك تۆ ئازار بدات)). ئەلنۆر ڕۆز وێڵت وتی: (( تاقە ڕێگەی ئەوەی لەدەستی ڕەخنە ڕزگاربیت ئەوەیە کە ببیتە پەیکەرێکی چینی لەسەر تاقێك. چ ئەو کارەی لەمێشکتدایە ئەنجامی بدەی یان نەیدەی دەکەوێتە بەر ڕەخنە، کەواتە باشتر وایە ئەو شتەی هەست دەکەیت دروستە بیکەیت)).

پرسیارم لە (( میتۆ براش))ی کۆچکردوو کە سەرۆکی ئەو کاتەی یەکێتی نێو نەتەوەیی ئەمریکا بوو، کرد ئایا لەبەرامبەری ڕەخنەدا کاردانەوە لەخۆی دەنوێنێت؟ وەلامی دایەوە:

((لەڕۆژانیی سەرەتایی سەرۆکایەتیدا بەنیسبەتی ئەو قسانەی دەیان کرد زۆر هەستیار بووم‌و دەمویست بزانم ئایا تەواوی فەرمانبەرەکان من بەبێ عەیب‌و کامڵ دەزانن یان نا و ئەم شتە دەبووە هۆی نیگەرانی من. هەوڵم ئەدا هەموان لەخۆم ڕازی کەم بەلام هەر ئەم بابەتە دەبووە هۆی ئەوەی هەوڵی من بۆ ڕازی کردنی کەسێك، کەسێکی تر ئازار بدات. لەپاشان بۆم دەرکەوت هەرچی زیاتر هەوڵ ئەدەم هەستی برینداری کەسانی دەورروبەرم بۆ دەرباز بوون لەڕەخنە چاك بکەمەوەو دڵیان بەدەست بێنم زیاتر دوژمن بۆخۆم دروست ئەکەم. بەخۆمم وت: ((ئەگەر لەخەڵك بالاتربیت

سروشتیە دەکەویتە بەر رەخنە، کەواتە باشتر وایە خووی پێ بگریت. کەواتە بڕیارمدا هەرکارێك بەبڕوای خۆم دروستە بەبێ ترس لەڕەخنە ئەنجامی بدەین‌و کاتێك بارانی رەخنەو گازندەی نادادگەرانە بەسەرمدا باری چەتری بێ دەربەستی بکەمە سپەری خۆم)).

دیمز تایلۆر تەنانەت ئەم چەترەیشی بەکار نەدەهێنا، بەڵکو لەژێر باراندا دەوەستاو پێی پێدەکەنی. ئەو کاتێك ڕای خۆی دەربارەی ئۆرکستڕای فیلارمۆنێك سەمفۆنیای نیۆیۆرك باس دەکرد نوسراوەیەکی لەلایەن ژنێکەوە وەرگرت کە لەوێدا بە ((درۆزن، خەیانەت کارو بێزار کەر)) ناوی نرابوو. ئەو دەڵێت لەوکاتەدا هەستم کرد ئەو ژنە گوێی لەوتارەکەی من نەگرتووە. دیمز تایلۆر لەبەرنامەی ڕادیۆیی هەفتەی دواییدا ئەو نامەیەی بۆ هەموو بیسەران خوێندەوە. چەند ڕۆژ دوای ئەوە نامەیەکی تری لەو ژنە پێگەیشت کە نووسیبووی ئەو هێشتا لەسەر ئەو بۆچوونەی سوورە. بەخوێندنەوەی ئەم نامەیە تایلۆر دەم بەپێکەنین وتی: ((کەواتە من هێشتا درۆزنێکی خیانەت کارو بێزار کەرم!)) کەسێك کە ئاوا ڕوو بەڕووی ئەم ڕەخنە سووکایەتی کەرە ببێتەوە، بەڕاستی شایستەی شاباش‌و ئافەرینە. ئێمە بەردەوام ئارامی، هەیبەت‌و قۆشمەیی ئەو ستایش دەکەین.

کاتێك چارلز شۆئاب لەکۆلێجی پرنستۆن وتاری بۆ خوێندکارانی دەخوێندەوە کە یەکێك لەگەورەترین دەرسەکانی ژیانی لەکرێکارێکی ئەڵمانیەوە وەرگرتووە کە لەکارگەی ئیستیلی ئەو کاری دەکرد. ئەم کرێکارە سەبارەت بەشەڕ موناقەشەی لەگەڵ تەواوی کرێکارەکانی تر کردبوو، ئەوان ئەویان خستبووە ناو ڕووبارەوە. کاتێك هاتە نووسینگەکەمەوە تەڕوقوڕاوی بوو. پرسیارم لێکرد: ((چیت بەوان وت کە خستیانیتە ناو ڕووبارەکەوە؟)) وەڵامی دایەوە: ((هیچ، تەنیا پێکەنیم))و چارلز شۆئاب ئەم قسەی کردبووە دروشمی ژیانی خۆی:

((تەنیا پێبکەنە)).

ئەم ڕەوشە لەبەرامبەری ڕەخنە نادادگەرییەکان زۆر کارامەیە، چونکە ئێوە دەتوانن شتێك بەکەسێك بڵێن کە وەڵامتان ئەداتەوە بەڵام کەسێك کە لەبەرامبەری ڕەخنەی ئێوەدا پێدەکەنێت چی دەڵێن؟

ئابراهام لینکۆڵن دەیوت: ((ئەگەر بمەوێ تەواوی ئەو ڕەخنەو هێرشانەی کراوەتە سەرم بیخوێنمەوە، چ بگا بەوەی وەڵامیان بدەمەوە، دەبێ ئەم نووسینگەیە بۆ کاری تر چۆڵ بکەم. من باشترین کار کە دەزانمو دەتوانم ئەنجامی ئەدەمو باکم لەڕەخنە نیە. کاتێک کارەکەم تەواو بوو ئەگەر حەق بە من بوو ئەوا ئەو ڕەخنانە گرنگ نین، ئەگەریش من حەقم پێ نەبوو ئەگەر فریشتەکانیش بڵێن حەق بەمنە چیتر هیچ گرنگ نیە)).

**یاسای دووەم** بۆ پارێزراو بوون لەڕەخنەی نادادگەرییانە:

باشترین کارێک کە دەتوانن ئەنجامی بدەن، چەتری بێ دەربەستی لەژێر بارانی ڕەخنەکاندا بەسەر سەرتانەوە بگرن.

بابەتی سێیەم

# ئـــەو کەریەتیانەی کـــــــردوومە

لەفایلە تایبەتەکەی خۆمدا بەشێکم هەیە کە تیایدا ئەو کارە بێ عەقڵیانەی ئەنجامم داوە هەڵیدەگرم. جاریوایە ئەم ڕابردووانە ئەدەم بە سکرتێرەکەم بینوسێت؛ بەلام جاری وایە ئەم بێ عەقڵیانە ئەوەندە تایبەتە کە شەرم دەکەم پیشانی کەسی بدەم؛ کەواتە بەدەستی خۆم دەیاننووسم.

لەم فایلەدا بەشێك لەو ڕەخنانەی لەخۆم گرتووە هەڵیدەگرم کە هی (١٥) ساڵ لەمەوبەرە. ئەڵبەت ئەگەر ڕاستگۆتر بوومایە بێ گومان ئەم فایلە قەڵەوتر لەوەی ئێستا دەبوو. ئێستاکە ئەم نووسراوانە دەخوێنمەوەو دەبینم چۆن ڕەخنەم لەخۆم گرتووە؛ باشتر دەتوانم خۆم بەڕێوەبەرەو کێشە سەختەکان چارەسەر کەم.

پێشتر تاوانی هەڵەکانم دەخستە ئەستۆی کەسانی ترەوە، بەلام لەگەڵ ڕابوونی زەمان و زۆر بوونی ئەزموونەکانم کە کەم و زۆر لەهەموو ئەو بەلایانەی بەسەرم هاتووە تاوان باری سەرەکی خۆم بووم؛ بەرابوونی ڕۆژگار زۆربەی مرۆڤەکان دەگەنە ئەم ئەنجامە. ناپلیۆن دەڵێت:

((هیچ کەس لەخۆم زیاتر بەهۆی شکستەوە شایستەی سەرزەنشت نیە؛ دوژمنی گەورەی من خۆم بووم و دروستکەری چارەنووسی پڕبەلایشم هەروا خۆم بووم)).

باکەسێکتان پێ بناسێنم کە لەبواری بەڕێوەبردنی کەسایەتیدا بەهونەرمەند دەژمێردرێت. ناوی ئەو ((هاول))ە.کاتێك هەواڵی مەرگی کتوپڕی ئەو بلاو بووەوە واڵ ستریت کپ بووە، چونکە ئەو لەکۆڵەکەکانی ئابووری ئەمریکا بوو. ئەو خوێنـــدەواری زۆری نـــەبوو؛ ژیـــانی خـــۆی وەکـــو فەرمانبـــەرێك لەفرۆشـــگایەك دەستپێکرد.پاشان بووە بەڕێوەبەری چۆنیەتی پیشەسازی پۆلای ئەمریکاو کەوتە

ڕێگەی دەسەڵات و ناوبانگ. لەدیدارێکدا کەلەپێش مەرگی لەگەڵ ئەودا هەمبوو گێڕایەوە:

((چەندەها ساڵ دەفتەرێکی ڕۆژانەم هەبوو کەتەواوی دیدارەکانم تیا دەنووسی. شەوانی شەممە هەمیشە لەم دەفتەرەدا بەتاڵە چونکە لەم ڕۆژەدا دامناوە بۆ خۆهەڵسەنگاندن و پیاچوونەوەی کارەکانم. کەواتە لەدوای خواردنی ئێوارەوە دەچمە ژوورەکەم و دەربارەی تەواوی قسەکانم، موناقەشەکانم و دیدارەکانم بیردەکەمەوە تاکو هەڵەکان و ئەو دەرسانەی فێری بووم پیابچمەوە. بەبڕوای من ئەمە باشترین ڕەوشە بۆ هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبەرایەتی کەسایەتی)).

بێن فرانکلین هەموو شەوێك ئەم پیاچوونەوەی ئەنجام ئەداو بۆی دەرکەوتبوو (١٣) هەڵەی گەورەی هەیە. سێ دانە لەو هەڵانە بریتی بوون لە: ١- فیڕۆدانی کات ٢- سەرنج دانە شتی بێ بایەخ ٣- موناقەشە لەگەڵ خەڵك. فرانکلین عاقڵ بوو، دەیزانی ئەگەر ئەم عەیبانە چارەسەر نەکات سەرکەوتنی سنووردار دەبێتەوە. کەواتە کەوتە بەرەنگار بوونەوەی ئەم عەیبانەو هەموو حەفتەیەك براوەی ئەم کێبەر کێیەی لەدەفتەرەکەیدا دەنووسی. هیچ جێی سەرسووڕمان نیە کە ئەو بووبە خۆشەویستترین پیاوی ئەمریکا.

کەسانی بچووك و کورت بین بەتۆزێك ڕەخنە تووڕەدەبن. بەلاّم پیاوانی عاقڵ لەم سەرزەنشتانە بەشەوقەوە دەرس وەردەگرن. واڵت ویتمەن ئەم بابەتەی بەم شێوە باس کردووە:

((ئایا هەموو دەرسەکانی ژیان لەو کەسانەوە فێربوون کە خۆشتان ویستوون، لەگەڵتان میهرەبان بوون و ڕێگەیان بۆ کردوونەتەوە؟ ئایا لەو کەسانەی ئێوەیان ڕەت کردووەتەوە، لەبەرامبەرتاندا وەستاون و دژایەتیان کردوون، دەرسی گەورە فێرنەبوون؟))

لەجیاتی ئەوەی ڕێگە بەدوژمنان بدەین ئێمە بگرنە بەر ڕەخنە، وەرن خۆمان گەورەترین ڕەخنەگری خۆمان بین و لەپێش ئەوەی دوژمنانمان دەرفەتی ڕادەربڕینیان هەبێت، تەواوی عەیب و ڕێگە چارەکانیان بدۆزینەوە.

ئەگەر کەسێك بۆ نموونە ئێوە بەکەر ناوبەرێت چ کاردانەوەیەکتان دەبێ؟ تووڕەدەبن؟ پێی دەڵێنەوە؟ وەرن بزانین لینکۆڵن لەم وەزعەدا چی کردووە؟ جارێك

ئیستانتۆن کە بەڕێوەبەری کاروباری شەڕی لینکۆڵن ئەوی بەکەر ناوبرد، چونکە لینکۆڵن دەستی خستبووە کاروباری ئەو و فرمانی گواستنەوەی چەند گوردانی تەنیابۆ ڕازی کردنی سیاسەتمەدارێك ئیمزا کردبوو. کاتێك بەویان وت ئیستانتۆن بەوی وتووە (کەر)، لینکۆڵن بەئارامی وەڵامی دایەوە: ((ئەگەر ئەو وتبێتی ئەڵبەت ڕاست دەکات چونکە زۆر کەم هەڵەدەکات. دەبێ لەم بارەوە بیر بکەمەوە)). ئەو چوو بۆ دیداری ئیستانتۆن و کاتێك قەناعەتی کرد فرمانەکەی هەڵەبووە، هەڵیوەشاندەوە. ئەو لەبەرامبەری ڕەخنەی ڕاستگۆیانەو لەڕووی زانستەوە بە کراوەیی پێشوازی لێکرد.

من و ئێوەیش دەبێ ئاوا بە ئامێزی کراوەوە ڕەخنەکان وەربگرین. ئەگەر بیستمان کەسێك بەخراپ باسمان دەکات خێرا نەکەوینە بەرگریکردن لەخۆمان. هەر نەزانێك ئەم کارە دەکات.

وەرن با جڵەوی کارەکە بگرینە دەست، مەجالی دوژمنەکانمان بەرتەسك بکەینەوەو شاباشی خەڵك بەم ڕستەیە بەدەست بێنین کە دەڵێت: ((ئەگەر ڕەخنەگرانی من ئاگاداری هەموو کەم و کوڕییەکانی من بوونایە، بێ گومان سەختتر لەم جارە منیان دەگرتە بەر ڕەخنە)). لەبابەتی پێشوودا لەبارەی ئەوەوە قسەمان کرد کە لەبەرامبەری ڕەخنەی نادادگەرییانەدا چی بکەین، بەڵام پێشنیارێکی ترم هەیە. کاتێك کەوتینە بەر ڕەخنەی لەو جۆرە دەتوانین بڵێین: ((ڕاوەستە! کێ وتوویەتی من مرۆڤێکی بێ عەیبم؟ ئەگەر ئەنیشتاین دەڵێت ٩٩٪ لێکدانەوەکانی هەڵەیە، لەوانەیە منیش شایستەی ئەم ڕەخنەیە بم. ئەگەر وایە دەبێ مەمنوونی ڕەخنەگران بم)). فرۆشیارێکی سابوونم دەناسی کە عادەتی بوو داوا لەخەڵك بکات ڕەخنەی لێ بگرن. کاتێك یەکەمجار دەستی کرد بەفرۆشتنی سابوون، داواکاری زۆر نەبوو. دەیزانی عەیبەکە لەسابوون یان نرخەکەیەوە نییە، کەواتە گرفتەکە لەلایەن خۆیەوە بوو. کاتێك لەبەستنی گرێبەستێکدا شکستی دەهێنا لەلای خۆی شی دەکردەوە کە عەیبی کارەکە لەکوێدایە. ئایا زانیاری شتەکەی بەکەمی داوە؟ یان هەڵس و کەوتێکی دروستی نەکردووە؟ پاشان دەچوو بۆ لای ئەو کەسەو داوای لێ دەکرد عەیبی کارەکەی پێ بڵێت:

هەڵس و کەوتێکی من ((دەکرێ ئەو پیاوەتیە لەحەقی مندا بکەیت و پێم بڵێیت چ بەهەر حاڵ تۆ زۆر بووەهۆی ئەوەی تۆ لەکرینی ئەم بەرهەمە پاشگەزبیتەوە؟ بەئەزموونترو سەرکەوتووتری لەمن، کەواتە تکایە ڕاستگۆیانە حەقیقەتەکەم پێ بڵێ)). ناوی ئەو ((ئەی . ئیچ . لیتڵ)) بوو.

ئەوکارانەی لەم بەشەدا باسمان لەسەر کرد هەموو بۆ کەسانی گەورە ڕوویداوە. ئێوەیش ئێستا کە تەنیان دەتوانن لەناوێنەدا پرسیار لەخۆتان بکەن ئایا لەو کەسانەن یان نا. بۆ پارێزراو بوون لەئازاری ڕەخنە سەرنج بدەنە یاسای سێهەم: دەفتەرێك بۆ نوسینی ئەو کەرێتیانە دابنێین کە کردوومانەو خۆمان بدەینە بەر ڕەخنە:

بەهۆی ئەوەوە کەکەسانێکی کامڵ نین وەکو لیتڵ داوا لەخەڵك بکەین ڕەخنە بنیاتنەرەکانیان لەئێمە دریخ نەکەن.

کورتەی بەشی شەشەم

## ڕێگاکانی پارێزراو بوون لەئازاری ڕەخنەی نادادگەریانە



**یاسای یەکەم**: ڕەخنە ناعادلانە بەشێوەی باو وەکو ئافەرین وایە لەبەرگی ساختەدا . واتە دەریدەخات کە ئێوە ئیرەیی خەڵکتان جولاندووە. لەبیرتان بێت کەس شەق لەسەگی تۆپیو هەڵنادات.

**یاسای دووەم**: کارەکانتان بەباشترین شێوە ئەنجام بدەن و پاشان چەتری بێ دەربەستی لەژێر بارانی ڕەخنەی نابەجێ و ناعادلانە بەسەر سەرتانەوە بگرن.

**یاسای سێهەم**: پێشینەی کەریەتیەکانتان هەڵگرن و خۆتان بدەنە بەر ڕەخنە. بەهۆی ئەوەی ناکرێ کامڵ و بێ عەیب بین، وەرن وەکو ئەی-ئیچ-لیتڵ داوا لەخەڵك بکەین ڕەخنە بێ ڕیا و بنیاتنەرەکانی خۆیان لەئێمە دریخ نەکەن.

# بەشی حەوتەم

## شەش ڕێگە بۆ نەهێشتنی نیگەرانیو شەکەتیو بەرزکردنەوەی ئاستی وورەو توانا

## بابەتی یەکەم

# یەك کاتژمێر بەکاتی بەئاگابوونتان زیاد بکەن.

لەوانەیە بتانەوێ بزانین بۆچی لەکتێبێکدا کە سەبارەت بەکەمکردنەوەی نیگەرانیە، دەربارەی پێشگرتن لەشەکەتی شتم نووسیوە. ئاسانە، شەکەتی زۆربەی کات نیگەرانی لەگەڵدایە یان لانی کەم ئێوە ئامادەی نیگەرانی دەکات. هەر خوێنکارێکی پزیشکی دەتوانێ ئەم بابەتە پشت ڕاست بکاتەوە کە ماندوویەتی خۆڕاگری جەستە لەبەرامبەری پەتاو سەدان نەخۆشی تر دێنێتە خوارەوە. لەهەمان حاڵدا دەروونناسانیش دەڵێن شەکەتی خۆڕاگری مرۆڤ لەبەرامبەری هەست گەلێکی وەکو ترس و نیگەرانی کەم دەکاتەوە. وتم ناڕاستەوخۆ. ئەم تایبەتمەندییە لەوانەیە ئاڕادەیەك کەم میهری بێت. دوکتۆر یاکوبستۆن دوو کتێبی دەربارەی حەسانەوە نووسیوە: ((حەسانەوەی بنیاتنەر)) و((دەبێ پشوو بدەین)). ئەو چەندەها ساڵ بەرپرسی لێکۆڵینەوە بوو لەبواری بەکارهێنانی حەسانەوە لەدەرمانە پزیشکیەکاندا. ئەو دەڵێت لەکاتی بوونی حەسانەوەی کامڵدا، شوێنێك بۆ حالآتی نەخوازراو و نەخۆشی هەستی وعەسەبی بوونی نیە. واتە ((لەحاڵی پشوودا ندا ناتوانین نیگەران بین)).

کەواتە یەکەم یاسا بۆ پێشگرتن لەماندوویەتی و پەرپووتی ئەمەیە: زۆر بحەسێنەوەو ئەم کارە لەپێش ماندوو بووندا ئەنجام بدەن. ئەو یاسە کە ماندوویەتی و شەکەتی چەندە خێرا لەمرۆڤدا کەڵەکە دەبێت سەر سوورهێنەرە.

ئەرتەشی ئەمریکا چەندەها جار لەڕێگەی تاقیکردنەوەوە تێگەیشتووە کە لەحاڵەتێکدا کە سەرباز، تەنانەت ئەو سەربازە گەنجانەی لەڕاهێنانەکاندا زۆر پڕوزەو ئامادە بوون، ئەگەر لەهەر یەك کاتژمێردا دە خولەك پشوو بدەن. نەك هەر ڕێژەکە

باشتر دەکەن، بەڵکو ماوەیەکی زیاتریش دەتوانن درێژە بەم کارە بدەن. دڵی مرۆڤ هەموو ڕۆژێك ئەوەندە خوێن هەڵێنجێت کە دەتوانین بەم ژمارە هەڵێنجانە تەنکەری شەمەندەفەرێك پڕبکەین و ئەوەندە بەرهەم دێنێت کە دەتوانین بەوە (٢٠) تەن بەردی خەڵوز لەشوێنێکدا بەبەرزایی دوو مەتر هەڵچنین و ئەم کارە بە (٦٠، ٧٠، ٩٠) ساڵ ئەنجام ئەدات. چۆن دەبێ ئەم گوشارە تەحەمول کەین؟ دوکتۆر والتەر کانۆن ئەم بابەتە شی دەکاتەوە: ((زۆربەی خەڵك وابیر دەکەنەوە دڵ بەردەوام کاردەکات، بەڵام دەبێ بزانین لەپاش هەر بچووك بوونەوەیەك کاتێکی دیاری کراو دەحەسێتەوە. لەحاڵەتی لێدانی ئاسایدا واتە (٧٠) لێدانی لەیەك خولەکدا، دڵ (٩) کاتژمێر لە (٢٤) کاتژمێر کار دەکات. واتە (١٥) کاتژمێر هەمووی حەسانەوەیە)).

لەدەورانی شەڕی دووەمی جیهانیدا وینستۆن چەرچڵ لەکۆتاییەکانی (٦٠)و سەرەتای (٧٠) ساڵیدا هەموو ڕۆژێك بۆ چەندین ساڵ (١٦) کاتژمێر کاری دەکرد کە ئەمە ژمارەیەکی پێوانەیی بێ وێنەیە. نهێنی ئەم کارەی ئەو لەکوێدایە؟ ئەو هەتا کاتژمێر(١١)ی بەیانی لەناو جێگەکەیدا کاری دەکرد. ڕاپۆرتەکانی دەخوێندەوە، فرمانەکانی دەنووسی و کۆبوونەوە گرنگەکانی دروست دەکرد. لەپاش خواردنی دوانیوەڕۆ یەك کاتژمێر دەخەوت. لەپێش خواردنی ئێوارەدا دوو کاتژمێری تر دەخەوت و بەمجۆرە دەیتوانی بەوزەوە تا نیوە شەو کاربکات. ئەو پێویستی بە دەرمانی ماندوویی نەبوو، چونکە پێشگیری لێدەکرد.

ڕاکفلێر دوو ژمارەی پێوانەیی لەدنیادا تۆمار کرد. یەکێك ئەوە کە تا کاتی خۆی دەوڵەمەندترین کەس بوو، ئەویتر ئەوەبوو کە هەتا(٩٨) ساڵی ژیا. نهێنی تەمەنی زۆری ئەو چی بوو؟ هۆکاری سەرەکی ئەڵبەت ئەوە بوو کە لەبواری فسیۆلۆژییەوە ئامادە باشی تەمەنی زۆر بوو، هۆکەی تری ئەوە بوو کە ئەو خووی گرتبوو هەموو ڕۆژێك نیوەڕۆ بۆ ماوەی نیو کاتژمێر لەنووسینگەکەی دەخەوت. لەسەر قەنەفەیەك ڕادەکشا و لەو نیوە کاتژمێرەدا تەنانەت تەلەفۆنی سەرۆك کۆماریش نەیدەتوانی ئەو لەخەو بکات.

حەسانەوە بەمانای ئەنجامدانی کارنیە، بەڵکو بەمانای نوێ بوونەوەو هێزگرتنەوەیە. هێزێکی زۆری نوێ بوونەوە لەکاتە کورتەکانی پشووداندا، تەنانەت خەوی (٥) خولەکی هەیە کەدەتوانێت پێشگیری لەماندوویەتی بکات.

لەماوەی (١٢) کاتژمێردا کە ئەلنۆر ڕۆز ڤێلت کەلە کۆشکی سپیدا ژیا، بەرنامەیەکی ڕۆژانەی زۆر سەختو چڕی هەبوو. پرسیارم لێکرد چۆن ئەم ماوە زۆرە لەژێر فشاردا بەردەوامی بووە. ئەو وتی لەپێش کارگەلێکی وەکو دیداری ژمارەیەکی زۆری خەڵکو وتاربێژی بیست خولەك لەسەر قەنەفەیەك ڕادەکشاو پشووی ئەدا.

لەم ماوەدا دیداری لەگەڵ ژنە ئۆتری، ئەستێرەی سینەماو ڕادیۆو باشترینو خۆشەویستترین گالەوەڕێنی ڕۆژئاوا کرد. پێشکەیەکی سەرپازی لەحەمامی ساردیماڵەکەیدا بوو. ئەو وتی لەپێش پێشکەشکردنی بەرنامەدا لەسەر ئەوە ڕادەکشێتو پشوو ئەدات. تەنانەت لەکاتی فیلم هەڵگرتنەوەیشدا لەهۆلیۆدیش لەناو ڕۆژدا (٢یان٣) جار بۆ ماوەی (١٠) خولەك دەخەوێت.

ئەدیسۆن داهێنەری کارەباوزەی زۆری خۆی منەتباری ئەم بابەتە بوو کە هەر کاتێك خەوی دەهات دەخەوت.

ڕۆژی لەدایك بوونی (٨٠) ساڵەی هێنری ((فۆرد دیدارم)) لەگەڵ کردو لەوەی لەو تەمەنەدا ئاوا پڕ ووزەو توانا بوو تێڕامام. پرسیاری نهێنیەکەیم لێکردو لە وەڵامدا ئەو وتی: ((هەرگیز کاتێك دەکرا دانیشم بەسەر پێوە نەدەوەستامو هەرگیز کاتێك دەکرا ڕابکشێم دانەدەنیشتم)).

هۆراس مان، باوکی پەروەردەی نوێ، هەر سوودی لەم ڕەوشە وەردەگرتو زۆربەی کات لەنوسینگەکەیدا لەسەر قەنەفەیەك ڕادەکشا.

بەڵام ئێوە چۆن دەتوانن ئەم کارە ئەنجام بدەن؟ ئەگەر ئێوە بۆ نموونە کەسێکی خەتنووس بن ناتوانن وەکو ئەدیسۆن ئەم کارە لەنوسینگەکەتاندا بخەون یان ئەگەر بەرپرسی حیساباتن ناتوانن لەکاتی کۆبوونەوەدا لەسەر قەنەفەیەك ڕاکشێن. بەڵام ئەگەر بۆ نموونە بۆ خواردنی نیوەڕۆ دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە دەتوانن لەپاش نان خواردن دەخولەك بخەون. ئەمە کارێکە کە ژەنراڵ ((جۆرج مارشاڵ)) دەیکرد. ئەو لەکاتی شەڕدا ئەوەندە سەرقاڵی بەڕێوەبردنی سووپا بوو کە چارەیەکی لەخەوتنی کاتی نیوەڕۆ زیاتر نەبوو. ئەگەر تەمەنتان لەسەرووی (٥٠) ساڵەوەیەو ئەوەندە سەرتان قەرەباڵغە کە ناتوانن پشوو بدەن باشتر وایە بیمەی تەمەن وەربگرن. لەوانەیە هاوسەرەکەتان بیەوێت بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی گەنجتر سوود لەو بیمەیە وەربگرێت. لەگەڵ ئەویشدا خەرجی کفنو دفن زیاد دەکات.

ئەگەر لەپاش خواردنی نیوەڕۆ ناتوانن بخەون، لانی کەم لەپێش خواردنی ئێوارەدا یەك کاتژمێر بخەون. ئەگەر بتوانن لەنزیکی کاتژمێر (٥و٦ یان ٧) بخەون، دەتوانن یەك کاتژمێر بەکاتی بەئاگا بوونتان زیاد بکەن. چۆن؟ چونکە (٦) کاتژمێر خەوی شەوانەو یەك کاتژمێر لەپێش ئێوارەدا واتە بەسەر یەکەوە (٧) کاتژمێر خەو، بەسوودترە لە (٨) کاتژمێر خەوی لەسەریەکی شەوانە. کەواتە با ئەم بابەتە دووپات بکەمەوە: ئێوەش وەکو سوپا بکەن. واتە جارەکانی پشوودان زیاد بکەن. هەروەها وەکو دڵتان کار بکەن، واتە لەپێش ماندوو بووندا بحەسێنەوەو بەمجۆرە یەك کاتژمێر بەکاتی بەئاگا بوونتان زیاد بکەن.

بابەتی دووەم

## ناسینی هۆکاری ماندوو بوون و چارەسەر کردنی.

سەرنج بدەنە ئەم لێکۆڵینەوە گرنگە: کاری مێشکی بەتەنیا ناتوانێت ئێوە ماندوو بکات. بەلاتانەوە سەیرە!! بەڵام چەند ساڵ لەمەوبەر لێکۆڵەران لەمبارەوە لێکۆڵینەوەیەکیان ئەنجامدا کە ماوەی کاری مێشك هەتا گەیشتن بەقۆناغی ((کەم بوونەوەی توانای کار)) کە پێناسەی زانستی ماندوویەتیە چەندە دەبێ. ئەو شتەی بووە هۆی سەرسوورمانی لێکۆڵەران ئەم دۆزینەوەیە بوو کە خوێنی تێپەڕیو بەمێشکی چالاکدا هیچ نیشانەو ژەهری ماندوویی هێنەری تیا نەبوو. واتە ئەگەر لەپاش یەك ڕۆژ کارکردن خوێن لەدەمارەکان بگریت نیشانەی ماندوویەتی تیا دەردەکەوێت، بەڵام لەخوێنی مێشکدا کەسێکی وەکو ئەنیشتەین کە ئەو هەمووە چالاکی مێشکی هەیە دیسان هیچ ئاسەوارێك نابینرێت.

تا ئەو شوێنەی پێوەندی بەخودی مێشکەوە هەیە، مێشك دەتوانێت هەر ئەو وردبینیە لەکاردا لەپاش (١٢) کاتژمێر کاری بەردەوامیش ڕابگرێت. واتە مێشکی پزیشکان ماندوو نابێت. کەواتە چ شتێك ئێمە شەکەت دەکات؟

پزیشکانی دەروونی بڕوایان وایە زۆربەی هەست بە ماندوویی کردنی ئێمە سەرچاوەی لەحاڵەتی فیکری و هەستی ئێمەوە گرتووە. بەشێکی زۆر لەهەستی ماندوویەتی ئێمە حاڵەتی دەروونی هەیەو ماندوێتی تەنیا جەستەیی شتێکی زۆر کەم وێنەیە. تەنانەت دەتوانین بڵێین ١٠٠٪ی ماندوویەتی کەسانێك کە لەپشتی مێزەوە دادەنیشن فیکری و دەروونیە. واتە سەرچاوەکەی هۆکارە هەستیەکانە.

چ هۆکارگەلێکی هەستی لەدەرکەوتنی ئەم حاڵەتە لەکەسانی پشتی مێزنشیندا کاریگەرە؟ شادی؟ هەستی ڕەزامەندی؟ نە، وانیە. بێ تاقەتی، نەفرەت، نەبوونی

هاندەر، نەبوونی ڕەزامەندی، پەلەپەل، نیگەرانی و قەلەقی.بەڵێ، هۆکاری ماندوێتی ئێمە ئەوەیە کە هەستەکانمان ئاڵۆزی لەدەروونماندا دروست ئەکەن. تەنیا کاری جەستەیی زۆر بە دەگمەن دەتوانێت ئەوەندە شەکەتی دروست بکات کە بەخەو و پشوودان چارەسەر نەبێت. نیگەرانی و پێک هەڵپڕژانی هەستی گەورەترین هۆکارەکانی ماندوویەتی زۆرن.

هەرئێستا بەخۆتاندا بچنەوە. ئایا بەسەر ئەم کتێبەدا هەڵکورماون؟ شانتان داکەوتووە؟ لەسەر کورسیەکە ناخۆش دانیشتوون؟ ئەگەر وایە ئێوە لەحاڵی بەرهەمهێنانی ماندویەتی مێشکیدان. بۆچی ئەم حاڵەتە ناپێویستانە لەکاتی کاری مێشکیدا دروست دەبن؟ چونکە هەموان پێیان وایە ئەگەر کاری گرنگ لەگەڵ گوشار و نیگەرانیدا نەبن بەباشترین شێوە ئەنجام نەدراوە. هەر بەو هۆیەوەیە کە ماسولکەکانمان دوچاری ئاڵۆزی دەبن هەتا ئەو هەستی هەوڵ و گوشارە بەدەست بێنین. سەیری ئەم ڕاستیە تاڵە بکەن:

ملیۆنەها مرۆڤ هەر ئێستا لەحاڵی بەفیڕۆدانی وزەدان. مرۆڤگەلێك کە تەنانەت خەوی لەدەستدانی پارەیش ناکەن، وزەی گرنگی خۆیان بەبێموبالاتی بەفیڕۆ دەدەن. ڕێگەی کار چییە؟ بۆ ڕزگار بوون لەم حاڵەتە دەبێ چی بکرێت وەڵامەکەی ئاسانە:

پشوودان! فێر بن لەکاتی ئەنجامی کاردا حاڵەتێکی ئاسودەو نا ئاڵۆزتان هەبێت. ئایا ئەنجامی بەم ئاسانییەیە؟ نا! لەوانەیە ناچار بن خوەکانتان تەرك بکەن، بەڵام بایی زەحمەتەکەی دێنێت، چونکە دەتوانێت شۆڕشێك لەژیانتاندا بەرپا بکات.

ویلیەم جیمز لەوتاری (سەبووریی ئۆقرەیی)دا دەنوسێت: (ئاڵۆزییەکان، تووڕەییەکان، ترسەکان و توندوتیژییەکان بە تەنیا خوی خراپن. ئاڵۆزی خویەکی خراپە، ئۆقرەیش هەر بەو شێوەیەیە. دەتوانم خوی خراپ تەرك بکەم و خوی باش لەخۆمدا دروست بکەم). چۆن دەکرێت لەئاڵۆزی نەجاتمان ببێت. سەرەتا دەبێت لەمێشکەوە دەست پێبکرێت یان لەفیکرەوە. هیچ کامیان. حەسانەوە دەبێت لەماسولکەکانەوە دەست پێبکات.

ویکی بائۆم ڕۆماننوسی بەناوبانگ دەڵێت کاتێك منداڵبو پیرەپیاوێکی بینی کە گرنگترین وانەی ژیانی فێر کرد. ویکی لەو ساتەدا کەوتبوو، مەچەکی دەستی و ئەژنۆی کوترابوو. پیرەپیاوەکە ئەوی هەستاندبووەو سەر و چاوی پاك کردبووەوە. ئەو

سەردەمێك جەمبازی سێرك بوو. بە ویكی وت: (دەزانی بۆچی كەوتی؟ چونكە خۆتت ڕەق گرتبوو. دەبێ فێر ببی وەكو بوكەڵە نەرمبی). ئەو پیرەپیاوە فێری ویكی و منداڵەكانی تری كرد چۆن تل لێبدەن بكەون و تەقلە لێدەن.

ئارامی و حەسانەوە بە مانای نەبوونی ئاڵۆزی و جوڵێنەرە. بیر لەئاسایش و ئاسوودەیی بكەنەوەو ئەم كارە بە ماسولكەكانی چاو دەست پێبكەن. پاڵبكەون و فرمان بە چاوتان بدەن لەحاڵەتی بچوكبونەوەوە بێنە حاڵەتی گەورە بوونەوە. هەوڵبدەن هەست بە ڕەوان بونی وزە لەماسولكەكانی دەموچاوتاندا بكەن كە بەرەو ناوەڕاستی لەش دەڕوات.

ئێستا سەرنج بدەنە ئەم پێنج پێشنیارە بۆ یارمەتی دانی ئێوە لەبەدەستهێنانی ئارامیدا:-

١- كتێبی ((ڕزگاربوون لەئاڵۆزبوونی دەمارگیری)) نووسراوەی ((دیڤید هاڕۆڵد فینك)) بخوێننەوە. بۆ داواكردنی ئەم كتێبە دەتوانن نامە بنێرن بۆ دەزگای سیمۆن و شۆستەر لەژمارەی (٢٠)، شەقامی نیویۆرك، راكفلەر سنتەر. هەروەها پێشنیار دەكەم كتێبی (بۆچی ماندوو دەبین) لەنوسینی ((دانیل دەبلیو جاسلین)) بخوێننەوە كە هەر دەتوانن لەو دەزگایە وەری بگرن.

٢- لەكاتی پشووداندا دەبێت لەشمان وەكو لەشی پشیلە نەرموشل بكەین. تەنانەت مامۆستایانی یۆگا لەهیندستان دەڵێن: بۆ زاڵبون بەسەر ئۆقرەیی و ئارامیدا دەبێت لێكۆڵینەوە لەسەر جوڵەكانی پشیلە بكرێت.

٣- تا ئەو شوێنەی دەكرێت لەكاتی كاركردندا خۆتان بخەنە حاڵەتێكی ئاسودە. ئاڵۆزی ماسولكەكان دەبێتە هۆی شەكەتی فیكری و عەسەبی.

٤- هەموو رۆژێك چەند جار دۆخی خۆتان هەڵسەنگێنن هەتا وەزعی خراپ سەختتر لەو شتەی بەڕاستی هەیە، بەسەر خۆتاندا نەسەپێنن. بەم كارە خوی ئاسودەیی و حەسانەوە لەخۆتاندا دروست دەكەن.

٥- لەكۆتایی رۆژدا پرسیار لەخۆتان بكەن (چەندە ماندوبوم؟ ئەگەر ماندوبوم بەهۆی كاری مێشكییەوە نییە بەڵكو بەهۆی شێوازی ئەنجامی كارەكەیە).. رۆژی خۆتان بە هەڵسەنگاندنی ڕادەی شەكەتی خۆتان كۆتایی پێ مەهێنن، بەڵكو بزانن چەندە ماندوبون. ئەم كارە لەشكاندنی خووی شەكەتی مێشكی بەسودە.



 

بابەتی سێهەم

## ژنانی ماڵەوە چۆن دەتوانن بەرگریی لەشەکەتی زۆر بکەن و جوانی خۆیان بپارێزن؟

پایزی ڕابردوو هاوبەشەکەی من چوو بۆ بۆستۆن تاکو لەیەکێك لەنائاساییترین کۆبوونەوە پزیشکیەکاندا بەشداری بکات. پزیشکی؟ بەڵێ. ئەم کۆبوونەوەیە هەموو حەفتەیەك پێك دێت و ئەو نەخۆشانەی بەشداری دەبن دەکەونە بەر پشکنینی ورد هەتا بۆ دەرچوون لەنەخۆشخانەکە پەسەند بکرێن. ناوی ئەم کۆبوونەوانە ((کۆنترۆڵی فیکر))ە کارەکەی لەڕاستیدا چارەسەرکردنی کەسانێکە کە بەهۆی نیگەرانی و قەلەقیەوە زەحمەت و نیگەرانیدان.

چۆن بوو وانەیەکی ئاوا دروست بوو؟ لەساڵی(١٩٣٠)دا دوکتۆر جۆزێف پیرەت کە شاگردی سەر ویلیام ئۆسلەر بوو تێگەیشت زۆربەی نەخۆشە سەرپێییەکان هیچ کێشەیەکی دەروونیان نیە، بەڵام لەباری جەستەییەوە کێشەیان زۆرە. بۆ نموونە خانمێك لەتاو ئێشی ئارترۆز کاری بەدەستی نەدەکرد. ژنێکی تر ئێش و ژانی شێرپەنجەی گەدەی هەبوو. ئەوانی تر ژانەسەر، پشت ئێشە، ماندوویی زۆرو ئێش و ئازاری نائاشکرایان هەبوو. ئەوان هەستیان بەم ئێشانە دەکرد، بەڵام پشکنینەکان هیچ کێشەیەکی جەستەیی دەرنەدەخست. دوکتۆرەکان دەیانوت تەواوی ئەمانە خەیاڵاتن و لەفیکرەوە سەرچاوەیان گرتووە.

بەڵام دوکتۆر پیرەت دەیزانی ئەگەر بەنەخۆشەکان بڵێت بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە و نەخۆشیەکە لەبیرکەن چونکە هیچ کێشەیەك لە ئارادا نیە، هیچ ئێشێك چارەسەر نەدەبوو. چونکە زۆربەی ژنەکان تەواو لەئازارەکانیان بێزار ببوون و ئەگەر بکرایە بەم ئاسانیە فەرامۆشی بکەن خۆیان ئەم کارەیان دەکرد. بۆیە دوکتۆر پیرەت ئەم وانەیەی دامەزراندوو لەماوەی ئەم ساڵانەدا کاری سەرسوڕهێنەر لەم شوێنەدا ئەنجامدراوە و

نەخۆشە زیاییەکان تەندروستیان بەدەستهێناوەو. هەندێك لەنەخۆشەکان چەند ساڵە دێن بۆ ئەم وانەیە، دەڵێی وەکو چوون بۆ کڵێسا کارێکی ئاینی بێت. هاوکارەکەم لەگەڵ یەکێك لەم ژنانە کە نۆ ساڵی تەواو دەهات بۆ ئەم وانەیە، قسەی کردبوو. ئەو ژنە وتبووی یەکەم جار (٩) ساڵ لەمەو بەر وایزانیبوو کێشەی دڵو گورچیلەی هەیە. ئەوەندە لەم بابەتە بێ تاقەت بوو کە جاری وابوو کاریگەری لەسەر توانای بینینی هەبوو. بەڵام ئەمڕۆکە ئەو زۆر تەندروستو ئارامە. کارێك کە لەم کۆبوونەوانەدا ئەنجام درابوو تەنیا فێرکردنی شێوەی پەی بردن بەبێ ئەنجامی نیگەرانیو بەرەنگاربوونەوەیان بوو.

باشترین دەرمان بۆ نیگەرانی ئەوە بوو کە دەربارەی قسەبکەین. ئەو نەخۆشانەی دێن بۆ ئەم چارەسەرگەیە دەتوانن تائەو شوێنەی دەیانەوێ سەبارەت بە کێشەکانیان قسە بکەنو لەدەستی ڕزگاریان بێت. بیرکردنەوە لەنیگەرانیو خۆ خواردنەوە دەبێتە هۆی ئاڵۆزی عەسەبی زۆر. هەموومان پێویستمان بەوەیە کێشەکانو دڵنیگەرانیەکانمان لەگەڵ خەڵکدا بێنینە گۆڕێو هەست بکەین کەسێك لەم دنیایەدا هەیە کە گوێ بۆ گرفتەکانی ئێمە دەگرێتو دەتوانێت لێمان تێبگات. هاوکارەکەی من شایەتی ئەوە بوو کە چۆن ئەو کەسانە بە قسەکردن دەگەنە ئارامیو ئۆقرەیی. دەروونشیکاری تا ڕادەیەکی زۆر بەهێزی شیفابەخشی وشەکانەوە وابەستەیە. لەزمانی فرۆیدەوە دەرکەوتووە ئەگەر نەخۆشان بتوانن دەربارەی کێشەکانی خۆیان قسەبکەن، دەتوانن زۆربەی پێك هەڵپڕژانە دەروونیەکانیان چارەسەر بکەن. بەڵام بۆچی؟ لەوانەیە وەڵام ئەوەبێت کە بەقسەکردن دەتوانین ڕوانینێکی باشترمان سەبارەت بە چۆنیەتی کێشەکە هەبێت. کەواتە ئەمجارە کە دووچاری کێشەی هەستی دەبینەوە باشتروایە بەدوای گوێچکەیەکدا بگەڕێین. ئەڵبەت نەك ئەوەی بگەڕێینو هەرکەسێکمان لەبەر چاوماندا بینی بەگلەییو دەردەدڵەکانمان سەری بێنینە ژان. بەڵکو دەبێ کەسێك هەڵبژێرین کە متمانەمان پێیەتی. دیدارێکی لەگەڵ ساز بکەینو داوای یارمەتی لێبکەین.

ئەگەر بەڕاستی هیچ کەس تەنانەت قەشەیەکیشتان نیە کە بتوانن دەردەدڵی لەگەڵ بکەن، دەتوانن بچن بۆ یەکێك لەکۆڕەکانی کۆنترۆڵی فیکریان لەوانەگەلێك کە بتوانن بە ئاسوودەیی قسەی تیا بکەنو بەهرەمەند و گوێچکەیەکی گوێگربنو ببینن تەنیا

وشەکان و موعجیزەیەك دروست دەکەن. دەردەدڵ کردن یەکێکە لەچارەسەرە بناغەییەکان لەکۆبوونەوەکانی چارەسەرگەی بۆستۆن. ئەڵبەت ئێمە فیکری تریشمان لەبینینی ئەم وانانە وەرگرتووە. فیکرگەلێك کە ئێوە وەکو ژنێکی ماڵەوە ڕەچاوی بکەن.

١- دەفتەرێك دانێن و تیایدا بابەتی ئیلهام بەخشی وەکو شیعر، دۆعا، وشەی جوان یان هەرشتێکی تایبەت بە خۆتان کە بەلاتانەوە جوانە بنووسن. پاشان لەئێوارەیەکی بارانیدا کاتێك دڵتان دەگیرێت دەتوانن دەفتەرەکە بکەنەوە و خۆ ڕگرییەك لە بەرامبەر تێکشکاندنی تەسلیمی خەمی خۆتان پەیدا بکەن.

٢- زۆر خۆتان گیرۆدەی عەیب و کەم و کوڕی خەڵك مەکەن. بێ گومان هاوسەری ئێوە عەیب و کەم و کووڕی هەیە. ئەگەر ئەو قەشەبووایە خۆ هاوسەرگیری نەدەکرد. لەیەکێك لەکۆبوونەوەکاندا ژنێك هەبوو کە بەردەوام گلەیی لەمێردەکەی دەکرد و عەیبەکانی ئەوی بە نەشیاوی تەحەممول کردن پێناسە دەکرد. بەڵام لەبەرامبەری یەك پرسیاردا خۆی دۆڕاند. پرسیاریان لێکرد: ((ئەگەر هاوسەرەکەت بمرێت چی ئەکەیت؟)) ئەم پرسیارە ئەوەندە ئەوی هەژاند کە خێرا خشتەیەکی دوورو درێژی لەتایبەتمەندییە باشەکانی مێردەکەی نووسی! ئێوەیش ئەمجارە کە بیرتان کردەوە هاوسەرەکەتان دێوێکی پیسکەیە باشتروایە ئەم شێوازە تاقی بکەنەوە.

٣- بەنیسبەت دراوسێکانتانەوە میهرەبان بن و پێوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ کەسانێك دروست کەن کە لەگەڕەکەکەتاندا دەژین.

٤- لەپێش نووستندا بەرنامە بۆ کارەکانی بەیانی دارێژن. لەم وانانەدا بینیمان کەژنانی ماڵەوە لەکارە بێ پایانەکانی ماڵەوە وەڕەسن و هەرگیز کارەکانیان کۆتایی نایەت و بەهەڵپەن. بۆ دەرمانی ئەم هەستە پێشنیارکرا ژنان خشتە بەندییان بۆ کارەکانیان هەبێت و ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە کاری زیاتر بەنیسبەتی ڕابردووەوە ئەنجامدرا.

٥- سەرەنجام لەئاڵۆزی و ماندوویەتی زۆر خۆتان بپارێزن. ئارامی! ئۆقرەیی! هیچ شتێك زیاتر لەئاڵۆزی ئێوە پیرناکات. هاوکارەکەی من لە کۆبوونەوەی کۆنترۆڵی فیکردا بینی کە زۆرێك لەو بنەمایانەی لەبابەتی پێشوودا خستمانە بەرباس، لەو وانەدا بەڕێوەدەبرێت. ئەویش ڕاهێنانی ڕیلەکسەیشنی لەگەڵ هەموان ئەنجامداو



 

لەپاش دە خولەك ئەوەندە ئارام ببوورەوە کە خەو بردبوویەوە. بۆچی لەدەروونناسیدا ئەوەندە جەخت لەسەر ئۆقرەیی جەستەیی دەکاتەوە؟ چونکە هەموو پزیشکان دەزانن کە بۆ لەناوبردنی ئالۆزییەکی پەیوەندیدار بە نیگەرانیەوە دەبێ ئۆقرەیی بەدەست بێنین.

ئێوە ژنانی ماڵەوەیش دەبێ ئەم ئۆقرەییە بەدەست بێنن. خاڵی بالاتر بوونی ئێوە ئەوەیە کە دەتوانن هەر کاتێك پێتان خۆشبێت ڕابکشێن و لەسەر زەوی ڕاکشێن. بەڵێ، بۆ بەدەستهێنانی ئۆقرەیی زەوی ڕەق و تەق لەتەختی سپرینگ باشترەو بۆ بڕبڕەکان بەسوود ترە.

ئێستا چەند نموونە ڕاهێنانتان پێ پێشنیار دەکەم. ئەم ڕاهێنانە بۆ ماوەی یەك حەفتە ئەنجام بدەن و هەست بە جیاوازییەکان بکەن.

١- کاتێك هەستت بەماندوویەتی کرد لەسەر زەوی ڕاکشێ و لەشت بکێشەرەوە. ئەگەر حەزت کرد بەپاڵدا بتلێرەوە. ئەم کارە لەڕۆژدا دووکەرەت ئەنجام بدە.

٢- چاوتان ببەستن و ئەم ڕستانە تەڵقین کەن بەخۆتان: ((هەتا و ئەدرەوشێتەوە. ئاسمان شین و سامالە. سروشت ئارامەو لەژێر کۆنترۆڵدایەو من کەرۆڵەی سروشتم لەگەڵ جیهاندا هەماهەنگم)).

٣- ئەگەر ناتوانن ڕابکشێن چونکە چێشتەکەتان لەسەر ئاگرە، دەتوانن هەر ئەم کارە لەسەر کورسیەك ئەنجام بدەن. کورسیەك بەپشتی ڕاست و بنی ڕەقەوە هەڵبژێرن. ڕاست لەسەری دانیشن و بەری دەستتان بخەنە سەر ڕانتان.

٤- پاشان بەئارامی پەنجەکانی قاچتان ڕەق کەن و بەئارامی خاوی بکەنەوە. پاشان ماسولکەکانی قولە پێتان ڕەق کەن و شلی بکەن. ئەم کارە هەتا مل ئەنجام بدەن. پاشان سەرتان شل کەن تاکو بەدەوری ملتاندا بسووڕێت، دروست وەکو تۆپ.

٥- بەهەناسەی قووڵ مێشکتان ئاسوودە بکەن. هەناسەدانی ڕێك وپێك و بەنەرم و قووڵ یەکێکە لەباشترین شێوازەکانی حەساندنەوەی مێشك.

٦- بیر لەچرچ و لۆچەکانی ڕوخسارتان بکەنەوە. هەوڵ بدەن چرچی دەوری دەمتان و لۆچی بەینی برۆکانتان شل بکەن. ڕۆژی دووجار ئەم کارە بکەن. لەوانەیە چیتر پێویستتان بەمەساجی دەم و چاو نەبێت.

بابەتی چوارەم

# چوار خووی پیشەیی کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی ماندوو بوون و هیلاکی.

خووی ژمارە (۱):سەر مێزی کارەکەتان خاوێن کەن. تەنیا با ئەو پێویستیانەی پێوەندییان بەکاری ئێستاتانەوە هەیە لەسەر مێزی کارەکەتان بێت.

ڕۆناڵد ویلیامز بەرپرسی هێڵی شەمەندەفەری شیکاگۆو باشووری ڕۆژ ئاوای ئەمریکا دەڵێت: ((ئەگەر ئەو کەسانەی کە مێزی کارەکەیان پڕە لەکاغەزو شتی پەیوەست بەکاری جۆراو جۆر،خاوێنی بکەنەوەو تەنیا پێداویستی ئەو کارەی ئەو ساتەیان لەبەردەستدابێت، دەبینن کە کاراییان زیاتر دەبێت)).

شاعیری بەناوبانگ پۆپ، هەمیشە دەیوت: ((یەکەم یاسای ئاسمانی نەزمو ڕێکوپێکییە)). دەبێ لەکارو پیشەشدا ئەم یاسایە بخەینە سەری سەرەوە. ئەڵبەت بەشێوەی مامناوەندی فەرمانبەران پێڕەوی لەم یاسایە ناکەن و بەردەوام مێزی کارەکەیان پڕە لەکاغەزی هەفتەی پێشوو. سەرنوسەری ڕۆژنامەی نیوئۆرلیانز بەسەرهاتێکی سەیری بۆ گێڕامەوە. ئەو دەیوت یەکێك لەسکرتێرەکانی لەپاش خاوێنکردنی مێزی کارەکەی ئامێرێکی تایپی دۆزییەوە کە دوو ساڵبوو ون بوبو.

بینینی مێزێکی ئاوا کە پڕە لەنامەو ڕاپۆرت و نوسراوەی کۆن، هەر لەخۆیەوە نیگەرانی دروست دەکات. جاری وایە لەوەیش خراپتر، بینینی ئەم مێزە ساتبەسات بیرتان دێنێتەوە کە هەزاران کاری ئەنجامنەدراو بەدەستەوەیەو لەوانەیە ببێتە هۆی سەرکەوتنی پاڵەپەستۆی خوێن، برینی گەدەو نەخۆشی دڵ. دکتۆر جان سترۆکس لەزانکۆی (پەنسلڤانیا)وە لە وتارێکدا بەناوی (دەرون پەشێوی پیشەیی یان

هۆکارەکـانی نەخۆشـی سیـستەماتیك). یـانزە مـەرجی بـەیان کـردووە کـە دەبێ لەنەخۆشدا سەرنجی بدەینێ.

یەکەم مەرجەکەی بریتییە لە: ((هەستی ناچاری، کۆمەڵی بێ کۆتایی ئەو کارانەی لەپێش دەمتاندایەو دەبێ ئەنجام بدرێن))..

بـەڵام مەگـەر دەکـرێ تـەنیا خاوێنکردنـەوەی مێـزی کـارو چـەند بڕیاردانێـك ئێـوە لەگوشاری زۆر رزگار بکات؟ دکتۆر ویلیام سەدلەر لەبارەی نەخۆشێکەوە قسە دەکات کـە بـە ئـەنجامی ئـەم کـارە تـوانی لـەگرفتێکی گرنگـی دەروونـی رزگـاری بێـت. ئـەو نەخۆشە بەڕێوەبەری کۆمپانیایـەکی گـەورە بوو لەشیکاگۆ کاتێـك هـات بۆ لای دکتۆر سـەدلەر عەسـەبی و نیگـەران بـوو، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە دەیزانـی لەحاڵـەتێکی پـڕ مەترسیدایە، نەیتوانی واز لەکارەکەی بێنێت و پێویستی بە یارمەتی بوو.

دکتـۆر سـەدلەر دەنوسـێت: ((کاتێـك ئـەم کابرایـە داسـتانەکەی بـۆ گێڕامـەوە تەلەفۆنەکەی من لێدرا. تەلەفۆنەکە لەنەخۆشخانەوە بوو، من بێ دواخستنی کارەکە مامـەوە هـەتا بڕیـاری پێویـست بدەم. زۆربـەی کـات عادەتم وایە کارەکـان بـەبێ کـات کوشتن ئەنجامبدەم. تەلەفۆنەکەم دانەخستبوو کە دیسان لێدرایەوە. سێهەمین بڕینی بەرنامە کاتێك بوو کـە هاوکارەکـەم هاتـە ژوورەوە. لـەپاش چارەسـەرکردنی کێشەکەی ئەو رووەمکردە نەخۆشەکەم و لەوەی چاوەڕوانبوە داوای لێبوردنم کرد، بـەڵام ئەو زۆر شـادو تەندرست دەردەکـەوت و روخـساری تـەواو گۆڕابـوو. نەخۆشـەکە بـە منـی وت: داوای لێبوردن مەکە دکتۆر! وابزانم تێگەیشتم کێشەکەم چییە. دەبێ بگەڕێمەوە بۆ نوسـینگەکەم و ئیـشە عادەتیـەکانم بگـۆڕم. بـەڵام لـەپێش ڕۆیـشتندا ئایـا دەکرێـت سەیرێکی چەکمەجەکانی مێزەکەتان بکەم؟))

دکتـۆر سـەدلەر دەڵێـت ئـەو سـەیری هـەموو چـەکمەجەکانی مێزەکـەی کـردو بینـی هـەموویان بـەتاڵن و تـەنیا چەند دانە قەڵـەم و کاغـەزیان تیایە پاشان پرسیاری کـرد: ((ئێوە کارە ناتـەواوەکانتان لـەکوێ هـەڵدەگرن؟)) وەڵامەکە ئەمە بـوو: ((کـاری ناتـەواو یـان نامـەی وەڵام نـەدراوە لـەکاردا نیـە. مـن کارەکـان لـەکاتی دروسـتبونیان ئـەنجام دەدەم))

شـەش هەفتـە دوای ئـەوە ئـەم پیـاوە دکتـۆر سـەدلەری بانگهێـشت کـرد بـۆ نوسینگەکەی. هەم خۆی گۆڕابوو، هەم مێزی کارەکەی. ئەو سودی لەشێوازی دکتۆر

وەرگرتبوو، یان بەدوانەخستنی کارەکان و لەسەر یەك کۆنەکردنەوەی کاغەز توانیبوی لەدەستی نیگەرانی و قەلەقی بێ هۆ رزگاری بێت.

عادەتی ژمارە (دوو): کارەکان بە تەرتیبی پێش و دوا ئەنجام بدەن.

((هێنری دۆهێرتی)) دەڵێت هەر چەند دەرماڵە زیاد بکرێت، لەناو فەرمانبەراندا هەمیشە دوو تایبەتمەندی کەم بەرچاو دەکەوێت. یەکێ تایبەتمەندی بیرکردنەوەو ئەویتر تایبەتمەندی ئەنجامدانی کارەکانی بە تەرتیبی گرنگی.

((چارلز لاکمەن)) کەسێك بوو کە لەسفرەوە دەستی پێکردو لەماوەی دوانزە ساڵدا بووە سەرۆکایەتی کۆمپانیای پەپسۆ دەندو دەرماڵەی ساڵانەی سەد هەزار دۆلار بوو، سەرەڕای ئەوە ملیۆنەها دۆلاری تریش داهاتی هەبوو. ئەو دەڵێت زۆربەی سەرکەوتنەکانی خۆی مەمنونی ئەم دوو تایبەتمەندییەیە.

ئەو دەڵێت: ((تا ئەو شوێنەی لەبیرم بێت هەمیشە (٥)ی بەیانی لەخەو هەڵدەستم چونکە لەو کاتەدا باشتر دەتوانم بیر بکەمەوەو ئەو کاتە بەرنامە بۆ ڕۆژەکەم دادەڕێژم تاکو بتوانم کارەکان بە گوێرەی پێویست ڕاپەڕێنم)).

فرانکلین بتگەر یەکێك لەناودارترین کەسانی سیستەمی دابینی کۆمەڵایەتی لەئەمریکا تەنانەت هەتا کاتژمێر (٥)یش ناوەستێت تاکو بەرنامە بۆ ڕۆژەکەی دارێژێت. ئەو ئەم کارە شەو ئەنجام ئەدات و ئامانجێکی بۆ خۆی دیاریکردووە. بۆ نموونە دەڵێت بەیانی دەبێ ئەوەندە گرێبەست ئەنجام بدات. ئەگەر نەیتوانی ئەو ئەندازەیە تەواو بکات ئەو ئەندازەیە بۆ ڕۆژیی دوایی زیاد دەکات. تاقیکردنەوە دەریخستووە ناتوانین بەپێی بەرنامەی گرنگی پێش و دوا کار بکەین، بەڵام لەهەمان حاڵدا دەزانین هەبوونی بەرنامەو خشتە باشتر لەوەیە کە کارەکان هەر لەخۆوە ئەنجام بدەین.

عادەتی ژمارە (٣): ئەگەر دوچاری کێشەیەك بوون و ئەگەر زانیاری تەواوتان لەبەردەستدا بوو ئەو کێشەیە بەبێ کات کوشتن چارەسەر بکەن. تائەو شوێنەی دەتوانن بڕیاردان دوامەخەن. یەکێك لەشاگردەکانی ڕابردووی من، کۆچکردوو ((ئیچ . پی . هاوڵ)) دەیوت کاتێك ئەندامی لیژنەی بەڕێوەبەری کارگەی پۆڵا سازی ئەمریکا بوو کۆبوونەوەکانی لیژنەکە زۆربەی کات درێژ دەبووەوەو سەرەڕای ئەوە سەبارەت بە

زۆرشت قسەدەکرا بڕیاری کەم دەدرا. ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە ئەندامەکان ناچار بوون ڕاپۆرتی زۆر بۆ خوێندنەوە بەرنەوە بۆ ماڵەوە.

سەرەنجام بەڕێز هاوڵ ئەندامەکانی ڕازی کردبوو هەرجار لەکێشەیەك بکۆڵنەوەو بڕیارەکەی هەرلەوێدا دەرکەن و هیچ دواخستنێك لەکاردانەبێ. بڕیار لەوانەیە داواکردنی زانیاری زیاتر یان ئەنجامی کارێك بێت بەڵام بەهەر حاڵ دەبێ بدرێت پێش ئەوەی بچنە سەر کێشەی دوایی. بەڕێز هاوڵ دەیوت ئەنجامی ئەم کارە زۆر شایانی سەرنج و سەرکەوتوو بوو. ئیتر کارەکان کەڵەکە نەدەبوون و ئەندامەکان ناچار نەدەبوون کۆگایەك لە ڕاپۆرت بەرنەوە بۆ ماڵەوەو ئیتر نیگەرانی کێشەی چارەسەر نەکراو لەناو ئەواندا نەبوو. ئەم یاسایە نەك هەربۆ لێژنەی بەڕێوەبەری ئەو کارگەیە، بەڵکو بۆ منو بۆ ئێوەیش بەسوودە.

عادەتی ژمارە (٤): ڕێکخستن، بەرپرسیاریەتی و چاودێری فێر بن.

زۆرێك لەکار بەدەستان پێش وەخت خۆیان ئەدەنە دەست قەلەقی، چونکە نازانن چۆن دەبێ بەرپرسیارەتی بە خەڵك بدەن و پێداگرن لەسەر هەرکارێك کەخۆیان دەیکەن. ئەنجامەکەی دەبێتە ئەوەی کە وردەکاری جۆراو جۆرو سەر لێشێواوی ئەوان گێژووڕ دەکات و ئەوان بەردەوام هەست بەپەلەپەل و نیگەرانی و عەسەبی بوون و ئاڵۆزی دەکەن. دەزانم شێوازی بەرپرسیارەتی دان سەختە، چونکە خۆم ئەم سەختیەم تاقیکردووەتەوە. بەدانی بەرپرسیارەتی بە کەسانی نەشیاو بەردەوام کێشە دروست دەبێ، بەڵام لەکاتی سەختیدا بۆ ڕزگار بوونی کاربەدەست و بەڕێوەبەر لەنیگەرانی و قەلەقی پێویستە. کەسێك کە کۆمپانیایەکی گەورە دادەمەزرێنێت، ڕێکخستن و نەزم، دابەش کردنی بەرپرسیارەتی و چاودێری نازانێت، زۆربەی کات لەتەمەنی (٥٠) ساڵیدا دوچاری کێشەو ناڕەحەتی سەرچاوە گرتوو لەنیگەرانی و ئاڵۆزی دەبێت. نموونەتان دەوێ؟ کەواتە سەرنج بدەنە بەشی تەعزییە لەڕۆژنامەکاندا!

بابەتی پێنجەم

# بێ تاقەتی و لەش قورسی، ماندوویەتی و نیگەرانی و بێزاری دەخوڵقێنێت.

یەکێك لەهۆکارەکانی ماندوویەتی زۆر لەش قورسیە. وەرن ژیانی خێرانووسێك بەناوی ئالیس کە لەدراوسێیەتی ئێوەدا دەژی بهێنینە بەرچاو. شەوێك ماندو وهیلاك دێتەوە بۆماڵەوە. جوڵانەوەکانی هەموو نیشانەی ماندوو بوونی دەردەخات. ژانەسەرو پشت ئێشە ئامانی لەبەر بڕیوەو دەیەوێ بێ خواردنی نانی ئێوارە بچێتە ناو جێگەوە. دایکی تکای لێدەکات چاوەڕێی خواردنی ئێوارە بێت. لەسەر مێزی نان خواردن دادەنیشن. تەلەفۆن لێدەدرێت. هاوڕێکەیەتی کە ئەو بۆ میوانی داوەت دەکات. چاوی بریسکەیەك ئەدات و دڵخۆش دەبێت و هەتا کاتژمێر (۳) لەمیوانیەکەدا دەمێنێتەوە. کاتێك دەگاتە ماڵەوە نەك ماندوو نیە؛ بەڵکو لەتاو کەیف و شادی خەوی لێناکەوێت.

ئایا (۸) کاتژمێر لەوەپێش ئەو بەڕاستی ماندوو بوو؟ بەڵێ ماندوو بوو؟ ماندوو بوو چونکە لەیەکدەستی کارەکەی یان ژیانی وەڕەس ببوو. ملیۆنەها ئالیس بوونی هەیە. لەوانەیشە ئێوە یەکێك لەوانە بن. ئەم ڕاستیە سەلمێنراوە کە شەکەتی پێش ئەوەی بەهۆی کاری جەستەییەوەبێت بەرهەمی هەستەکانە. دوکتۆر جۆزێف بارماك ماوەیەك لەمەوبەر ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی بڵاو کردەوە کە پیشان ئەدات چۆن بێ تاقەتی ماندوویەتی دروست دەکات. ئەو چەند خوێندکارێکی گرتە بەر پشکنین کە دەیزانی حەزیان لێی نیە. ئەنجامەکەی ئەوە بووکە ئەوانخێرا ماندوو بوون و ژانە سەرو چاو ئێشە ڕووی تێکردن. هەندێکیان تەنانەت تووشی ژانە سکیش ببوون. ئایا هەمووی خەیاڵاتی خوێندکارەکان بوو؟ نا ! تاقیکردنەوە میتابۆلیکیەکانی ئەوان

دەریدەخات پاڵە پەستۆی خوێن و وەرگرتنی ئۆکسجین لەخوێندا بەهۆی بێ تاقەتیەوە کەم دەبێتەوەو لەگەڵ ئەوەی هۆکاری بێ تاقەتی هێنەر لابرێت میتابۆلیسم دەگەڕێتەوە حاڵەتی خۆی.

کەم ڕوودەدات لەکارێك کە خۆشە بەلامانەوە، ماندوو ببین. بۆ نموونە لەچالاکی ماندووکەری وەکو شاخەوانیش لەوانەیە گوشاری جەستەیی زیاتر ببێتە هۆی ماندوو بوون.

دوکتۆر ئیدوارد تۆرندایك توانی دەستەیەك پیاوی گەنج بەهۆی سەرگەرم کردنیانەوە یەك حەفتە بێ خەو ڕابگرێت. ئەو لەپاش لێکۆڵینەوەی زۆر ڕایگەیاند کە ((بێ تاقەتی هۆکاری سەرەکی ماندوو بوونی زۆرە)). ئەگەر ئێوە کاری مێشکی زۆر ئەنجام ئەدەن، ئەندازەی کار لەماندوویەتی ئێوەدا دەوری زۆر نیە. لەوانەیە ئەو ئەندازەکارەی ئەنجامتان نەداوە ببێتە هۆی ماندوو بوونی ئێوە. بۆ نموونە بیهێننە بەر چاوتان ڕۆژێك بەردەوام دوچاری کێشە بوونەتەوەو نەتانتوانیوە نامەیەك وەڵام بدەنەوە یان دیدارێك بکەن. بەڵام لەکۆتایی ڕۆژدا لەگەڵ ئەوەی نەتانتوانیبوو کارێك ئەنجام بدەن، ماندوو بوون و ژانەسەرتان هەبوو.

ڕۆژی دوایی کارەکانتان لەنووسینگەکەتاندا بەئاسانی بەرەو پێش دەچوو، ئێوە ئەرکی زۆرتان ئەنجامدا، بەڵام لەکۆتایی ڕۆژدا لەش سووك بوون و هەستتان بەماندوو بوون نەدەکرد. بێ گومان ئەمەتان تاقیکردۆتەوە. باشە، دەبێ چ دەرسێك لەم حاڵەتە وەرگرین؟ ئەوەی ماندوویەتی هەمیشە بەرهەمی کارکردن نیە، بەڵکو زۆربەی کات دروستبووی نیگەرانی، بێ تاقەتی و بێزارییە. وزەی ئێوە بەردەوام لەگەڵ حەزەکانتاندایە. (١٠) هەنگاو ڕێ ڕۆیشتن لەگەڵ ژنێکی بۆڵە بۆڵ کەر چەندەها جار ماندووکەر ترە لەچەندەها کیلۆمەتر ڕێ ڕۆیشتن لەگەڵ ژنێکی قسە خۆش و ڕوو کراوە.

کەواتە دەبێ چی بکرێت؟ وەرن بزانین خێرا نووسێك کە لەکۆمپانیایەکی نەوت لەتۆلسای ئۆکلاهاما کار دەکات چی لەگەڵ ئەم کێشەدا کرد. کاری ئەو زۆر بێ تاقەت کەربوو، هەربۆیە هەوڵیدا بەجۆرێك بۆ خۆیی خۆش کات. چۆن؟ کێبەر کێیەکی لەگەڵ خۆی دانا. تەواوی ئەو فۆرمانەی لەپێش نیوەڕۆدا پڕی دەکردەوەو دەیبژاردوو هەوڵی ئەدا زیاتر لەو ژمارەیە ئەنجام بدات. هەروەها ڕۆژی دوایی لەڕۆژی پێشوو

زیاتر بنووسێت. ئەنجامەکەی بوو بەوە کە لەهەموو خێرانووسەکانی بەشەکەی خۆی خێراتربوو. ئەگەرچی ئەم کارە بەرز بوونەوەی پلە یان پاداشتی لەگەڵ نەبوو، بەڵام بووە هۆی ئەوەی لەماندوویەتی زۆری دروست بوو بە هۆی بێتاقەتیەوە ڕزگاری بێت. لەکوێوە دەزانم ئەم داستانە ڕاستە؟ لەوێوە کە لەگەڵ ئەم ژنە خێرانووسەدا هاوسەرگیریم کردووە!

ئێستا بابچینە سەر بەسەرهاتی خێرا نووسێکی تر. ئەویش بۆی دەرکەوت ئەگەر جۆرێك هەڵس و کەوت بکات کە دەڵێی کارەکەی خۆشە، لەبێ تاقەتی ڕزگاری دەبێت. زۆرتر لەگەڵ کارەکەیدا کێشەی هەبوو، بەڵام لەپاش ئەم کارە کێشەکەی چارەسەر بوو. ناوی ئەو ((ئۆلی جی گۆڵدن)) بوو، خەڵکی ئۆلینۆیز بوو. خودی ئەو لەنامەیەکدا کە بۆ منی نووسیوە بەسەرهاتەکە ئاوا دەگێڕێتەوە:

((لەنووسینگەکەی ئێمە چوار خێرانووس هەیە. هەرکام لەئێمە نامەکانی چەندین کەس وەردەگرین. جار جار کاتی سەر خوراندنیشمان نابێت. ڕۆژێك کە جێگری بەشەکە داوای لەمن کرد نامەیەکی دوورو درێژ سەر لەنوێ تایپ بکەمەوە تووڕە بووم. ویستم پیشانی بدەم دەکرێ نامەکە بەبێ تایپ کردن چاك بکرێت و ئەو بەتووڕەیی وەڵامی دایەوە ئەگەر من ئەم کارە نەکەم کەسێکی تر لەجیاتی من پەیدا دەکات. سەرەڕای ئەوەی لەتاو تووڕەیی سوور ببوومەوە دەستم کرد بە تایپ کردنەوەی نامەکە، چونکە دەمزانی چەندین کەس ئامادەن ئەم کارە لەدەستم دەربێنن. هەروەها بەمێشکمدا هات من پارەوەردەگرم هەتا ئەم کارە بکەم. بەم فکرانە حاڵم باشتر بوو. لەوە بەدواوە بڕیارمدا جۆرێك هەڵس و کەوت بکەم کەدەڵێی کارەکەمم پێ خۆشەو ئەم دۆزینەوە گەورەیەم کرد کە ئەگەر کارەکەم بە جۆرێك ئەنجام بدەم کە ئەڵێی خۆشم دەوێت، تاڕادەیەك چێژی لێوەردەگرم و کاتێك چێژم لێ وەرگرت خێراتریش دەگەم بە کارەکانمدا. ئێستا زۆربەی کات زیادە کار دەکەم.

زۆری پێ نەچوو کە من وەکو فەرمانبەرێکی ئارەزوو مەند ناسرام و کاتێك یەکێك لەبەر پرسانی کۆمپانیاکە پێویستی بە سکرتێری تایبەت پەیدا کرد داوا لەمن کرا ئەم کارە بکەم، چونکە بەبێ ڕووگرژ کردن ئامادە بووم کاری زیادە بکەم. ئەم دۆزینەوە کە گۆڕینی ڕوانگە وەها هێزێکی هەیە بووە هۆی ئەوەی لەکارەکانمدا بەرەو پێش بچم و سنوور ببەزێنم)).

ئەگەر لاسایی چێژ وەرگرتن لەکارەکەتان بکەن، هەر ئەم لاسایی کردنەوەیە دەبێتە هۆی ئەوەی تاڕادەیەك حەز لەکارەکەتان بکەن و هەروەها ماندوویەتی، نیگەرانی و ئاڵۆزی ئێوە کەم دەبێتەوە.

چەندەها ساڵ لەمەوبەر ((هارلان هاوارد)) بڕیارێکیدا کە بووە هۆی ئەوەی ژیانی بگۆڕێت. ئەو لەدەورانی دواناوەندیدا لەڕیستۆرانی خوێندنگەکەیان کاری دەکرد. سەرەڕای ئەوەی نەفرەتی لەکارەکەی دەخواردەوە لەگەڵ ئەوەشدا ناچاربوو ئەنجامی بدات. کەواتە بڕیاریدا پیشە وەڕەس کارەکەی بکات بە کارێکی خۆش و سەرنج ڕاکێش. لەڕاستیدا کارەکەی ئەو زۆر تاقەت پڕوکێن بوو. ئەو دەبوایە دەورییەکانی بشۆردایە، مێزەکانی پاك بکردایەتەوەو ئایس کریمی بفرۆشتایەو ئەمە لەحاڵێکدا بوو کە منداڵەکانی تر تۆپێنیان دەکرد. ئەو بڕیاریدا لێکۆڵینەوە دەربارەی ئایس کرێم بکات و مەوادی پێك هێنەری و تایبەتمەندی کیمیایی ئەو بناسێت و بزانێت بۆچی بەشێك لەئایس کرێمەکان باشترن لەجۆرەکانی تر.

ئەم ئارەزوو مەندییەی ئەو بۆ کیمیای ئایس کرێم بووە هۆی ئەوەی لەوانەی کیمیادا زیرەك بێت و هەر ئەم ئارەزوومەندییەی ئەوی بۆ بەشی تەکنەلۆژیای خۆراك لەزانکۆی ماساچۆسێت ڕاکێشا. کاتێك کۆمپانیای ((کاکاو ئێکسچەنج))ی ئەمریکا کێبەر کێیەکی وتارنووسی دەربارەی بەکارهێنانی چکلێت و قاوە دانا و خەڵاتێکی سەد هەزار دۆلاری بۆ دیاریکرد، پێتانوایە کێ بردیەوە؟ بەڵێ، هارلان هاوارد بردیەوە!!

لەپاش تەواوبوونی خوێندن کاتێك بینی دۆزینەوەی کار سەختە، بڕیاریدا لەژێر زەمینی خانووەکەیدا تاقیگەیەك دابنێت. لەم کاتانەدا یاسایەك پەسەند بوو کە دەبێ ژمارەی باکتریای ناو شیر بژێردرێت. ئەویش شیری (١٤) کۆمپانیای گەورەی خستە بەر لێکۆڵینەوەو تەنانەت دوو هاوکاری بۆ خۆی دامەزراند. (٢٥) ساڵ دوای ئەو دەگاتە کوێ؟ لەپاش (٢٥) ساڵ کەسانی ئێستای سەر گەرم لەکارە جیاوازەکانی پیشەسازی خۆراك پیرو خانەنشین دەبن و لاوانێکی وەکو ئەو جێگەیان دەگرنەوە. بێ گومان لەپاش (٢٥) ساڵ ئەو دەبێتە یەکێك لەپێشڕەوانی پیشەسازی خۆراك و ئەڵبەت یەکێك لەهاوپۆلەکانی بۆڵە بۆڵ دەکات کە دەوڵەت لەبیری ئەواندا نیەو کاری باشیان

نیە. بەڵێ، ئەگەر هارلانیش بڕیاری نەدایە کارێکی تاقەت پڕووکێن بکات، لەوانەبوو لەجیاتی هاوپۆلەکەی بێت.

((ئێچ . ڤی. کەڵتێنبۆرن))، لێکۆڵەری بەناوبانگی بەشی هەواڵی ڕادیۆیش ئەزموونێکی ئاوای هەبوو کەبۆی گێڕامەوە. کاتێك تەمەنی (٢٢) ساڵ بوو لەسەر پاپۆڕی هەڵگری ڕەوە ئاژەڵ لەزەریای ئەتڵەسیەوە لەحاڵێکدا بە ئاژەڵەکاندا ڕادەگەیشت، تێپەڕ دەبوو. لەپاش گەڕانی بە دەوری بەریتانیادا بەپاسکیل بە برسیەتی گەیشتە پاریس‌و بە گرەو دانان لەسەر کامێرەکەی بە (٥) دۆلار ئاگادارییەکی لەرۆژنامەدا دەرکردو کارێکی پەیدا کرد. پیشەی ئەو فرۆشتنی ئامێری ئیسترۆسکۆپ بوو. لەوانەیە ئێوەیش ((ئیسترۆسکۆپ)) تان بینیبێت. هەر ئەو ئامێرەی لەبەر چاودا دەیگرین هەتا وێنە بەجووت‌و هاوشێوەی یەکتر کە لەیەکدا ئاوێتە دەبوون‌و وێنەی سێ لایەنی پیشان ئەدا، ببینین.

بەهەرحاڵ ئەو ماڵ بەماڵ کەوتە فرۆشتنی ئەم ئامێرە لەحاڵێکدا زمانی فەرەنسی نەدەزانی.بەم حاڵەوە توانی پێنج هەزار دۆلار لەساڵی یەکەمی کۆمیسیۆن وەر بگرێت. ئەو دەیگێڕایەوە کە ئەم ئەزموونە ڕێگەی سەرکەوتن‌و هۆکاری ئەوەی وەها بەو ناساند کە لەهاروارد نەیدەتوانی فێر ببێت. ئەم لەم ناسینەی خۆی لەسەر ژیانی خێزانە ئەورووپاییەکان لەدواییدا زۆر کەڵکی لەم ئەزموونە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکانی ئەورووپا وەرگرت.

شێوازی کاری ئەو ئەمە بوو: داوای لەخاوەن کارەکەی کردبوو ئەو شتەی پێویستە بیڵێت بۆی بنووسێت. پاشان لەبەری کردبوو، کاتێك دەرگای ماڵێکی دەکوتا بەشێوەیەکی زۆر گاڵتەوە قسەی لەگەڵ ژنی ماڵەکە دەکردوو بە ئامێرەکە وێنەگەلێکی پیشانی ئەو ئەدا. کاتێك پرسیارێکی لێدەکرا دەیوت: ئامریکایی! ئامریکایی!. پاشان کڵاوەکەی لادەبردوو کاغەزێکی پیشان ئەدا کە بەسەریەوە چەسپابوو، شتە لەبەرکراوەکەی لێ نووسرابوو. هەردووکیان پێدەکەنین‌و بەمجۆرە موشتەرییەکە شل دەبوو. ئەڵبەت ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو. ئەو هەموو ڕۆژێك بەیانی لەبەر ئاوێنەدا سەیری خۆی دەکردوو لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد هەتا وره بگرێت‌و کارەکەی خۆشتر بکات.

ئامۆژگاری ئەو بۆ لاوانی ئەمریکایی ئەمەیە: ((هەموو ڕۆژێک بەیانیان وره بە خۆتان ببەخشن و قسەی هیوا بەخش بکەن، ئەڵبەت ئەگەر خوازیاری سەرکەوتنن. هەموومان گرنگی وەرزشی بەیانیان بۆ ئامادەکردنی جەستە دەزانین. ئەم کارەش وەرزشێکی ڕۆحی و مێشکییە کە ئێوە بۆ کارەکەتان ئارەزوومەند دەکات)).

بەم کارەو تەڵقین کردنی فیکری پۆزەتیڤ کاری خۆتان خۆشتر دەکەن. بەرپرسی ئێوەیش هەر ئەوەی دەوێت. ئەو دەیەوێ ئێوە حەزتان لەکارەکەتان بێت. ئەڵبەت بەرپرس لەبیرکەن. وەرن بزانین ئارەزوومەندی ئێوە بەنیسبەتی کارەکەتانەوە چ قازانجێکی پێوە دەبێت. بیری خۆتان بێننەوە ئەم کارە شادی و ڕەزامەندی ئێوە لەژیاندا زیاد دەکات. مێشکی ئێوە لەنیگەرانیەکان و قەلەقی لائەدات و لەدرێژماوەدا پێدەچێت ببێتە هۆی بەرز بوونەوەی پلەوپایەو دەرماڵەتان. ئەڵبەت ئەگەر پلەوپایەو دەرماڵەی زیادەیش لەکاردا نەبێ، ڕادەی ماندوو بوونی ئێوە ئەوەندە دادەبەزێت کەکاتی حەسانەوەی زۆر خۆشتان دەبێ کەنرخی زیاترە.

بابەتی شەشەم

# خۆ پاراستن لە نیگەرانی و بێخەوی.

ئایا کاتێک کەناتوانن باش بخەون دووچاری نیگەرانی دەبن؟ کەواتە لەوانەیە بەلاتانەوە خۆش بێت کە ((سامۆئیل ئۆنترمیر)) لەماوەی ژیانیدا یەک شەو خەوی ئاسوودەی نەبووە.

کاتێک ((سامۆئیل ئۆنترمیر)) چوو بۆ زانکۆ بەهۆی دوو نەخۆشیەوە گرفتار بوو: یەکیان بێ خەوی و ئەویتر رەبۆ. بەهۆی ئەوەی هیچیان دەرمان نەدەکرا بڕیاریدا ئەم بێخەویان لەڕاستیدا بێدارییەی خۆی بەباشترین شێوە بەهرەی لێ وەربگرێت، لەجیاتی ئەملاولاکردن و فیکرو خەیالات دەربارەی بێ خەوی شەوانە کەوتە خوێندنەوەی دەرسەکانی. ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە هەموو وانەکانی بە نمرەو پلەی بەرز تەواو کردو بووە یەکێك لە کەسایەتیەکانی زانکۆی نیویۆرك. تەنانەت لەدەورانی کارکردن لەبواری پارێزەریشدا بێ خەوی ئەو درێژەی هەبوو، بەلام ئەو هیچ نیگەران نەبوو دەیگوت: ((سروشت ئاگای لەمنە)). هەروایش بوو، ئەو تەنانەت زیاتر لەپارێزەرەکانی تر کاری دەکرد، چونکە کاتێك ئەوان خەوتبوون ئەو بەئاگابوو.

بێ خەوی ئەو درێژەی هەبوو، هەتا نیوە شەوی بەخوێندنەوە بەڕێ دەکردو پاشان کاتژمێر (٥) هەڵدەستا و نامەکانی دەنووسی. کاتێك خەڵك بەرە بەرە کاری ڕۆژانەیان دەست پێدەکرد کاری ئەم کەم تا زۆرێك نیوەی تەواو ببوو. ئەو توانی هەتا (٨١) ساڵی بژی و زۆر بەکەمی گەر بە تەواوی شەوێك خەوی لێکەوتبێت. بەلام ئەگەر ئەم بابەتە ببوایەتە هۆی نیگەرانی و ئازاری ئەو بێ گومان نەدەگەیشتە ئەم تەمەنە.

یەك لەسەر سێی تەمەنی ئێمە بەخەو دەڕوات. بەم حاڵەوە هیچ کەس بەدروستی نازانێت بەڕاستی خەو چیە؟ دەزانین خەوتن حاڵەتی حەسانەوەو جۆرێك عادەتە،

بەلام دیار نیە چەند کاتژمێر خەو بۆ ئێمە پێویستەو تەنانەت نازانین ئایا خەو بەڕاستی پێویستە یان نا؟

سەیرە؟ لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا سەربازێك لەبەشی سەرییەوە فیشەکی بەرکەوتو بەشێك لەمێشکی زیانی پێگەیشتو خەوی لەدەستدابوو. دوکتۆرەکان هەرکارێکیان کردو تەواوی دەرمانەکانی خەو مادەی هۆشبەرو تەنانەت هیپۆتیزمیشیان تاقی کردەوە، بەلام تەنانەت نەیانتوانی چاوی گەرم کەن. ئەوان بڕوایان وابوو زۆر نامێنێت، بەلام هەڵەیان کردبوو. ئەو کارێکی پەیدا کردو چەندەها ساڵ لەئو پەڕی تەندروستیدا ژیا. ئەو ڕادەکشا، چاوی دەبەستو دەحەسایەوە بەلام خەوی لێنەدەکەوت. حاڵەتی ئەم سەربازە زۆرێك لەبۆچوونەکانی سەبارەت بەخەو بەتاڵ کردەوە.

هەندێك لەخەڵك بەنیسبەت کەسانی ترەوە پێویستیان بە خەوی زیاتر هەیە. کەسانێك تەنیا(٥) کاتژمێر دەخەون، بەلام کەسانێکیش هەن پێویستیان بە (١٠یان ١١) کاتژمێر خەو هەیە. بەهەر حاڵ نیگەرانی دەربارەی بێ خەوی زیاتر لەخودی ئەو زیانتان پێ دەگەیەنێت. بۆ نموونە یەکێك لەخوێندکارانی من بەناوی ((ئێرا سەندێر)) خەریك بوو نزیك بوو لەبەر بێ خەوی دەست بداتە خۆکوشتن:

((بەڕاستی بیرم دەکردەوە خەریکم شێت دەبم. کێشەکە ئەوە بوو سەرەتا خەوم قورس بوو، بەزەنگی کاتژمێر لەخەو هەڵنەدەستامو هەمیشە درەنگ دەچووم بۆ کارەکەمو بەرپرسەکەم هۆشداری پێ ئەدام لەسەری کاتدا بچم بۆ شوێنی کارەکەم. دەمزانی ئەگەر ئەم وەزعە درێژەی هەبێت کارەکەم لەدەست ئەدەم.

ئەم بابەتەم لەگەڵ هاوڕێکانمدا باس کرد. یەکێك لەوان پێشنیاری کرد لەپێش خەودا تەرکیز بکەمە سەر کاتژمێرەکە. ئەم پێشنیارە سەرەتای بێ خەوی من بوو. دەنگی کاتژمێرەکە بووە وەسوەسە بۆ من. تەواوی شەو نەیدەهێشت بخەومو کاتێك دەبووە بەیانی حاڵم تێك دەچوو. ماندوویێتیو نیگەرانی منی نەخۆش خستبوو. بێ خەوییەکەم هەشت حەفتە درێژەی هەبوو. ئەوەندە عەسەبی دەبووم کە دەمویست خۆم لەپەنجەرەوە فڕێدەمە خوارەوەو لەم حاڵەتە ڕزگارم ببێت.

سەرەنجام چووم بۆلای دوکتۆر. ئەو وتی: ((ئێرا، نەمنو نەهیچ کەسی تر ناتوانێت یارمەتی تۆ بدات، چونکە دروستکەری ئەم کێشەیە خۆت بوویت. باشتر وایە شەوانە

لەجێگەكەدا پاڵ بكەویت و بەخۆت بڵێیت هیچ گرنگی پێ نادەم ئەگەر هەتا بەیانی نەخەوم و بەس ڕابكشێم. بەهەرحاڵ چاوت ببەستەو لەجێگەكەتدا پاڵ بكەوە)). ئەم كارەم كردو لەماوەی یەك مانگ و نیودا گەیشتمە حاڵەتی ئاسایی و خەوی (٨) كاتژمێری خۆم)).

دوكتۆر كلایتمەن دەڵێت: ((كەسانێك كە نیگەرانی بێ خەوین، زۆرتر زیاتر لەوەی بزانن دەخەون)).

بۆ نموونە كەسێك كە دەڵێت دوێ شەو چركەیەك نەخەوتم، لەوانەیە چەند كاتژمێر خەوتبێت بەڵام ئاگای لێی نەبووبێت. بۆ نموونە ((هێربێرت ئیسپەنسێر)) لەبیرمەندانی سەدەی نۆزدە بەردەوام گلەیی لەبێخەوی خۆی دەكرد. ئەو كە زگورتی بوو زۆربەی كات گوێچكەی دەئاخنی هەتا دەنگە دەنگ ئازاری نەدات. جاری وایش بوو تلیاكی بەكار دەهێنا. شەوێك ئەوو پرۆفیسۆر سالیس لەژوورێكدا نووستبوون. بەیانی ئیسپەنسیر گلەیی لەبێ خەوی دەكرد، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە پرۆفیسۆر سالیس بوو كە تەواوی ئەو شەوە لەبەر پرخەپرخی ئەو خەوی لێنەكەوتبوو.

یەكەم پێویستی خەوێكی باش هەستی ئاسایشە. دەبێ ئەو هەستەمان هەبێ كەهێزێكی بەتواناتر لەئێمە ئاگای لەئێمە دەبێت. دوكتۆر تۆماس هیسلاپ ئەندامی ئاسایشگەی وێست ڕایدینگیش لەوتاری خۆیدا بۆ كۆبوونەوەی پزیشكانی بەریتانیا بەجەختەوە لەم خاڵە دەدوێت: ((یەكێك لەباشترین ئەو خەوهێنەرانەی من لەپاش چەندەها ساڵ تاقیكردنەوە پێی گەیشتووم دوعایە. ئەم شتە وەكو پزیشكێك باس دەكەم. دۆعا كردن لەو كەسانەدا كە وەكو عادەت ئەنجامی ئەدەن دەبێ وەكو ئارامبەخشی مێشك و عەسەبی بیژمێرین)).

((ژانت مەك دۆنالد)) بۆی دەگێڕامەوە كە كاتێك نیگەران یان پەشێو دەبێت و كێشەی بێ خەوی دێتە سۆراخی، بەردەوام بەوتنەوەی ئەم ئایەتانە هەستی ئاسایش لەدەرونیدا دروست دەبێت: ((سەروەر، شوانی منە.ئیرادەی من دەوری نیە. ئەو بوو كە منی لەدەشتێكی سەرسەوزدا خەواند، ئەوە كە من بۆ كەنارەكانی دەریای ئارام ڕێنوێنی دەكات)).



 

بەڵام ئەگەر ئێوە مرۆڤێکی ئایینی نەبن و بتانەوێت لەڕێگەیەکی ترەوە ئەم کارە بکەن، ئەو کاتە باشتر وایە بە سوودوەرگرتن لە پێوانەی جەستەیی بگەنە ئارامی و حەسانەوە.

((دوکتۆر دیڤید هارۆڵد فینک)) کە کتێبی ((ڕێگەیەك بۆ ئاڵۆزییە عەسەبیەکان))ی نووسیوە دەڵێ باشترین ڕەوشی ئەم کارە قسەکردن لەگەڵ جەستەی خۆتە. بەوتەی ئەو وشەکان کلیلی تەواوی جۆرەکانی هیپنۆتیز من و کاتێك ئێوە کێشەی بێ خەویتان هەیە، هۆکەی ئەوە خۆتان بەو شتە ڕازی کردووە. ڕێگە چارە ئەوەیە خۆتان لەحاڵەتی هیپنۆتیزم بێننە دەرەوەو ئەم کارە دەتوانن بە تەڵقینی ماسولکەکان بەمجۆرە ئەنجام بدەن: ((شل بن....شل بن....شل بن و بحەسێنەوە))..

ئەمە دەزانین کەبەهۆی ئاڵۆزیی و نیگەرانیەوە ماسولکەکان ڕەق دەبن و دەبنە هۆی بێ خەوی. کەواتە باشتروایە خەوتن لەماسولکەکانەوە دەست پێ بکەن. دوکتۆر فینك پێشنیار دەکات سەرینێکی بچووك بخەینە ژێر بازۆڵەکانمانەوە. پاشان فەرمانی شل بوون بدەین بە دانەبەدانەی ماسولکەکان و ئەم کارە بە ماسولکەکانی دەم و چاو دەست پێ بکەین. لەم حاڵەتەدا لەپێش ئەوەی بزانین خەو دەمانباتەوە. من ئەم کارەم تاقیکردووەتەوەو بینیم کە بەسوودە. ئەگەر ئێوە کێشەی بێ خەویتان هەیە کتێبی ناو براو بخوێننەوە. ئەمە تەنیا کتێبێکە کە هەم خوێندنەوەی سەرنج ڕاکێشەو هەم دەرمانی بێ خەویە. یەکێکی تر لەڕێگەکانی دەرمانی بێخەوی ئەوەیە کە بە باخەوانی، مەلەکردن، تێنس، گۆلف، خلیسکێنە، یان هەرکارێکی جەستەیی ترخۆتان لەباری جەستەییەوە ماندووبکەن. ئەمە کارێکە کە تیۆدۆر درایزەر، ڕۆماننووسی ئەمریکایی ئەنجامیدا. ئەو کاتێك نووسەرێکی گەنج و پرشەوق بوو بۆ دەرمانی بێ خەوی خۆی چوو بۆ کۆمپانیای هێڵی شەمەندەفەری نیویۆرك و وەکو کرێکار دەستی کرد بەکارکردن. لەپاش یەك ڕۆژ بزمار داکوتان و خاکەناز بەدەستەوە گرتن ئەوەندە ماندوو دەبوو کە بەسەختی بۆ نان خواردن بەئاگابێت.

ئەگەر بە ئەندازەی تەواو ماندوو بین سروشت ئێمە ناچار دەکات تەنانەت لەکاتی ڕێکردنیشدا بخەوین. نموونەیەك دێنمەوە:

کاتێك منداڵ بووم باوکم واگۆنێکی پڕ لەبەرازی پەرواری برد بۆ شاری سەن هو. چونکە دوو بلیتی شەمەندەفەری پێبوو منیشی لەگەڵ خۆی برد. تا ئەو کاتە پێم

نەنابووە شارێك کە دانیشتووانی لەچوار هەزار کەس زیاتر بێت. کاتێك گەیشتمە ئەو شارە شەست هەزار کەسیە لەتاو شەوق گێژ ببووم.

بینای چەند نهۆمو شەمەندەفەری ناو شار ئەوەندە بەلامەوە سەرنج ڕاکێش بوو کە ئێستا دەتوانم بیهێنمەوە بەرچاوم. لەپاش ئەو ڕۆژە کە خۆشترین و پڕشەوقترین ڕۆژ بوو بۆ من، لەگەڵ باوکم گەڕاینەوە بۆ لادێکەمان. کاتژمێر (٢)ی بەرەبەیان گەیشتینە ناوشارو بۆ گەیشتن بە کێڵگەکەمان دەبوایە (٤) میل بەپێ بڕۆیشتینایە. خاڵی گرنگی بەسەرهاتەکە ئەوە بوو کە ئەوەندە ماندوو بووم کە لەکاتی ڕێکردندا خەوم لێکەوتبوو!

دوکتۆر فۆستەر کەندی دەڵێت: ((ئەگەر مرۆڤ شەکەتوو ماندووبێت لەژێر هەورە بروسکە یان ترس و لەرزی شەڕیشدا خەوی لێدەکەوێت)).

ئەو لەگەڕانەوەی سوپای پێنجی بەریتانیادا بینیبووی سەربازەکان کوت وپڕ لەسەر جێگەکەیاندا دەکەوتن و بەجۆرێك دەخەوتن کە دەتگوت بێ هۆش و گۆشن.

تەنانەت کاتێك پێڵوەکانیانت بەپەنجە دەکردەوە دیسان هەڵنەدەستان و ڕەشێنەی چاویان بەرەو دواوە گەڕابووەوە.

دوکتۆر دەڵێت: ((ئەم ئەزموونە بووە هۆی ئەوەی هەرکاتێك کێشەی بێ خەویم هەبێت هەوڵ بدەم گلێنەی چاوم بۆ سەرەوە بگەڕێنمەوە. لەم کاتەدا لەپاش چەند چرکە دەست دەکەم بە باوێشك دان و خەوم دێت. ئەم ڕەوتە وەکو شتێکی خۆنەویست ڕوو ئەدات)).

هیچ کەس تا ئێستا هەوڵینەداوە بە نەخەوتن خۆی بکوژێت و کەسیش ئەم کارە ناکات. سروشت بەپێچەوانەی تەواوی ئیرادەی مرۆڤەوە خەوی لێدەخات. بەڵام دەربارەی خواردن و خواردنەوە بەو جۆرەنیە.

کاتێك باسی خۆکوشتن کرا بابەتێك لەکتێبی ((ناسینەوەی مرۆڤ)) لەنووسینی ((دوکتۆر هێنری سی لینك)) هاتەوە یادم. لەبەشێکی ئەم کتێبەدا بەناوی ((زاڵبوون بەسەر ترس و نیگەرانیدا)) داستانی نەخۆشێك هەیە کە ویستوویەتی خۆی بکوژێت. دوکتۆر لینك دەیزانی باس کردن لەگەڵ نەخۆشەکە کارەکە خراپتر دەکات، کەواتە بەوی وت: ((ئەگەر ئەتەوێ خۆت بکوژیت لانی کەم بە شێوازێکی قارەمانانە ئەنجامی بدە. ئەوەندە هەڕا بکە تادەمری!))

ئەو چەندجار ئەم کارەی تاقیکردەوەو هەر جارە هەستی باشتربوونی لادروست بوو. شەوی سێهەمی هەڵهاتنەکان ئەو ئەوەندە ماندوو بوو کە وەکو ورچ خەوت. پاشان بووە ئەندامی یانەکی وەرزشیو ئەوەندە هەستی بەوزە دەکرد کە دەیویست هەتا هەتایە زیندوو بێت.

**پێنج یاسا بۆ خۆپاراستن لەبێ خەوی:**

١- ئەگەر بێ خەون کاریان کتێب خوێننەوە تا خەوتان لێبکەوێت .

٢- لەبیرتان بێت کەبێ خەوی هیچ کەسی نەکوشتووە. نیگەرانی لەبێ خەوی لەخودی بێ خەوی خراپترە.

٣- دۆعاکردن تاقی بکەنەوەو ئایەتی ئارامبەخش لەبەر خۆتانەوە بڵێن.

٤- لەشتان لەئاڵۆزی دەربێننو کتێبی ((ڕزگاربوون لەئاڵۆزی)) بخوێننەوە.

٥- وەرزش بکەن. ئەوەندە جەستەی خۆتان ماندوو بکەن هەتا خەوتان لێبکەوێت.

## کورتەی بەشی حەوتەم

## شەش ڕێگای پێشگرتن لەماندوویەتیو نیگەرانیو بەرزکردنەوەی وورەو وزە

**یاسای یەکەم:** لەپێش ماندوو بووندا بحەسێنەوە.

**یاسای دووەم:** فێربن لەکاتی کارکردندا ئاسوودە بن.

**یاسای سێهەم:** ئەگەر ژنی ماڵەوەن بەپرلەکسەیشن پارێزگاری لەتەندروستیو جوانی خۆتان بکەن.

**یاسای چوارەم:** ئەم چوار عادەتەی باش کردن بگرنەکار:

١- مێزی کارەکەتان لەکاغەزو بەڵگەنامەی جۆراو جۆر خاوێن بکەنەوەو تەنیا ئەوشتەی پێوەندی بەکاری ئێستاتانەوە هەیە دایبنێن.

٢- کارەکان بەبێ ڕیز بەندی ئەنجام بدەن.

٣- کاتێك ڕوو بەڕووی کێشەیەك بوونەوە لەحاڵەتی هەبوونی زانیاری تەواودا زوو چارەسەری بکەن.

٤- فێری ڕێكوپێك کردن بن و بەرپرسیارێتی و چاودێری لە ئەستۆ بگرن.

**یاسای پێنجەم:** بۆ پێشگرتن لەماندوویەتیو نیگەرانی ئارەزوومەندی کارەکەتان بن.

**یاسای شەشەم:** لەبیرتان بێت هەرگیز کەس لەتاو بێخەوی نەمردووە. نیگەرانی دەربارەی بێ خەوییە کە زیان بەخشە نەك خودی بێ خەوی.

بابەتی یەکەم

## یەکێك لەدوو بڕیاری بنچینەیی ژیان.

(ئەم بەشە ڕووی لەو پیاو و ژنە گەنجانەیە کە هێشتا پیشەی داخوازی خۆیان نەدۆزیوەتەوە. ئەگەر ئێوەیش لەو دەستەیەن خوێندنەوەی ئەم بەشە کاریگەری قووڵی لەسەر ژیانتان دەبێت).

ئەگەر لەژێر تەمەنی (١٨) ساڵەوەن بەرە بەرە چاوەڕوانی ئەوەتان لێدەکرێت هەتا دوو بڕیاری بنچینەیی لەژیاندا بدەن. بڕیارێك کەتەواوی ژیانتان بەشێوەی بنچینەیی دەگۆڕێت. بڕیارگەلێك کە کاریگەری دیمانە نەکراوی لەسەر بەختەوەری، داهات، تەندروستی و....ئێوە دەبێت بڕیارگەلێك کە هەم لەوانەیە بنیاتنەری ژیان بێت و هەملەناوبەر.

ئەم دوو بڕیارە گرنگە کامانەن؟

یەکەم: چۆن بژێوی ژیان پەیدا دەکەن؟ دەتانەوێ خاوەن مووچەو مەزرا، فەرمانبەری پۆستە، کیمیست، پاسەوانی داستان، خێرانووس، پزیشکی ئاژەڵان، مامۆستایان لەفە فرۆشبن؟

دووەم: کێ دەبێتە دایك یان باوکی منداڵەکانتان؟

هەردوو بڕیارەکە کەمو زۆر وەکو قوماروان. هەری ئیمرسۆن دەڵێت: ((هەر کوڕێك لەکاتی هەڵبژاردنی کاردا قومار بازە کە دەبێ ژیانی لەسەر دانێت)). چۆن دەکرێ مەترسی ئەم قومارە کەم بکرێتەوە؟ سەرەتا هەوڵ بدەن کارێك هەڵبژێرن کە حەزتان لێی بێت. جارێك برسیارم لە دیڤید گۆدریچ، سەرۆکی لیژنەی بەڕێوەبەری کارگەی بەرهەمهێنانی تایەی گۆدریچ کرد دەربارەی ئەوەی بە بۆچوونی ئەو بناغەی سەرکەوتنی پیشەیی چیە، کرد. ئەو وەڵامی دایەوە: ((چێژ وەرگرتن لەکار. ئەگەر

چێژ لەکارەکەتان وەربگرن چەند کاتژمێری بەردەوام دەتوانن کار بکەن، بەبێ ئەوەی لەلاتان سەختیو زەحمەتی کاری هەبێت، بەڵکو وەکو یاری لێدێت)).

ئەدیسۆن، داهێنەری وزەی کارەبا دەتوانێ نموونەیەکی باش بێت. ئەو کوڕێکی ڕۆژنامە فرۆش بوو گەیشتە قۆناغی دروستکردنی گۆڕانکاری بناغەیی لەپیشەسازی ئەمریکادا. ئەو زۆربەی کات لەتاقیگەکەی خۆی دەخەوتو نانی دەخواردو ڕۆژانە (١٨) کاتژمێر کاری دەکردو بەردەوام دەیوت: (( لەژیاندا یەك ڕۆژ کارم نەکردووە، هەمووی ڕابواردن بوو)). جێی سەرسوڕمان نیە کە ئەو سەرکەوتوو بوو!

بیستم کە چارلز ئاشوبیش هاوشێوەی ئەم وتەیە لەقسەکانیدا بەکار دەبات: ((مرۆڤ لەهەرشتێك کە سەبارەت بەوە ئارەزوویەکی بێ سنووری هەبێت، سەرکەوتوو دەبێت)).

بەڵام ئەگەر نەزانن کاری خۆشەویستو دڵخوازتان چیە چۆن دەتوانن حەزتان لێی بێت؟ خاتوو ئەدناکەر دەڵێت گەورەترین تراژیدیا ئەوەیە کە ئەو هەموو گەنجە نازانن پیشەی دڵخوازیان چیەو هەرگیز ناتوانن پەیی پێ ببەن. پێموایە هیچ کەس بەدبەختتر لەوکەسە نیە کە تەنیا بژێوی ژیانی لەکارەکەی پەیدا دەکات. جاری وایە خوێندکارانی زانکۆ دێن بۆلای منو دەڵێن: ((بڕوانامەی ماستەر یان بەکالۆریۆسم لەزانکۆی ماوس یان کارنێل هەیە. ئایا لەم ڕێکخراوەی ئێوەدا کاری تیایە بۆ من؟)) ئەوان خۆیان نازانن حەزیان لەچ کارێکە یان دەیانەوێت چی بکەن. ئایا جێی سەرسووڕمان نیە کە کەسانێکی خاوەن بیرو داهێنەر کە بەشەوقەوە دەچنە ناو بازاڕی کار، لە (٤٠) ساڵیدا دەگەنە بێ هیواییو خەمۆکی؟ لەڕاستیدا پیشەی گونجاو تەنانەت بۆ تەندروستیش گرنگە.

کاتێك دوکتۆر ڕیمۆند چێرل لەگەڵ کۆمپانیایەکی بیمەی کۆمەڵایەتی لێکۆڵینەوەیەکی هاوبەشی ئەنجام ئەدا تاکو هۆکارەکانی تەمەن درێژی بدۆزێتەوە، یەکێك لەهۆکارە گرنگەکانی خشتەکەی پیشەی گونجاو ڕاگەیانرا. تۆماس کارلایل دەڵێت: ((بەختەوەر کەسێکە کە کارەکەی دۆزیبێتەوە. ئەو نابێ هیچ ڕەحمەتێکی تری بوێت)).

لەم ماوەدا بۆ خواردنی ئێوارە لەگەڵ ((پاول دابلیو بۆ بنتۆن)) بەڕێوەبەری بەشی دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی سۆکۆنی وەکیوم هەبوو. ئەو نووسەری کتێبی

((شەش ڕێگەی دۆزینەوەی پیشە))یە. پرسیارم لێکرد: ((گەورەترین هەڵەو ئیرادی گەنجانی شوێن کار کەوتوو چییە؟ وەڵامی دایەوە: ((ئەوانە بەدروستی نازانن دەیانەوێ چ کارێك بکەن. بەڕاستی جێی داخە کاتێك دەبینم گەنجان ئەوەندەی گرنگی ئەدەنە کرینی قاتی چاکەت و پانتۆڵ، ئەوەندە گرنگی نادەنە کارەکەیان. لەماڵێکدا تەواوی داهات و ڕەزامەندی لەژیان و ئۆقرەیی مێشك وابەستەیە بەم هەڵبژاردنەوە)). باشە، چارەی کار چییە؟ ئێوە دەتوانن بەهرە لەزانستێکی نوێ وەربگرن کە خزمەتی ڕاوێژ کردنی پیشەیی پێشکەش دەکات. تەواوی خوێندنگەو زانکۆکان ڕاوێژکاری پیشەییان هەیە.

تەنانەت دەتوانن نامە بۆ چاودێری پارێزگا بنێرن و لەڕێگەی ئەوەوە پێوەندی لەگەڵ بەشی زانیاری پیشەیی بگرن. ئەڵبەت دەبێ بزانن کە ئەم ڕاوێژ کارو دەزگایانە تەنها پێشنیاردەکەن و بڕیاردان لەدەستی خۆتاندایە. لەبیرتان بێت کە ئەم ڕاوێژکارانە هەڵەیش دەکەن. ئەوانیش جار جار تووشی هەڵە دەبن. بۆ نموونە ڕاوێژکارێکی پیشەیی پێشنیاری بەیەکێك لە شاگردەکانی من کردبوو ببێتە نووسەر، تەنیا لەبەر ئەوەی لەباری وشەوە بەهێز بوو. گاڵتەیە، وانیە؟ ڕاوێژکردن ئەوەندەیش ئاسان نیە. نووسراوەی چاك نووسراوەیەکە کەبتوانێت بەئاسانی فیکرو هەستەکان بگوازێتەوە بۆ خوێنەر. بۆ ئەم کارە ئێوە پێویستتان بەوشەی زۆر نیە، بەڵکو پێویستتان بەفیکر، ئایدیا و ئەزموون و باوەڕو تێڕامانە. ئەو ڕاوێژکارەی پێشنیاری بەم خانمە کردبوو ببێتە نووسەر، تەنیا توانیبووی یەك کار بکات. خێرانووسێکی (تایپیست)ێکی سەرکەوتوو بکات بەڕۆمان نووسێکی دڵشکاوی داهاتوو.

ئەو شتەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە کە شارەزایانی ڕاوێژکارو ڕێنوێنی کەری پیشەییش شایانی هەڵەن. باشترایە لەگەڵ چەند ڕاوێژکاردا دیداربکەن، بۆچوونەکانیان کۆبکەنەوەو لەڕوی عەقڵی سەلیمەوە بڕیاری کۆتایی دەرکەن. لەوانەیە سەیربێ بەلاتانەوە کە من لەکتێبێکدا دەربارەی کەمکردنەوەی نیگەرانی وەها بەشێکم داناوە. بەڵام کاتێك بزانن چەند لەعەسەبی بوونەکان، نیگەرانیەکان و پەشیمانیەکانی ئێمە پەیوەندی بەو پیشەوە هەیە کەلێی نارازین ئیتر بەلاتانەوە سەیرنابێت. دەتوانن ئەمە لە باوك، دراوسێ یان بەرپرسەکەتان پرسیار بکەن. کەسێکی بەرچاوو گەورەو بیرمەندی وەکو جان ستوارت میل دەڵێت:

((ئاماوشێوەییەکانی پیشەسازی یەکێکە لەگەورەترین زیانەکانی کۆمەڵگای ئێمە)). هەروەها ناڕازیترین کەسانیش ئەوانەن کەلەپیشە ناماوشێوەکان لەگەڵ خۆیاندا خەریکی کارن.

دەزانن چ جۆرە کەسانێك لەسوپادا لەپێ ئەکەون و ئەدۆڕێن؟ کەسانێك کەلە شوێنی نادروستدان! دەربارەی بریندارانو زیانەکانی شەڕ قسەناکەم. مەبەستم زەمانی خزمەتی ئاساییە. دوکتۆر ویلیام مەنینگەر یەکێك لەگەورەترین دەروونناسانو بەرپرسی بەشی مێشكو دەروونی سوپا لەماوەی شەڕدابوو. ئەو دەڵێت: ((ئێمە لەسوپادا پەیمان بەگرنگی هەڵبژاردن، دانانی کاری تایبەتو دانانی کەسانی گونجاو لەکاری گەنجاودا، برد.... تێگەیشتنی گرنگی پیشە زۆر گرنگ بوو. ئەوەی بزانین فلان کەس سەبارەت بەچ شتێك بێ مەیلە، لەکوێدا هەست بەگونجاو نەبوونی خۆی دەکات. لەکوێدا هەست بەنەبوونی پێزانین دەکاتو لەکوێدا وابیر دەکاتەوە تواناکانی بەفیڕۆ دەچن، زۆر گرنگ بوو. چونکە لەم دۆخانەدا بەردەوام کەسانێك بەکێشەی عەسەبییەوە دروست دەبوون)).

، هەر بەم هۆکارانە یەك کەس دەتوانێت لەپیشەسازیدا دوچاری کێشە ببێتو ئەو کارەش تووشی کێشە بکات. بۆ نموونە سەرنج بدەنە بەسەرهاتی فیل جانسۆن. باوکی ئەو دوکانی ئوتووی هەڵمی هەبوو، کوڕەکەیشی برد بۆ کارەکەی هەتا بتوانێت لەوانەیە بتوانێت بێتە ناو ئەم کارەوە. بەڵام فیل نەفرەتی لەم کارە بوو. هەر بۆیە سەمبول کاریی دەکرد. دەسووڕایەوەو یەك تۆز لەئەرکەکەی جێبەجێ نەدەکرد. جاری وابوو چەند ڕۆژ نەدەچوو بۆ کارەکەی. باوکی لەهەبوونی وەها منداڵێکی بێ موبالاتو بێ شەوق لەلای فەرمانبەرەکانی شەرمی دەکرد.

ڕۆژێك فیل بەباوکی وت دەیەوێ ببێتە فیتەر. پیرە پیاو لەم بابەتە سەری سووڕمابوو، بەڵام ئەو بڕیاری خۆی دابوو. ئەو لەچاڵە ڕۆناوییەکانی دوکانەکەدا کاری دەکردو زیاتر لەوەی لە ئوتووی هەڵم پێویست بوو کاری دەکردو چەندەها کاتژمێر کاری دەکرد، بەڵام ناڕازی نەبوو. ئەو خوێندنی لەبەشی ئەندازیاری میکانیکی تەواوکردو کاتێك لەساڵی (١٩٤٤)دا مرد بەڕێوەبەری کۆمپانیای بوویینگ

بوو. ئەگەر بلکایە بەکاری ئوتووی هەڵمەوە چ شتێکی بۆ دەهاتە پێش؟ پێموایە لەپاش مەرگی باوکی هەموو شتێکی بەبادا.

بۆ ئەوەی مقۆ مقۆی خێزانی نەیەتەپێش دەڵێم: تەنیا لەبەر ئەوەی خێزانەکەت داوات لێ ئەکات بچیتە ناو پیشەیەکی تایبەت، هەست بەناچار بوون بۆ ئەو پیشە مەکە. مەچنە ناو پیشەیەک کە ناتانەوێت، بەلاّم پەندو پێشنیاری دایک و باوکیش بەوردی بخەنە بەرهەڵسەنگاندن. ئەوان عەقڵێکیان بەدەست هێناوە کە تەنیا و تەنیا بەرهەمی چەندەها ساڵ تاقیکردنەوەیە. بەهەرحاڵ سەرەنجام ئەوە ئێوەن کە دەبێ بڕیاربدەن. باشە ئێستا سەرنج بدەنە چەند پێشنیارێك دەربارەی هەڵبژاردنی پیشە:

١- ئەم پێنج خاڵە لەبەر چاو بگرن کە پرۆفیسۆر هەری دێکستێر کیتسۆن، یەکێك لە پێشڕەوانی ڕاوێژی پیشەیی ئەمریکا بەیانی کردووە:

A – مەچن بۆلای کەسانێك کە دەڵێن بەڕەوشێکی سیحر ئامێز دەتوانن توانای ئێوە بۆ کارو پیشە بدۆزنەوە. ئەمانە لەوانن: کەللەسەر ناسان، ئەستێرەناسان، ڕاڤەکەرانی کەسایەتی و خەتنووس. شێوازی ئەمانە ناکارامەیە.

B – مەچن بۆلای کەسانێك کە لەڕێگەی تاقیکردنەوەوە توانای پیشەیی ئێوە دیاری دەکەن. ئەمجۆرە کەسانە ئەو بنەمایانەی ڕاوێژکاران دەبێ لەبەرچاویان بێت، بۆ نموونە دۆخی جەستەیی، کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەو کەسە لەبەرچاوناگرن.

C – بەدوای ڕاوێژکارێکەوە بن کە زانیاری تەواوی دەربارەی پیشە جۆراو جۆرەکان هەبێت و لەبۆ چوونەکانیدا سوودیان لێوەربگرێت.

D – ڕاوێژکاری نامەیی وەرمەگرن.

٢- مەچنە ناو کارگەلێك کە ئیتر یەکجار پڕو زۆرو زەوەندن. لەئەمریکا زیاتر لە (٢٠) هەزار پیشە هەیە بەلاّم گەنجان لەم شتە بێ ئاگان. لەخوێندنگەیەکدا ٦٠٪ی کوڕان تەرکیزی خۆیان خستووەتە سەر (٥) پیشەو هەروەها کچانیش ٨٠٪ یان بەوشێوەیەن. جێی سەرسوڕمان نیە کە ئەم پیشانە پڕبووبن و نیگەرانی و نائارامی



 

پیشەیی لەنێوان ئەم کەسانەدا زۆر بێت. هۆشیاربن بەزۆر نەچنە قەرەباڵغی ئەم پیشانەوە. ئەم پیشە شازە پڕبووانە پارێزەری، ڕۆژنامەوانی، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و سینەمان.

٣- لەپیشەگەلێک کە مەجالی مەعاشیان کەمە خۆتان بپارێزن. بۆ نموونە فرۆشتنی خزمەتگوزاری بیمە. ساڵانە هەزاران کەس کە بێکار دەبن خێرا ڕوو دەکەنە فرۆشتنی بیمەی تەمەن بێ ئەوەی بیربکەنەوە چ داهاتوویەک چاوەڕێیانە. فرانکلین بەتگرد کە خۆی ساڵانێک پێشڕەوی فرۆشتنی بیمەی تەمەن بوو دەڵێ ٩٠٪ی ئەو کەسانە دێنە ناو ئەم پیشەوە ئەوەندە بێزار دەبن کە لەپاش یەک ساڵ بەجێی دەهێڵن. لەبەینی ١٠٪ە کەیشدا یەک کەس بەئەندازەی ٩٠٪ی تەواوی بیمەکانی ئەو کەسانە دەفرۆشێت و تەنیا ١٠٪ موشتەرییەکانیان بۆ دەمێنێتەوە. واتە لەچوونە ناو ئەم کارە ئەگەری شکست هێنانتان ٩٩٪ە. کەواتە هەوڵ بدەن مەچنە ناو کارگەلێک کە ئەگەری پەیداکردنی دەرماڵەی باشی تیا نیە.

٤- چەند حەفتەو لەحاڵەتی پێویستدا چەند مانگ کات تەرخان بکەن هەتا زانیاری تەواو دەربارەی پیشەیەک بەدەست بێنن. چۆن؟ بەقسەکردن لەگەڵ کەسانێک کە لەو پیشەدا بوون. ئەم قسانە لەوانەیە کاریگەری گەورەی لەسەر داهاتووی ئێوە هەبێت. ئەم شتە لەڕووی ئەزموونی خۆمەوە ئەڵێم. کاتێک نزیک بیست ساڵ تەمەنم بوو لە دوو کەس گەورەتر لە خۆم ڕاوێژی پیشەییم وەرگرت. ئێستا کە سەیری ڕابردوو ئەکەم دەبینم ئەو دوو قسەکردنە خاڵی وەرچەرخانی پیشەیی من بوون. ئەگەر ڕاستتان دەوێت تەنانەت ناتوانن بیهێنمە بەرچاوم کە بێ ئەو دووجار قسەکردنە ژیانم و داهاتووم دەکەونە چ وەزعێکەوە.

چۆن دەتوانین ئەم ڕاوێژو پەندە پیشەییانە وەربگرین؟ وەرن بیهێننە بەرچاومان کە ئێوە ئەتانەوێ لەبەشی تەلار سازیدا بخوێنن. لەپاش بڕیاری کۆتایی دەبێ قسە لەگەڵ تەلار سازانی شارەکەدا بکەم. دەتوانن ژمارەکەیان لەدەفتەری ژمارەی

شارەکەتانەوە بەدەست بێنن. دەتوانن بچنە نووسینگەکانیان و وادەی دیداریان لەگەڵ دابنێن. ئەگەر بینیتان ئەوان سەرقاڵن و ناتوانن کاتی دیدارتان لەگەڵ دابنێن، دەتوانن ئەم پسیارانەیان بۆ بنووسن هەتا بەشێوەی نامە وەڵام بدەنەوە:

١- ئەگەر دیسان لەدایك ببینەوە دیسان تەلار سازی هەڵدەبژێرن؟

٢- ئایا ئەم پیشەیە پڕ بووە؟

٣- ئەگەر بەشی تەلار سازی بخوێنم ئایا دەتوانم لەپاش (٤) ساڵ خوێندن کار پەیدا بکەم؟ سەرەتا دەبێ چ جۆرە پیشەیەکم هەبێت؟

٤- چاکەکان و عەیبەکانی ئەم پیشەیە چییە؟

٥- ئەگەر منداڵی تۆ بومایە ئایا پێت ئەوتم ببمە تەلار ساز؟

ئەگەر دەترسن بەتەنها بچنە ناو ئەم کارانە دەتوانن سوود دوو لە ڕەوشی ژێرەوە وەربگرن:

یەکەم: گەنجێکی هاوتەمەنی خۆتان لەگەڵدا بێت تاکو بتوانن بڕوا بە خۆبوونی یەکتر بەهێز بکەن. ئەگەر هاوتەمەنتان نیە دەتوانن داوا لەباوکتان بکەن لەگەڵتان بێت.

دووەم: لەبیرتان بێت کاتێك داوای ئامۆژگاری لەکەسێك دەکەن، بەجۆرێك ئافەرینی ئەوتان کردووە. ئەو لەو داوایەی ئێوە شاد دەبێت. بزانن کە گەورەترەکان حەز دەکەن ئامۆژگاری گەنجترەکان بکەن. ئەگەر ناتانەوێت نامە بنووسن و وادەی دیدار بگرن، بچن بۆ نووسینگەکەی و داوای دیدار بکەن.

ئەگەر بچن بۆ لای (٥) تەلار سازو کاتیان نەبێت، بچن بۆ لای (٥)ی تر. سەرەنجام کەسێك پەیدا دەبێ ڕاوێژی بەنرختان پێشکەش بکات. لەبیرتان بێت ئەمە گەورەترین بڕیاری ژیانتانە، کەواتە کات و تاقەتی باش بگرنە خۆ هەتا لەدواییدا پەشیمان نەبنەوە.

٥- ئەم باوەڕە هەڵەیە کە ئێوە تەنها بۆ یەك کار دروست کراون، ئەم بیرۆکەیە بنێنە لاوە. هەر مرۆڤێکی ئاسایی لەچەند پیشەیەکدا سەرکەوتوو دەبێت و لەچەند

رانەیەکی تردا شکست دێنێ. بۆ نموونە من خۆم پێموایە ئەگەر لەم بەشانەی خوارەوەدا کارم بکردایە یان بمخوێندایە سەرکەوتو دەبووم. ئەم کارانە بریتین لە: کشتو کاڵ، پەروەردەکردنی میوەجات، کشتوکاڵی، پیشە سازی، پزیشکی، فرۆشیاری، پڕوپاگەندە، پیاچوونەوەی دەق، مامۆستایی و فڕۆکەوانی، دەیشزانم ئەگەر حیساباتو دارایی، ئەندازیاری، بەڕێوەبردنی کارگە، تەلارسازیو کاری پەیوەندیدار بەئامێرم هەڵبژاردایە ڕازی نەدەبووم.

بابەتی یەکەم

## ٧٠٪ی هەموو نیگەرانیەکانی ئێمە.......

ئەگەر دەمزانی چۆن دەکرێ هەموو کێشە داراییەکان چارەسەر بکرێت، بێگومان ئێستا نووسەر نەدەبووم بەڵکو لەکۆشکی سپی لەپەنای سەرۆك کۆماردا دانیشتبووم. بەڵام یەك کار هەیە کە دەتوانم ئەنجامی بدەم. سەرچاوەی بڕواپێکراو و ئامۆژگاری گەلێکتان پێشکەش بکەم کەیارمەتیدەربن و کتێب گەلێکتان پێ بناسێنم کە زانیاری زیاترتان بدەنێ. بەپێی ڕاپرسی گۆڤاری لیدیزهۆم ٧٠٪ تەواوی نیگەرانیو دڵتەنگیەکانی ئێمە پێوەندی بەپارەوە هەیە. جۆرج گالۆپ لەڕێکخراوی ئاماری گالۆپ دەڵێت ئەم لێکۆڵینەوەیە دەریخستووە ئەوە ڕاستە کە زۆربەی خەڵك بڕوایان وایە ئەگەر داهاتیان تەنیا ١٠٪ زیاد بکات هیچ گرفتێکی داراییان نابێت. لەهەندێك حاڵەتدا ئەم شتەوایە بەڵام لەزۆربەیدا بەو شێوەیە نیە. بۆ نموونە کاتێك خەریك بووم ئەم بەشەم دەنووسی دیدارم لەگەڵ پسپۆڕێکی سەرمایە گوزاریدا کرد. خاتوو ئەلەکسی ئێستاپلتۆن کە چەند ساڵە وەکو ڕاوێژکاری دارایی کاردەکات، چەند ساڵێکیش وەکو ڕاوێژکاری تایبەت کاری کردووە هەتا ئەو کەسانەی دوچاری نیگەرانی داراین، یارمەتی بدات. ئەو لەگەڵ هەموو چینەکاندا کاری کردووە. لەحەممالەوە هەتا بەڕێوەبەر.

ئەو وتی: ((پارەی زیاتر ڕێگەچارەی نیگەرانیە داراییەکانی خەڵك نیە. چەندەها جار بینیومە. زیاد بوونی داهات تەنیا ئاکامی زیاد بوونی خەرجی لێکەوتووەتەوەو بەدوایدا گرفتی تر. کێشەی سەرەکی خەڵك نەبوونی پارەی لەئەندازە بەدەر نیە، بەڵکو ئەوان نازانن ئەو پارەی هەیانە چۆن خەرجی بکەن)). لەوانەیە زۆربەی خوێنەران بڵێن: ((خۆزگە ئەم دیل کارنگیە ناچار دەبوو پارەی بەرگەو پسووڵەکانم

بداتو بەم دەرماڵەی منەوە دەربەرێت. ئەو کاتە ڕای دەگۆڕا)). باشە منیش کێشەی مادەم هەبووە. دەورانێك ناچاربووم ڕۆژی دەکاتژمێر لەکێڵگەی گەنمەشامیو عەمباری عەلەف کار بکەمو ئەوەندە ماندوو دەبووم کەئاواتی گەورەم ئەوە بوو لەئێشو ئازاری جەستەیی کە تەنیا بەهۆی کاری سەختی جەستەییەوە بوو، ڕزگارم بێت. بۆ ئەو هەموو کارەسەختە بۆ هەرکاتژمێرێك تەنیا(٥) سەنتم وەردەگرت. دەزانم ژیان لەخانووی بێ ئاو و حەمام مانای چیە. دەزانم خەوتن لەژوورێکدا کە پلەی گەرمای لەژێر سفرەوەیە مانای چیە. دەزانم ئەوەی چەندەها میل بەپێ بڕۆی هەتا (١٠ یان ١٥) سەنت لەکرێ ئۆتۆمبێلدا بگێڕیتەوە مانای چیە. دەزانم کە پارەی ئوتووت نەبێو جلەکانت لەژێر دۆشەکەکەتدا دانێی مانای چیە.

بەڵام تەنانەت لەو حاڵەتەشدا زۆربەی کات دەمتوانی چەند سەنتێك لەداهاتەکەم پاشەکەوت بکەم. هەرلەبەر ئەم ئەزموونە دەزانم ئەگەر کەسێك بیەوێت دوچاری قەرز نەبێتو ژانە سەری دارایی نەبێت، دەبێ وەکو کۆمپانیایەك کار بکات. دەبێ بەرنامەی بۆ خەرج کردن هەبێت. ئەڵبەت زۆربەی ئێمە ئەم کارە ناکەین. زۆربەی ئێمە کاتێك دەرماڵە وەردەگرین ئاگامان لێ نیە کە زۆربەی خەرجیە نەگۆڕەکانی وەکو پارەی غازو کارەباو تەلەفۆن دەبێ لەوە بدەینو شتانێك دەکڕین کەسەری مانگ تووشی کێشەمان دەکات. بەڵام ئەگەر کۆمپانیایەك بەم شێوەیە کار بکات خێرا شکست دێنێت. ئەمەتان لەبیر بێت کاتێك باسی پارەیە دەبێ وەکو حیسابدارێك کار بکەن. ئێستا بنەماکانی بەڕێوەبردنی دارایی چیە؟ چۆن دەبێ بودجەو بەرنامەی خەرج دارێژن؟ سەرنج بدەنە ئەم یانزە یاسایە:

### یاسای یەکەم: زانیارییەکان لەسەر کاغەزێك بنووسن.

کاتێك ئارنۆڵد بێنێت پەنجا ساڵ لەمەوبەر لەلەندەن دەستی کرد بەنووسینی ڕۆمان زۆر دەستەنگ بوو. هەر بۆیە خەرجی هەرپەنابایەکی دەنووسیو دەیزانی پارەکەی چۆن خەرج دەبێ. ئەم شتە ئەوەندە بەلای ئەوەوە خۆش بوو کەتەنانەت کاتێك دەوڵەمەند بوو دیسان درێژەی بەم کارەداو خشتەی خەرجەکانی دەنووسی. جان ڕاکفلێریش دەفتەرێکی حیساباتی هەبوو، هەموو شەوێك لەپێش دۆعا و نووستندا کوتومت تادوایین دۆلاری سەرمایەی خۆی دەزانی.

من و ئێوەیش دەبێ ئەم کارە دەست پێبکەین و خەرجەکانمان بەوردی بنووسین. لەپاش چەند مانگ کە ئەم کارەمان ئەنجامدا بەوردی خەرجەکانی خۆمان دەناسین و دەتوانین بودجەیەکی گونجاو بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکەین.

## یاسای دووەم: بودجەیەکی تایبەتتان هەبێت کە بەڕاستی لەگەڵ پێویستیەکانتاندا گونجاو بێت.

خاتوو ئیستا پلتۆن بڕوای وایە دوو بنەماڵە کەدیوار بەدیواری یەکەوەن، خانووەکانیان کوت ومت وەکو یەك وایە، داهاتیان یەکسانە و ژمارەی ئەندامەکانیشیان یەکسانە، دیسان پێویستیان بەبودجەی تەواو جیاواز هەیە. بۆچی؟ چونکە ئینسانەکان جیاوازن. بودجە دەبێ بەپێی داوابێت و تایبەت بەمرۆڤەکان.
دانانی بودجە بەمانای لەبەرچاونەگرتنی هەموو چێژەکانی ژیان نیە. بەڵکو بەمانای دۆزینەوەی ئاسایشی داراییە کە لەجێی خۆیدا پەیوەستە بەئاسایشی هەست و ڕزگاربوون لەنیگەرانی. کەسانێك کە لەگەڵ بودجەدا دەژین کەسانێکی شادترن.

شێوەی کار بەمجۆرەیە: دەبێ هەرواکەوترا خەرجەکان بنووسن. پاشان دەبێ بەشوێن وەرگرتنی شێوەکاری تایبەتەوەبن. دەتوانن نامە بۆ دیپارتمانمانی کشتوکاڵی ئەمریکا لەواشینگتۆن بنووسن و چەند دەفتەرێك لەوانە دەست بخەن. زۆربەی بانکەکانی شارەگەورەکان ڕاوێژکاری داراییان هەیە کە بێ گومان ئامادەن سەبارەت بەکاروباری دارایی ڕاوێژتان لەگەڵ بکەن. لەو شارانەی ژمارەی لەسەروو بیست هەزار کەسەوەیە دەستەی تەندروستی خێزانی هەن کە بەخۆڕایی ئێوە لەدروست کردنی بودجە و چارەسەری کێشەی داراییدا یارمەتی ئەدەن. ئەم دەستانە بەگشتی لەکتێبی زانیاری شاردا لەژێر ناوی ((خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی))دا ناویان دەبرێت. یەکێك لەباشترینی ئەو کتێبانەی لەم بارەوە بڵاو دەکرێتەوە ((بەڕێوەبردنی دارایی خێزانە))ە و لەسەر دەستی کۆمپانیای هاوس هۆڵد فاینەنس پێشکەش دەکرێت. ئەم کۆمپانیایە کتێب گەلێك دەربارەی بودجە دانانی سەرەتایی بۆ کرێ خانوو، خۆراك، جل وبەرگ، تەندروستی، شت ومەك و شتانێکی لەم بابەتە بەرهەم دێنێت.

پرسیارم لەخاتوو ئیستاپلتۆن کرد ئەگەر لەشارێکی بچووکدا بژیایە بۆ وەرگرتنی ڕاوێژی شارەزایانە بۆ بودجە دانان چی دەکرد؟ وەلامی دایەوە: ((نامەم دەنووسی بۆ گەورەترین ڕۆژنامەیەك کە لەناوچەی مندا بلاو دەبووەوەو پرسیارم لێدەکردن لەکوێوە دەتوانم خزمەتگوزاری ئاوا وەرگرم و ئەگەر پێویست بوایە یەك ڕۆژی تەواوم بۆ وەرگرتنی ئەو ڕاوێژانە تەرخان دەکرد)).

## یاسای سێهەم: فێربن دروست خەرج بکەن.

واتە بزانین کە دەبێ باشترین شت لەبەرامبەری پارەکەتاندا وەربگرن. تەواوی کۆمپانیا گەورەکان بەرپرسی شت کڕینیان هەیە کەتەنیا کاریان پەیدا کردنی باشترین شتەکانە بۆ بودجەی کۆمپانیا. ئێوەیش دەتوانن هەر ئەم کارە بۆ خۆتان بکەن. سەرنج بدەنە ئەم دووخاڵە:

١- ڕاگەیاندراوە حوکمەتیەکان دەربارەی پێشنیارەکان بۆ کڕیاران دەست بخەن.

٢- کتێبی ((سوود وەرگرتنی باشتر لەپارەکەتان)) کەبایی یەك دۆلارو نیوەو لەنووسینی سیدنی مارگۆلیۆسە لەپەخشی دابل دی بکڕن. ئەم کتێبە (١٢٨) لاپەڕەییە یەکێکە لەباشترین ڕێنماکانی شت کڕین کە تائێستا بینیومە.

## یاسای چوارەم: ژانە سەرەکانتان بە زیادبوونی داهات زیاد مەکەن.

خاتوو ئیستا پلتۆن دەڵێ دەربارەی ڕاوێژکردن بۆ دانانی بودجەی خێزان گەلێك کەداهاتی ساڵانەیان (٥٠٠٠) دۆلارە، هەمیشە دوچاری نیگەرانی دەبێت، چونکە ((ئەم داهاتی ساڵانەیە بۆ زۆربەی خێزانە ئەمریکاییەکان وەك ئامانج دەژمێردرێت. ئەوان لەوانەیە چەندەها ساڵ بەشێوەی عاقلانە خەرج کەن، بەلام کاتێك داهاتیان گەیشتە (٥٠٠٠) دۆلار پێیان وایە دەورانی زەحمەت بەسەر هاتووەو دەست دەکەن بەئەبلەیی. خانوویەك لەدەوروبەری شار دەکڕن، ئوتومبیلێك و دنیایەك شتی تازەو جل وبەرگ دەکڕن و لەماوەیەکی کورتدا قەرزاری بانك دەبن و بەنیسبەتی ڕابردووەوە شادییان کەمترە چونکە زیاتر لەداهاتەکەیان خەرج دەکەن و داهات و خەرجەکانیان نامیزانە)).

زۆر ئاساییە.ئێمە هەمووومان دەمانەوێت چێژی زیاتر لەژیان وەربگرین. بەڵام کام ڕێگەیە لەدرێژماوەدا ڕەزامەندی زیاترمان بۆ دێنێت؟ هەبوونی بودجەیەکی مەعقول یان هەبوونی پەیامی ئاگادارکردنەوەی بانك و داواکار؟

**یاسای پێنجەم: کارتی بەشداریکردنی سەرمایەیەگوزاریی بکرن هەتا بتوانن لەحاڵەتی پێویستدا وەکو قەرز لێی هەڵبکرن.**

ئەگەر دووچاری حاڵەتێکی تایبەت بوون و بینیتان ڕێگەیەکتان لەقەرزکردن زیاتر نیە، بیمە نامەو بەرگی سەرمایە گوزاری وەکو پارەی دانراو وان. بەم حاڵەوە دڵنیابن کە بێمە نامەکەی ئێوە وەکو پاشەکەوت وایە هەتا لەحاڵەتی پێویستدا بەقەرز هەڵیگرن. جۆرەکانی دیاریکراوی بیمەکان کە پێیان دەگوترێت بیمەی ماوەدار، تەنیا بۆ ئاگاداری لەئێوە لەماوەیەکی دیاریکراودان و حاڵەتی پاشەکەوتیان نیە. ئەم بیمە نامانە هیچ سوودێکی بۆ ئێوە کە دەتانەوێ بەهۆی ئەوانەوە ئیستا ئەگەر بیمەنامەیان بەرگەی سەرمایە گوزاریتان نەبن تا بتوانن بەهۆیەوە عەقار وەربگرن، دەتوانن ئەم کارە بەئۆتۆمبێل، خانوو یان هەرشتێکی تر ئەنجام بدەن. لەکوێ عەقار وەربگرن؟ لەبانکەکان. بانکەکان بەهۆی لایەنی کۆمەڵایەتی خۆیان، بەشێوەی گشتی عادڵانە کاردەکەن. تەنانەت جاری وایە بانکەکان ئامادە دەبن سەبارەت بە کێشەی دارایی لەگەڵ ئێوەدا دانیشن و ڕێگە چارەی گونجاوتان بۆ ڕزگار بوون لەکێشەی داراییان پێ پێشنیار بکەن. دیسان دەیڵێمەوە ئەگەر دەتانەوێت شتێك وەکو متمانە دابنێن تەنیا بچن بۆ بانك.

ئەگەر هیچ شتێك بۆ زەمانەت گرنتی نەبوو، تەنیا سیقەی دەرماڵەکەتان هەبوو چی بکەن؟ ئەو کاتە ئەم هۆشدارە بەجیدی بزانن. مەچن بۆ هیچ دامەزراوێکی قەرز دەر کە لەلایەن دەوڵەتەوە مۆڵەتی نەبێت. بەڵام ئەو دەزگایانەی مۆڵەتی حوکمییان هەیە کۆمەکحاڵی نەخۆشان و کەسانێکن کەپێویستیان بە عەقاری خێرا هەیە. ئەم دەزگایانە بەگشتی پابەندی ئەخلاقن. ئەگەر چی بەنیسبەتی بانکەکانەوە سوودی زیاتر وەردەگرنەوە؟ ئەڵبەت باشترین ڕێگە ئەوەیە کە داوا لەبەر پرسانی بانك بکەن یەکێك لەو ڕێکخراوانە کە خاوەن ئینسافن پێتان بناسێنن.

**یاسای شەشەم: لەبەرامبەری نەخۆشی، ئاگر کەوتنەوەو خەرجی چاوەڕوان نەکراودا خۆتان بیمە بکەن.**

بیمە گەلێك هەن بەپارەی کەمو زۆر کەمەوە بۆ تەواوی ڕووداوە ناخۆشەکان. ئەلبەت مەبەستم ئەوەنیە خۆتان بۆ هەڵخلیسکان لەحەمامو سوورێژە بیمە بکەن، بەڵام دەڵێم خۆتان لەبەرامبەری ئەو ڕووداوو بەڵایانەی دەزانن لەحاڵەتی ڕوودانیدا ئێوە دوچاری کێشەی دارایی دەکەنو بەدوایدا نیگەرانیەکانتان زیاد دەکەن،بیمە بکەن.

بۆ نموونە ژنێك دەناسم کە ساڵی پێشوو دە ڕۆژ لەنەخۆشخانە خەوتبوو، لەکاتی هاتنە دەرەوەیدا خەرجی ئەو تەنیا (٨) دۆلار بوو. بۆچی! چونکە بیمە دەرمانکردنی هەبوو.

**یاسای حەوتەم: ڕێگە مەدەن دەسکەوتەکانی بیمەی تەمەنتان بەشێوەی پارەی کامڵ بدرێ بە هاوسەری دوای خۆتان.**

ئەگەر لەبەر ئەوەی داهاتووی خێزانەکەتان دابین بکەن، خۆتان بیمەی تەمەن دەکەن، ڕێگە مەدەن لەپاش مەرگتان هاوسەرەکەتان پارەکەی بەیەکەوە بەتەواوی وەربگرێت.بۆچی؟ بەهۆکاری کەی لەخاتوو ماریۆن ئەبرەلی بیستین. ئەوی بەرپرسی دەزگای بیمەی تەمەن، بەشی ژنانە ئەو داستانی بێوەژنێکی دەکرد کە بیست هەزار دۆلار حەقی بیمەی وەرگرتو تەواوی دابەکورەکەی هەتا سەرمایەگوزاری لەپێداویستی لاوەکی ئۆتۆمبێلدا بکات. بەڵام ئەم سەرمایە گوزارییە ئەنجامەکەی بووە شکستو ئەو بێوەژنە لەهەژاریدا ژیان بەسەر دەبات. یان بێوەژنێك کە کەوتە داوی دەلاڵێکی زەویو بەشێکی زۆری پارەی بیمەکەی لەسەر عەرزەیەك سەرمایە گوزاری کرد کە قەرار بوو لەماوەی یەك ساڵدا دووئەوەندە گران بێت. بەڵام لەپاش سێ ساڵ عەرزەکانی بەیەك لەسەر سێی پارەکەی خۆی فرۆشتەوە. یان بێوەژنێك کە (١٥) هەزار دۆلار حەقی بیمەی وەرگرت، بەڵام هەمووی لەدەست داو ناچاربوو منداڵەکانی بسپێرێت بە هەتیوخانەو هەزاران بەڵای لەم چەشنە.

سیلڤیاپۆرتر سەرنووسەری نیۆیۆرك پۆست دەنووسێت: ((بەشێوەی مامناوەندی تەمەنی (٢٥٠٠٠) دۆلار لەدەستی ژنێکدا کەمتر لە(٧) ساڵە)).

چەند ساڵ لەمەوبەر لەوتاری سەرنووسەری ((ساتردەی ئیوەنینگ پۆست))دا نووسرابوو:

((ئەو بێوەژنانەی پەروەردەی تەواویان نەبینیوەو بەئاسانی پارەی بیمەی هاوسەرەکانیان وەردەگرن، زۆر ئاسان فێڵیان لێدەکرێت. هەر پارێزەر یان فەرمانبەرێکی بانك دەتوانێت هەزاران حاڵەت بە نموونە بێنێتەوە کە تیایدا تەواوی پاشەکەوتی کابرایەکی لێزان بەدەستی بێوەژنەکەی یان منداڵەکەی بەتەواوی دەفەوتێتو دەچێتە گیرفانی کەسانێکی دەستبڕو ساختەچی. ئەگەر دەتانەوێت بێوەژن یان منداڵەکانتان پشتیوانی بکەنو دابینیان بکەن باشتروایە گوێ لەم ئامۆژگارییەی جی. پی.مۆرگان، یەکێك لەزاناترین سەرمایەگوزارانی جیهان بگرن. ئەو سەرمایەی خۆی دابە (١٦) میراتبەری خۆی کە دوانزەیان ژن بوون. ئایا ئەو پارەی دانراوی زۆری دابەو ژنانە؟ نا، ئەو دەرماڵەی هەتاهەتایی مانگانەی بۆ بڕینەوە.

## یاسای هەشتەم: فێری منداڵەکانتان بکەن لەبەرامبەری پارەدا هەست بەلێپرسراوی زیاتر بکەن.

جارێك لەگۆڤاری ((یۆرلایف))دا بابەتێکم خوێندەوە کە هەرگیز فەرامۆشی ناکەم. نووسەرەکەی خاتوو ((ستێلا ویستۆن تاتل)) شێوە فێرکردنی هەستی بەرپرسیارەتی بۆ پارەی فێری کچەکەی دەکرد. ئەو دەستە چەکێکی زیادەی بۆ کچەکەی لەبانك وەرگرتبوو، کاتێك کچە (٩) ساڵەکەی پارەی گیرفانی وەردەگرت، وەکو بانك لەلای دایکی دایدەناو کاتێك پارەی دەویست چەکێکی ڕادەکێشاو بەمجۆرە دەیتوانی حیسابی داراییەکانی هەڵگرێت. ئەم کارە نەك هەر بۆ کچەکەی خۆش بوو، بەڵکو لێپرسراوی دارایی ڕاستەقینەی فێری ئەو دەکرد.

شێوازێکی نموونەیە. ئەگەر ئێوەیش منداڵێکتان هەبێت کە گەیشتووەتە خوێندنی دواناوەندیو ئەتانەوێت فێری پارە خەرج کردنی بکەن ئەم کتێبەی بۆ پەیدا بکەن کە بەدەستی سەندیکای پەروەردەیی نەتەوەیی بەچاپ گەیشتووە: ((بەڕێوەبردنی دارایی کەسایەتی)). ئەم کتێبە (١٣٣) لاپەڕەییە فێری مێر منداڵان دەکات چۆن بودجە بۆ خەرجەکانی خۆیان دانێن.



 

**یاسای نۆهەم: ئەگەر ژنی ماڵەوەن دەتوانن پارە لەچێشت لێنان پەیدا بکەن.**

ئەگەر لەپاش دانانی بودجە بینیتان دیسان دەرامەتو خەرجتان یەك ناگرێتەوە دەتوانن یەكێك لەم دووكارە بكەن: تووڕەبن، ڕووگرژكەن، بۆڵەبۆڵو گلەیی بكەن، یان بەرنامە داڕێژن هەتا كەمێك پارە بەدەست بێنن؟ چۆن؟ دەتوانن سوود لەڕەوشی خاتو نێلی سپیر وەربگرن. ئەو لەپاش مەرگی هاوسەرەكەی بە تەنیا لەخانوویەكی سێ ژووری نوستندا دەژیا. منداڵەكانیشی هاوسەرگیرییان كردبوو. ڕۆژێك خەریكبوو ئایسكریمی دەخوارد، بۆی دەركەوت كەبینی ئایسكرێم فرۆشەكە كێكی ماڵیی زۆر ناشرینی دەفرۆشت. ئەو پرسیاری لە فرۆشیارەكە كرد ئایا ئامادەیە كێكی ماڵیی چاك لەو بكڕێتو فرۆشیارەكە داوای دوو كێكی لێكرد. (من لەتەمەنمدا چەند جار زیاتر كێكم دروست نەكردبوو، هەر بۆیە داوام لەژنی دراوسێكەم كرد كێكی سێوم فێر بكات. موشتەرییەكانی كابرا كێكە سێوو لیمۆكانی منیان پێ خۆشبوو، بەرەبەرە داواكاری زۆر بوو، تا ئەو شوێنەی ساڵانە ٥٠٠٠ كێكم دروست دەكردو تەواوی ئەم كارانەم لەچێشتخانە بچوكەكەمدا ئەنجام دەداو بێ ئەوەی لەخەرجی مەوادە پێكهێنەرەكەی خەرجێكی ترم هەبێت، ساڵانە ١٠٠٠ دۆلارم دەست دەكەوت).

داواكاریی كێكەكانی ئەو ئەوەندە زۆر بوو كە ناچاربوو دوكانێكی بچوك بگرێتو دوو وەستای شیرینیش دامەزرێنێ. (هەرگیز ئەوەندە لەژیاندا شاد نەبووم چونكە ئەم كارە وەكو سەرگەرمییەك وابوو بۆم. ڕۆڵی خۆم لەشادكردنی خەڵكدا ئەنجام دەدەمو ئەوەندە سەرقاڵم كە كاتم بۆ تەنیایی و نیگەرانی نییە. ئەم كارە جێی خاڵیی هاوسەرەكەم، منداڵەكانمو دایكمی پڕ كردوەتەوە). خاتو ئۆرا سنایدەریش داستانێكی هاوشێوەی هەیە، ئەو لەشاری ٣٠ هەزار كەسی مەیوود دەژیاو كارەكەی بە مەوادی پێكهێنەر بەنرخی ١٠ سەنتەوە لەچێشتخانەكەی دەست پێكرد. هاوسەرەكەی نەخۆش بوو، ئەو دەبوایە پارەی پەیدابكردایە بەڵام چۆن؟ ئەزموونێكی هەبوو، نە پسپۆڕییەكی هەبوو، نە سەرمایەیەك. ژنێكی سادەی ماڵەوە بوو. ئەو سپینەی هێلكەو شەكری كرد بە چكلێتو لەنزیكی خوێندنگەیەك یەك دانەی بە یەك پەنی دەفرۆشت بەو قوتابیانەی دەڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە. لەهەفتەی یەكەمدا ئەو نەك هەر ٤ دۆلارو ١٥ سەنتی خێر كرد، بەڵكو شەوقێكی نوێی لە ژیانیدا پەیداكرد. ئەو

هەم خۆی و هەم منداڵەکانی بەم چکلێتانە شادمان دەکرد. ئەم ژنە خانەدانە بڕیاریدا کارەکەی پەرەپێبدات و کەسێك پەیدا بکات هەتا چکلێتەکانی ئەو لەشیکاگۆ بفرۆشێت. ئەو بە ترس و لەرزەوە چوو بۆ لای ئیتالییاییەك کە لەسەر جادەکان فستەقی دەفرۆشت. ئەو شانی هەڵتەکاند چونکە مشترییەکانی فستەقیان دەویست نەك چکلێت. بەڵام کاتێك دانەیەك لەچکلێتەکانی خوارد ڕای گۆڕا و هەر ئەو ڕۆژە دوو دۆلارو ١٥ سنت کە فرۆشتنی چکلێتەکان دەست خاتوو سنایدەر کەوت. چوار ساڵ دوای ئەوە ئەو یەکەم دوکانی خۆی کردەوە. شەوانە چکلێتەکانی دەکوڵاندو بە ڕۆژدا دەیفرۆشت. ئەو ئێستا ١٧دوکانی هەیە کە ١٥ دانەیان لەشوێنی قەرەباڵغی لوپ شیکاگۆیە.

ئەو شتەی دەمویست بیڵێم ئەوەیە کە ئەم کەسانە لەجیاتی ئەوەی نیگەران بن و دەستەوستان بوەستن کارێکی باشیان ئەنجامداو کەمترین خەرجیان کرد، بێ ئەوەی بەرپرس، کرێ یان پڕوپاگەندەیەك لەکاردا بێت.

سەیری دەوروو پشتی خۆتان بکەن. کاری زۆر هەیە کە دەکرێ ئەنجام بدرێت. بۆ نموونە ئەگەر چێشلێنەری چاکن دەتوانن وانەی چێشت لێنان بۆ کچانی گەنج دانێن و شوێنی وانەکەیشتان خانووەکەی خۆتان بێت. کتێبی زۆر دەربارەی پارە پەیداکردن لەکاتی بەتاڵیدا نوسراوە. بەڵام یەك شت هەیە کە دەبێت سەرنجی بدەنێ، ئەگەر توانای دەروونیی فرۆشتنی ماڵ بەماڵتان نییە هەرگیز مەیکەن، چونکە بەخێرایی شکست دەخۆن.



## یاسای دەیەم: هەرگیز قومار مەکەن:

هەمیشە لەبینینی کەسانێك کە دەیانەوێ بە مەرج کردن لەسەر ئەسپ یان ئامێری یاری لەناو گازینۆو بارەکاندا دەوڵەمەند بن سەرم سوڕدەمێنێت. یەك کەس دەناسم کە خاوەنی چەند دانە لەم ئامێرانەیە. ئەو لەکەسانێك کە ئەوەندە ساویلکەن کە پێیان وایە دەتوانن ئامێرێك کە بەرنامەی بۆ دارێژراوە فێڵ بکات، بەرنەوە بێزارە. کەسانی بێ مێشك ساڵانە ٦ملیۆن دۆلار لەسەر ئەسپەکان مەرج دادەنێن. ئەو وتی ئەگەر دوژمنی هەبێت باشترین ڕێگەی لەناوبردنی ئەو ئەوەیە کە ئەو بخەنە ناو یاری قومارەوە.

ئەگەر دەتانەوێت قومار بکەن، لانی کەم زیرەك بن. حیساب بکەن کە یاسای ئەگەرەکان لەدژی ئێوەیە چەند لەچەندە. چۆن؟ بەخوێندنی کتێبێ بەناوی (هەڵسەنگاندنی ئەگەرەکان) لەنوسینی ئۆسوالد یاکوبی. ئەو پسپۆڕێکی ماتماتیکی بەناوبانگ، پسپۆری ئامارو خاوەن بۆچونە لەیاری کارتدا. ئەم کتێبە ٢١٥ لاپەڕەییە بە ئێوە دەڵێت ئەگەری سەرکەوتن لەقومارە جۆراوجۆرەکاندا چەندەیە. هەروەها دەربارەی چالاکییەکانی تریش زانیاری بەسوود پێشکەش دەکات. بەخوێندنەوەی ئەم ئەگەرو ئامارانە لەم کتێبەدا داخ بۆ حاڵی کەسانێك هەڵدەکێشن کە بە کەرێتی ژیانی خۆیان سپاردووە بەم شانس‌و ئەگەری کەمی سەرکەوتنانە. ئەگەر نەتان توانی ئەم کتێبە لەکتێب فرۆشییەکاندا پەیدا بکەن دەتوانن داوای بەرگێك لەخانەی بڵاوکردنەوەکەی، کۆپانیای دابڵ دی لەنیۆیۆرك بکەن. نرخی ئەم کتێبە دوو دۆلارو نیوە.

**یاسای یازدەهەم: ئەگەر ناتوانین وەزعی دارایی خۆمان باش بکەین لانی کەم خراپە لەگەڵ خۆمان نەکەین‌و دەست لەنەفرەت‌و بێزاری لەشتێك کە نەگۆڕە هەڵگرین.**

ئەگەر ناتوانین دۆخی داراییمان باشتر بکەین لەوانەیە بتوانین روانگەی خۆمان سەبارەت بەوە بگۆڕین. لەیادمان نەچێت کە هەمووان دڵ مەشغوڵی داراییان هەیە. لەوانەیە دڵ مەشغوڵی ئێمە لەبەر چاولێکەری بێت. دەبێت بزانین ئەو کەسانەی ئێمە چاویان لێدەکەین ئەوانیش لەوانەیە بۆ کەسانێکی تر هەر ئەو هەستەیان هەبێت.

هەندێ لەبەناوبانگترین کەسانی ئەمریکایش بەدرێژایی مێژوو، کێشەی داراییان هەبووە. بۆ نموونە هەم لینکۆڵن‌و هەم واشینگتۆن، بۆ چوون بۆ شوێنی ڕێ‌و ڕەسمی پێدانی حوکمی سەرۆك کۆماری ناچار بوون پارە قەرز بکەن. ئێمە ناتوانین هەرچی دەمانەوێ بەدەسنی بێنین، کەواتە باشتر وایە ژیانی خۆمان بەنیگەرانی‌و نەفرەت ئالودە نەکەین. وەرن لەگەڵ خۆماندا ڕوو خۆش بین‌و ئاقڵانەو فەلسەفی بیر بکەینەوە. بەپێی وتەی ئۆپیکتە توس (فەلسەفە لەزاتی خۆیدا دەڵێت: مرۆڤ دەبێت بەجۆرێك بژی کە بۆ ئەو شادی پەیوەندییەکی کەمی بەهۆکاری دەرەکییەوە هەبێت). سنیکایش دەڵێت: (ئەگەر ئەو شتەی هەتانە بەکیفایەتی نازانن، تەنانەت ئەگەر دنیاش هی ئێوە

بێت بەختەوەر نابن). لەبیرمان بێت تەنانەت ئەگەر دنیاش هی ئێمە بێت دیسان تەنیا سێ ژەم نان دەخۆین و لەیەك جێگەدا دەخەوین. تەنانەت قەبرهەڵکەنێکیش ئەم کارە دەکات. تەنانەت لەوانەیە خەوو خواردنی لەجان ڕاکفلێریش زیاتر بێت.

بۆ کەم کردنەوەی دڵەڕاوکێی دارایی ئەم (١١) یاسایە بگرنە بەر:

١- تەواوی زانیارییەکان لەسەر کاغەز بنووسن.

٢- بودجەی تایبەت بەخۆتان هەبێت کە لەگەڵ پێویستیەکانتاندا بگونجێت.

٣- فێری چۆن پارە خەرج کردن بن.

٤- ئاگاداربن کاتێك داهاتتان زیاد دەبێت ژانەسەرەکانیشتان زیاد نەبێت.

٥- کارتی سەرمایەگوزاری بکرن هەتا لەکاتی پێویستدا قەرزیان پێ وەرگرن.

٦- خۆتان لەبەرامبەری نەخۆشی، ئاگر کەوتنەوەو خەرجی چاوەڕوان نەکراودا بیمە بکەن.

٧- ڕێگە مەدەن حەقی بیمەی تەمەنتان کوت وپرو پێکەوە بدرێت بەهاوسەرەکەتان.

٨- منداڵەکانتان فێربکەن بۆ پارەش هەست بەلێپرسراوێتی بکەن.

٩- ئەگەر ژنی ماڵەوەن بەچێشت لێنان پارەیەك بەدەست بێنن.

١٠- هەرگیز قومار مەکەن.

١١- ئەگەر ناتوانین وەزعی دارایی خۆمان باشترکەین لانی کەم لەگەڵ خۆماندا خراپە نەکەین و دەست لەنەفرەت و بێزراوی لەو شتەی نەگۆڕە، هەڵگرین.

باشترین کتێبێك تا ئێستا بۆ چارەسەرکردنی کێشە داراییەکان نووسراوە ((چۆن بەدەرماڵەکەمانەوە ژیان بەڕێ بکەین)). کە بەدەستی جی-کی-لاسەر پسپۆری باجی دەرماڵەو سیلویا پۆرتر پسپۆری بەشی ئابووری نیویۆرك پۆست نووسراوە. نرخی ئەم کتێبە یەك دۆلارەو دەتوانن لەخانەی سیمۆن و شۆستەر لەنیویۆرك، ڕاکفلێر سەنتەر، ژمارەی (٢٠) بەدەستی بێنن. ئەگەر ڕازی نەبوون تایەك حەفتەی تر دەتوانن کتێبەکە بگەڕێننەوەو پارەکەتان وەربگرنەوە. کتێبێکی نموونەیە. ئەگەر ئاڵۆزی داراییتان هەیە پێشنیارتان پێ دەکەم ئەم کتێبە بخوێننەوە.

# (٣٢) داستانی ڕاستەقینە
## سێ کێشەی گەورە پێکەوە ڕووی تێکردم

نووسینی: سی، ئای، بلەك ڤود

هاوینی (١٩٤٣) وا دەهاتە بەرچاوم نیوەی نیگەرانیەکانی لەسەر شانی منە. چل ساڵ ژیانێکی ئاسایی و ئاسوودەم هەبوو، تەنیا ئەو کێشانەم هەبوو کە هەر هاوسەر، باوك یان بازرگانێك دەیبێت. بەشێوەی گشتی بەئاسانی ڕووبەڕووی ئەم کێشانە دەبوومەوە هەتا کوتوپڕ زرم! زرم!! زرم!!! زرم!!!! زرم!!!!! زرم!!!!!! شەش گرفتی گەورە پێکەوە بەسەرمدا هات. تەواو شەو لەناو جێگەدا ئەملاولام دەکرد و دەسوڕام و لەو ڕۆژەی لەڕێدا بوو دەترسام، چونکە دەبوایە بەرەو ڕووی ئەم شەش نیگەرانیە ببوومایەتەوە:

١- ئەو کۆلیجەی کارملێدەکرد لەسەر لێواری بەلای دارایی بوو چونکە کوڕەکان دەچوون بۆ شەڕو تەواوی کچانیش بەکارکردن لەناوچە شەڕەکان بەبێ پەروەردە لەخوێندکاران کە لەفەرمانگە بازرگانیەکاندا کاریان دەکرد، داهاتیان زۆرتر بوو.

٢- کوڕەگەورەکەم سەرباز بوو، منیش وەکو هەموو ئەو دایك و باوکانەی کوڕەکان دوور لەئێمە لەشەڕ بوون، نیگەران بووم.

٣- شاری ئۆکلاهاما پارچە زەوییەکی گەورەی بۆ فڕۆکەخانە داگیر کردبوو، خانووەکەی من کە لەباوکمەوە گەیشتبوو بە من دروست لەناوەڕاستی ئەم زەوییەدا بوو. دەمزانی تەنیا ١٠٪ی پارەکەی خۆیم پێ ئەدەن و خراپتر لەوە ئەوە بوو کە خانووەکەم لەدەست دەبووەوە و بەهۆی کەم بوونی خانووەوە نیگەرانی ئەوە بووم ئایا دەتوانم سەرپانەیەك بۆ خێزانە شەش کەسیەکەم پەیدا بکەم. دەترسام ناچاربین لەچادردا بژین. تەنانەت نیگەرانی ئەوە بووم نەتوانم چادرێکییش بکرم.

٤- بیرەکەمان وشکی کرد چونکە لەنزیکمانەوە چاڵێك بۆ بەتاڵ کردنی چاڵی زێراب لێدرابوو. هەڵکەندنی بیرێکی تر تەنیا فڕێدانی (٥٠٠) دۆلاری تر بوو چونکە

زەوییەکەمان لێ داگیردەکرا. دوومانگ ناچاربووم لەسەتڵدا ئاو بێنم و دەترسام ناچاربم تاکۆتایی شەڕ ئەم کارە بکەم.

٥- لەشوێنی کارەکەمەوە ١٠میل دوور بووم و کارتێکی کاعەزی پلە B م هەبوو. ئەمە واتە نەمدەتوانی تایەی نوێ بکڕم، کەواتە نیگەران بووم ئەگەر تایە شڕەکانی فۆردەکۆنەکەم پەنچەر ببونایە چۆن دەگەیشتمە شوێنی کارەکەم.

٦- کچە گەورەکەم یەك ساڵ پێش وەخت لەدواناوەندی تەواو ببوو، بەدڵ حەزی ئەکرد بچێت بۆ زانکۆ، بەڵام من پارەم نەبوو بینێرم. دەمزانی دڵی دەشکێت.

ڕۆژێك دوانیوەڕۆ لەژووری کارەکەم دانیشتبووم و خەفەتم بۆ کێشەکانم دەخوارد. بڕیارمدا لەسەر کاغەز بیاننووسم چونکە وادیاربوو کەس بەئەندازەی من کێشەی نەبوو.هیچ گوێم بەوەنادا لەگەڵ کێشەگەلێك کەتووشم دەبن شەڕبکەم، بەڵام ئەمانە وادیاربوو تەواو لەدەسەڵاتی من بەدەربوون. نەمتوانی هیچ کارێك بۆ چارەسەرکردنیان بکەم. کەواتە ئەم خشتە تایپ کراوەم هەڵگرت و هەروا کە مانگەکان ڕادەبووردن هەر لەبیریشم چووبووەوە کە ئەمانەم نووسیوە. هەژدەمانگ دوای ئەوە لەکاتی ئەملاولاکردنی فایلەکانمدا هەر لەخۆوە ئەم خشتەی شەش کێشەیەم بینی کە ڕۆژێك تەندروستی منیان دەخستە مەترسیەوە. بەحەزەوە خوێندمەوە. ئێستا دەبینم کەتەنانەت یەکێکیشیان ڕووی نەدا.

بزانن چی هاتەپێشەوە:

١- بینیم تەواوی نیگەرانیەکانم بۆ داخرانی کۆلیجی کارەکەم عەبەس بووە، چونکە حوکمەت دەستی کرد بەپارەدان بەخوێندنگەکان لەبەر پەروەردەکردنی سەربازانی پێشوو بۆیە کۆلێجەکە خێرا پڕبوو.

٢- بینیم نیگەرانیەکانم سەبارەت بەکوڕەکەم بێهوودە بوو،ئەو بەساغ و سەلامەتی لەشەڕ گەڕایەوە.

٣- بینیم تەواوی نیگەرانیەکانم دەربارەی داگیرکردنی زەوییەکەم لەبەر فرۆکەخانە بێهوودە بوو، چونکە لەیەك میل لەکێڵگەکەی منەوە زەخیرەیەکی نەوتی دۆزرایەوە و ڕاگرتنی زەوییەکە بۆ فرۆکەخانە زۆر گران بوو.

٤- بینیم تەواوی نیگەرانیەکانم بەهۆی ئاوەوە بێ هوودە بوو، چونکە لەگەڵ ئەوەی زانیم زەوییەکە لێمان ناسەنرێت پارەی پێویستم بۆ هەڵکەندنی بیرێکی نوێ خەرج کردو بیرێکی قووڵترم لێداو سەرچاوەی ئاوێکی یەکجار زۆرم پەیدا کرد.

٥- بینیم نیگەرانیەکانم سەبارەت بە پەنچەربوونی تایەی ئۆتۆمبێلەکەم بێهودە بووە، چونکە بە ڕووکەشی تازەو لێخوڕین بە پارێزەوە تایەکان ڕزگاریان بوو.

٦- بینیم نیگەرانیەکانم دەربارەی خوێندنی کچەکەیشم بێهودە بوو چونکە دروست (٦٠) ڕۆژ لەپێش کرانەوەی زانکۆدا وەکو موعجیزە کارێکی حیسابات لەدەرەوەی کۆلیجم پێ پێشنیار کراو ئەم کارە ئەو بوارەی پێدام لەکاتی خۆیدا ئەو بنێرم بۆ زانکۆ.

زۆر جار دەمبیست کە دەڵێن٩٩٪ی ئەو شتانەی نیگەرانیانین و خەفەتیان لێدەخۆین هەرگیز ڕوونادات، بەڵام ئەم وتەیە تاکاتێك چاوم بەوخشتەی نیگەرانیانەم نەکەوت کە (١٨) مانگ لەوەپێش تایپم کردبوو، بێ مانابوو بەلامەوە. ئێستا شوکری خودا دەکەم کە ناچار ببووم بێهودە زۆرانبازی لەگەڵ ئەو شەش نیگەرانیە ترسێنەرەدا بکەم. ئەو تەجرەبە دەرسێکی فێری من کرد کە هەرگیز فەرامۆشی ناکەم. تراژیدیاو بێ عەقڵی خەفەت خواردن لەوشتەی هێشتا ڕووینەداوە پیشانی منیدا.

لەبیرتان بێت ئەمڕۆ بایەنیەکە کەدوێنێ نیگەرانی بوون. پرسیار لەخۆتان بکەن: لەکوێوە دەزانم ئەو شتەی ئێستا بۆی نیگەرانم ڕوونەدات؟

## من دەتوانم لەماوەی یەك کاتژمێردا بگۆڕێم بۆ گەشبینێکی کامڵ

**نووسینی: ڕاجێر دابلیو بەیسۆن**

کاتێك خۆم بەهۆی وەزعی ئێستامەوە خەمۆك دەبینم دەتوانم لەماوەی یەك کاتژمێردا نیگەرانی لەخۆم دوور بخەمەوەو خۆم بکەم بەکەسێکی گەشبین کە هاواردەکات.

بزانن چۆن ئەم کارە دەکەم: دەچمە ناو کتێبخانەوە، چاوم دەنووقێنم و بەرەو ئەو ڕەفانە دەچم کە کتێبە مێژووییەکان لەوێیە. کاتێك هێشتا چاوم نووقاوە بەدوای کتێبێکدا دەگەڕێم لەحاڵێکدا نازانم ئایا ((گرتنی مەکسیکۆی))ی پرسکات هەڵدەگرم یان ((ژیانی دوانزە سیزار))ی سۆتۆنیۆس. بەچاوی داخراوەوە هەر لەخۆوە کتێبێك دەکەمەوە. ئەوکاتە چاوم دەکەمەوەو یەك کاتژمێر دەخوێنمەوەو هەرچی زیاتر دەخوێنمەوە تێدەگەم کە دنیا لەگەرمەی ئازارو ڕەنجدابووەو شارستانیەت لەکەنارەوە لەرزۆك بووە. لاپەڕەکانی مێژوو سەرانسەر هاواری خەمناکی شەڕ، وشکە ساڵی، هەژاری، نەخۆشی کوشندەو هەڵسوکەوتی نامرۆیی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ بووە. لەپاش

خوێندنەوەی مێژوو بۆ ماوەی یەک کاتژمێر دەبینم وەزعی ئێستا هەر چەندەیش خراپ بێت زۆر زیاتر لەوەی لەڕابردوودا بووە باشتربووە. ئەم بابەتە وزەم پێ دەبەخشێت کە کێشەکانی ئێستام بەچاوێکی عاقڵانەوە ببینم و بزانم دنیا بەگشتی بەرەو باش بوون چووە.

ئەمە ڕەوشێکە کە دەتوانین لەبەشێکی تەواودا شی بکەینەوە. مێژوو بخوێننەوە. هەوڵ بدەن ڕوانگەیەک لەدەهەزار ساڵ وەرگرن، ئەوکاتە بۆتان دەردەکەوێت کێشەکانی ئێوە لەچاو ئەوانە چەندە وردو بچووکە.

## چۆن لەهەستی خۆ بەکەم زانین ڕزگاربم

نووسینی: ئێلمێر تۆماس

کاتێک (١٥) ساڵان بووم هەمیشە لەنیگەرانی و ترس و شەرمنیدا لەڕەنج و ئەشکەنجەدابووم. بەنیسبەتی تەمەنەوە بەرتربوو وەکو شمشاڵێک کزوباریک بووم. (٦پێ و ٢ئینج) بالام بوو بەڵام تەنیا (١١٨) کیلۆ کێشم بوو. بەپێچەوانەی بالامەوە کزبووم و هەرگیز نەمدەتوانی لەکێبڕکێ و بەیسباڵدا ڕکەبەری کوڕەکانی هاوپۆلم بم. ئەوان گاڵتەیان پێدەکردم و بەمنیان دەوت: ((دەسکە تەور)). ئەوەندە نیگەران بووم کە لەدیدار لەگەڵ خەڵک دەترسام و زۆر کەم ئەم کارەم دەکرد، چونکە خانووە کێڵگەییەکەی ئێمە لەجادەوە دووربوو، بەدرەختی ئەستوور دەوری گیرابوو. من نیو ماڵ دوور لەجادەی سێ ساید دەژیام و ڕێکەوتبوو من بێجگە لەدایک و باوک و خوشکەکانم کەسم نەبینیبوو.

ئەگەر ڕێگەم بدایە ئەو ترس و نیگەرانیانە هەروا من ئازار بدەن تەواوی ژیانم دەبووە دۆڕانێکی گەورە. هەموو دەقەو سەعاتێک لەبیری باڵای درێژو کزو لاوازمدا بووم. بەسەختی دەمتوانی بیر لەشتی تر بکەمەوە. شەرمنی من و ترس و نیگەرانی لەمندا ئەوەندە زۆر بوو کە بەسەختی دەتوانم بیهێنمە سەرزمان. دایکم دەیزانی چ هەستێکم هەیە. ئەو مامۆستای قوتابخانە بوو، بەمنی دەوت: ((کوڕم تۆ دەبێ بخوێنی و ژیانت بە مێشکت هەڵسووڕێنی، چونکە جەستەی تۆ هەمیشە ڕێگر دەبێت)). بەهۆی ئەوەی دایک و باوکم ناتوانن بمنێرن بۆ زانکۆ دەمزانی خۆم دەبێ بەرێی خۆمدا بڕۆم. کەواتە یەک زستان بانگ بانگ، سمۆرە، ئۆپاسم و ڕسقم ڕاوکردو



 

لەبەهاردا پێستەکەیانم فرۆشت بە(٤) دۆلارو بەو چوار دۆلارە دوو بەرازی بچووکم کڕی. سەرەتا بەزێراب و پاشان بەگەنمەشامی لەوەڕاندمن و پاییزی دوایی فرۆشتمن بە(٤٠) دۆلار. لەو پارەیەی لەبەرازەکان دەستم کەوتبوو چووم بۆ زانکۆیەکی ئاسایی ناوەندی لەدانویل ئیندیا. حەفتەی یەك دۆلارو چل سەنت بۆ خوێندن و پەنجا سەنتم ئەدا بۆ ژوورەکەم.

کراسێکی قاوەییم لەبەردەکرد کەدایکم بۆی دوریبووم (بێ گومان ئەو ڕەنگی قاوەیی هەڵدەبژارد چونکە چرچ و پیسی پیایدا دیار نەبوو). دەستێك جلم لەبەردەکرد کەهی باوکم بوو. نەجلەکانی بۆ من دەبوو، نەپێڵاوی ملپێچراوی سەرخڕ کە ئەملاو لاکەی شریتی کەژی پێوە بوو کە لەکاتی لەپێ کردندا دەکێشرا. بەڵام دەمێکە بوو کەژەکانی لەناو چبوو، ملەکەی ئەوەندە شل ببوو کە لەکاتی ڕێ ڕۆیشتنندا بەقاچمەوە نەدەوەستاو دەهاتە دەرەوە. لەهاتووچۆ لەگەڵ خوێندکارەکانی تردا شەرمم دەکرد، بۆیە بەتەنیا لەژوورەکەم دادەنیشتم و دەرسم دەخوێند. گەورەترین ئاواتم ئەوە بوو دەستێك جل لەفرۆشگا بکڕم. جلێك کە بەقەد خۆم بن و شەرمەزارنەبم. کەمێك لەدوای ئەوە چوارشت ڕوویدا کە یارمەتی منیدا بەسەر نیگەرانی و خۆ بەکەم زانینمدا زاڵ بم. یەکێك لەو ڕووداوانە هیواو دلێری و بڕوا بەخۆبوونی بە من بەخشیی و باقی ژیانمی بەتەواوی گۆڕی. بەکورتی ئەم ڕووداوانە دەگێڕمەوە:

**یەکەم**: لەپاش تەنیا یەك حەفتە بەشداری لەم خوێندنگە ئایاییە تاقیکردنەوەیەکم داو بڕوانامەیەکی دەرەجە سێم بۆ مامۆستایی لەقوتابخانە حوکمیەکان وەرگرت. ئەم بڕوانامەیە تەنیا بۆ شەش مانگ باش بوو، بەڵام کەمێك پیشانیدام کەسێك متمانەی بەمن هەیە. یەکەم بڕوانامەی متمانەکردن کە تائەو کاتە لەدایکم زیاتر لەکەسم وەرنەگرتبوو.

**دووەم**: لیژنەی قوتابخانەی دێهاتێك بەناوی ((هەپی هالۆ)) منی بەڕۆژی دوو دۆلار یان چل دۆلار لەمانگێکدا دامەزراند. ئەمیش یەکێکی تر لەبڕوانامەکانی متمانە بەمن بوو.

**سێهەم**: لەگەڵ وەرگرتنی یەکەم دەرماڵەم چەند دەست جلم لەفرۆشتگا کڕی کە ئیتر جێی شەرم نەبوو. ئەگەر ئێستا کەسێك یەك ملیۆن دۆلار بدات بەمن تەنانەت

بەئەندازەی نیوەی ئەو جلانەی تەنیا بەچەند دۆلار کڕیبووم، من پڕشەوق و شاد ناکات.

**چوارەم**: خاڵی وەرچەرخانی ڕاستەقینەی ژیانی من، یەکەم سەرکەوتنی من لەشەڕ لەگەڵ خۆبەکەم زانین و شەرمنی لەپێشانگای پۆتنام کانتی ڕویدا کە هەموو ساڵێك لە ((بین بریج ئیندیانا)) بەرپا دەبوو. دایکم منی ناچار کرد لەکێبەرکێیەکی وتاربێژی کە لەپێشانگا بەرپا دەبوو، بەشداری بکەم. بۆ خودی من فیکرە کە زۆر دوور لەباوەڕبوو. من شەهامەتی قسەکردن لەگەڵ یەك کەسیشم نەبوو، چ جای ناو کۆمەڵ. بەڵام بڕوای دایکم بەمن کەم و زۆر پڕخەم و جێی داخ بوو. ئەو خەیاڵی گەورەی بۆ داهاتووی من لەمێشکدا بوو. ئەو ژیانی خۆی لەژیانی کوڕەکەیدا ئەبینی. متمانەی ئەو منی بۆ بەشداری کردن لەکێبەرکێکەدا هاندا. بابەتی وتارەکەمم دوایین شتێك کە دەتوانم قسەی لەسەربکەم هەڵبژارد: ((هونەرە جوانەکان و زانستی مرۆیی ئەمریکا)). ڕاستیەکەی کاتێك دەمویست وتارەکەم ئامادەبکەم تەنانەت نەمدەزانی زانستی مرۆیی چیە، بەلاّم زۆر گرنگ نەبوو، چونکە بیسەرەکانیش نەیاندەزانی. دەقە پڕ لەساختەکارییەکەم لەبەرکرد و سەدان جار لەگەڵ درەخت و مانگەکان باسم کرد. ئەوەندە لەبەر دایکم پڕ شەوقی بەڕێوەبردنی وتارەکە بووم کە لەوانەیە زۆر پڕ هەست قسەم کردبێت. بەهەر حاڵ خەڵاتی یەکەمم وەرگرت. لەم ڕووداوە تێرامام. ئافەرینێکی زۆر لەلایەن جەماوەرەوە. هەر ئەو کوڕانەی ڕۆژێك گاڵتەیان پێ دەکردم و پێیان دەووتم ((دەسکە تەور))، ئێستا دەستیان دەخستە سەرشانم و دەیانوت: ((دەمزانی سەردەکەویت ئێلمێر)). دایکم منی لەباوەش گرت و دەستی کرد بەگریان. ئێستا کەسێری ڕابردوو دەکەم دەبینم بردنەوەی ئەو کێبەرکێی وتاربێژییە خاڵی وەرچەرخانی ژیانی من بوو. ڕۆژنامە ناوچەییەکان وتارێکیان دەربارەی من لەلاپەڕەی یەکەمدا چاپکرد و داهاتوویەکی گەشیان بۆ من پێشبینی دەکرد. بردنەوە لەم کێبەرکێیەدا منی لەلای گەڕەکەکە ناودارکرد و کەسایەتی بەمن بەخشی و گرنگتر لەوە ئەوە بوو کە بڕوا بەخوابوونی منی سەد ئەوەندە زیاد کرد. ئێستا تێدەگەم ئەگەر ئەو کێبەرکێیەم نەبردایەتەوە پێدەچێت هەرگیز نەبوومایەتە ئەندامی سەنای ئەمریکا، چونکە ئەوە چاوی منی کردەوە، ئاسۆی بەرامبەری بەرینتر کرد و بووە هۆی ئەوەی تێبگەم توانای زۆرم هەیە کە هەرگیز بیریشم نەدەکردەوە. لەهەمووی گرنگتر ئەوە بوو

که خەڵاتی یەکەم لە کێبەرکێی وتاربێژیدا پارەی یەک ساڵ لەزانکۆ ئاساییەکەی من بوو.

ئێستا تینووی دەرس خوێندن بووم. کەواتە لەماوەی نێوان (١٨٩٦هەتا ١٩٠٠) کاتم لەبەینی خوێندن وکاردا دابەش کرد. بۆ ئەوەی پارەی خوێندنەکەم لەزانکۆی داپۆ پەیدا بکەم بوومە شاگردی چێشتخانە ئاگاداری لەکورە بکەم، سەوزەگیا ڕێك بکەمو کتێبداری بکەم. لە هاویندا لەکێڵگەی گەنمەشامی و گەنم کارم دەکردو لەکاتی جادە دروست کردندا وردە بەردم دەڕشت.

لەساڵی (١٨٩٦)دا کاتێك تەنیا تەمەنم (١٩) ساڵ بوو (٢٨) وتاربێژیم کردو خەڵکم بۆ دەنگدان بە ویلیام جەنینگەز براین بۆ سەرۆك کۆماری هاندا. ئەو شەوقەی لەوتاربێژی بۆ برایان لەمندا دروست بوو منی هاندا خۆم بچمە ناو سیاسەتەوە. کەواتە کاتێك چوومە زانکۆی داپۆ یاساو بەیانی گشتیم تەواو کرد. لەساڵی (١٨٩٩) وەکو نوێنەری زانکۆی باتلەر لەوتاربێژییەکدا کە لەئینندیانا بۆ لیس بەرپا ببوو وتارێکم لەژێر ناوی ((بڕیار لەسەر ئەوەیە سیناتۆرەکانی ئەمریکا دەبێ بە دەنگی خەڵك هەڵبژێردرێن)) خوێندنەوە. لەکێبەرکێی وتاربێژی تریشدا بەشداریم کردو بردمەوە. بوومە سەرنووسەری ساڵنامەی زانکۆی (١٩٠٠)، میراژو ڕۆژنامەی زانکۆی پۆلاریۆم.

لەپاش وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لەداپۆ بەقسەی هۆراس گریلیم کردو تەنیا نەچووم بۆ ڕۆژئاوا. چووم بۆ باشووری ڕۆژئاوا، بۆ وڵاتێکی تازە، ئۆکلاهاما. کاتێك کە ئاپا چی ئیندیانو کێوواو کۆمانچی هەبوو، داوای پارچە زەوییەکی کشتوکاڵیم کردو نووسینگەیەکی پارێزەریم لەلۆتۆن ئوکلاهاما کردەوە. لەسینای ئوکلاهاما(٢٣) ساڵو لەخانووی کۆنگرە(٤) ساڵ خزمەتم کردو لەپەنجا ساڵیدا گەورەترین مەقامی ژیانم وەرگرت. لەئۆکلاهاماوە بۆ سینای ئەمریکا هەڵبژێردرام. لە(٤مارچی ١٩٢٧)ەوە لەو مەقامەدا خزمەتم کردووە. لەکاتێکەوە کە هەرێمی ئیندیان لە (١٦نۆڤەمبەری ١٩٠٧)دا بووە ویلایەتی ئۆکلاهاما، بەردەوام لەلایەن دیموکراتەکانەوە هاندراوم سەرەتا بۆ سینای ویلایەت، پاشان بۆ کۆنگرەو دوای ئەوە بۆ سینای ئەمریکا.

ئەم داستانە بۆ خۆفش كردنەوە بەسەركەوتنەكانمەوە ناگێڕمەوە، چونكە لەوانەیە بەلای هەركەسێكەوە خۆش نەبێت. ئەمەم تەنیا بەو هیوایەوە وت كە چاو نەترسیو بڕوا بەخۆبوون بدەم بەو كوڕەی ئێستا لەتاو نیگەرانی، دڵەڕاوكێ، شەرمو هەستی خۆبەكەم زانین كە ژیانی منی شێواند كاتێك جلە كۆنی باوكمو پێڵاوی مل ئەستووری ئەوم لەبەردەكردوو لەكاتی ڕێ ڕۆیشتندا لەقاچم دادەكەوت، ڕەنج دەكێشێت.

نووسراوی سەرنووسەر: جێی سەرنجە بزانن ئێلمێر تۆماس كە ڕۆژێك شەرمی لەو جلە ناشرینانەی خۆی دەكرد، لەدواییدا وەكو جوانپۆش ترین ئەندامی سینای ئەمریكا هەڵبژێردرا.

## من لەباخی الله دەژیام

**نووسینی: ئار- وی- سی- بادلی**

ساڵی (١٩١٨) پشتم لەو دنیایە كرد كە دەمناسیو چووم بۆ باكووری ڕۆژئاوای ئەفریقیاو لەگەڵ عەرەبەكان لەباخی الله ژیام. حەوت ساڵ لەوێ ژیام. زمانی بیابان گەڕەكان فێربووم، وەكو ئەوان جلم پۆشی، خواردنی ئەوانم خواردو خۆم لەگەڵ شێوازی ژیانی ئەوان كە لەماوەی ئەم بیست سەدەی ئەخیرەدا گۆڕانی كەمی بەسەر هاتووە، گونجاند. بوومە خاوەنی ڕەوە مەڕو لەسەر عەرز لەچادری عەرەبەكاندا دەخەوتم. بەوردی لێكۆڵینەوەم لەسەر ئایینەكەیان دەكرد. لەڕاستیدا دوای ماوەیەك سەبارەت بە موحەمەد كتێبێكم نووسی. ئەو حەوت ساڵەی لەگەڵ ئەو شوانە كۆڵ بە كۆڵانە بووم، ئارام ترین ساڵەكانی ژیانم بوو.

خۆم ژیانێكی خۆشو پڕ بەسەرهاتم هەبوو. لەپاریس لەدایكو باوكێكی بەریتانی هاتمە دنیاوەو نۆ ساڵ لەفەڕەنسە ژیام. لەئیتۆن خوێندمو لەسەندهێرست چووم بۆ كۆلێژی ئەفسەری. لەپاش شەش ساڵ وەكو ئەفسەری سوپای بەریتانیا لەهیندستان بوومو لەوێ یاری چۆگانم دەكردو ڕاوم دەكردو لەكەناری خزمەتی سەربازیدا لەكوێستانی هیمالیا لێكۆڵینەوەم دەكرد. لەشەڕی جیهانیدا بەشداریم كردو لەكۆتاییەكەیدا وەكو ڕاوێژكارێكی سەربازی یارمەتیدەر ڕەوانەی كۆنفرانسی ئاشتی پاریس كرام. لەو شتەی لەوێ بینیم تێڕامامو بێ هیوا بووم. لەماوەی چوار ساڵ كوشتار لەجەبهەی ڕۆژئاوا بڕوام وابوو ئێمە لەبەر شارستانیەت شەڕدەكەین.



 

لەکۆنفرانسی ئاشتی پاریسدا بینیم سیاسەتوانانی لەخۆبایی زەمینە بۆ شەڕی جیهانی دووەم خۆش دەکەن. هەر ولاتێك هەرچی دەیتوانی بۆ خۆیی دادەناو شەڕو ڕقی ناو خۆییان دروست دەکردو پیلانی سیاسەتی شاراوەیان زیندوو دەکردەوە. ڕقم لەشەڕ، سوپاو کۆمەلگا دەخواردەوە. بۆ یەکەمجار لەژیانمدا شەوانی بێ خەویم چەشت و نیگەرانی ئەوە بووم دەبێ چی لەژیانم بکەم. ((لۆید جۆرج)) منی داوەت کرد بۆ ناو سیاسەت. دەمویست بە قسەی بکەم کەشتێکی سەیر ڕوویدا. ڕوداوێکی سەیر کە حەوت سالی داهاتووی ژیانمی دروست کرد. هەموو شتێك لەگفتوگۆیەکەوە دەستی پێکرد کە دووسەد چرکەی خایاند. وت و وێژێك لەگەل ((تێد لۆرێنس))، لۆرێنسی عەرەبستانی سعوودی، پڕ ڕەنگ ترین و ڕۆمانتیك ترین کەسایەتیەك کە لەپاش شەڕی یەکەمی جیهانی دەرکەوت. ئەو لەبیابان لەگەل عەرەبەکان دەژیاو پێشنیاری بە من کرد هەر ئەم کارە بکەم. سەرەتا سەیرو جێی سەر سوڕمان بوو.

بەهەر جۆرێك بێت بڕیارمدا واز لەسوپا بێنم و دەبوایە کارێکم بکردایە. کاربەدەستانی غەیری سەربازی کەسانێکی وەکو منیان دانەدەمەزراند. ئەفسەری پێشووی ئاسایی سوپا بەتایبەت کاتێك کە بازاڕ پڕ بوو لەملیۆنەها بێکار. کەواتە ئەو کارەم کرد کە لۆرێنس پێشنیاری کردبوو. چووم هەتا لەگەل عەرەبەکان بژیم. شادمانم کە ئەم کارەم کرد.ئەوان فێریان کردم چۆن بەسەر نیگەرانیدا زال ببم. وەکو تەواوی موسولمانان ئەوانیش جەبر گەرا بوون. بڕوایان وابوو هەر ووتەیەك ((موحومەد)) لەزاری دێتە دەرەوە، ئەوا لە قورئاندا نووسراوەو .

فەرموودەی ((خودا ـــ الله))یە .

کەواتە کاتێك قورئان دەفەرموێت : ((خودا ئێوەی خولقاندو ئەوشتەی ئەنجامی ئەدەن)) بە تەواوی قەبولیان دەکرد. هەر بەو هۆیەوە بوو کە هەمیشە ژیان بەسادەیی دەگرن و بۆ لەخۆڕا نیگەران بوون هیچ پەلە ناکەن. ئەوان دەزانن ئەو شتەی موقەدەر کراوە، موقەدەر کراوەو هیچ کەس لەخوا زیاتر ناتوانێت هیچ بگۆڕێت، بەهەر حال ئەمە بەو مانایە نایەت کە لە بەرامبەری بەلاکاندا دەستەو ئەژنۆ دادەنیشن و هیچ کارێك ناکەن.

بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە باباس لەتۆفانی سووتێنەرو توندی سیرۆکو بکەم کەکاتێك لەبیابان دەژیام تەجرەبەم کرد. سێ شەو و سێ ڕۆژ دەیلووراندو هاواری

دەکرد. ئەوەندە بەهێزبوو کە لمەکانی دەبرد بۆ سەدان میل لەو پەڕی دەریای ناوەڕاستو لەدۆڵی ڕۆنی فەڕەنسە بلاوی دەکردەوە. باکەی ئەوەندە گەرم بوو کە هەستم دەکرد قژم لەحاڵی سووتاندایە. گەرووم وشك دەبوو. گوێچکەکانم دەسووتانو بەینی ددانەکانم پڕ بوو لەخۆڵو وردە بەرد. هەستم دەکرد لەکارگەیەکی دروست کردنی شوشە بەرامبەر بەکورەکە وەستاوم. زۆری نەمابوو شێت ببم، بەلام عەرەبەکان هیچ گلەییەکیان نەبوو. ئەوان شانیان هەڵدەتەکاندو دەیانوت: ((مەکتووب!....)) واتە ((نووسراو)).

بەلام خێرا لەپاش تۆفان دەست بەکار دەبوون. ئەوان بەرخەکانیان دەکوشت چونکە دەیانزانی بەهەر حاڵ دەمرنو بەکوشتنی ئەوان هیوادار بوون مەڕی دایکەکەی نەجات بدەن. لەپاش کوشتنی بەرخەکان ڕەوەکەیان بەرەو باشوور بۆ لای ئاو دەبرد. تەواوی ئەم کارە بەئارامیو لەسەر خۆییو بێ گلەیی یان ناڵەو بۆڵە بۆڵ بەهۆی زیانەکەیانەوە ئەنجام ئەدرا. سەرۆك خێڵەکە دەیوت: ((زۆریش خراپ نیە. لەوانەبوو هەموو شتێك لەدەست بدەین، بەلام خوا شوکر ٤٠٪ی مەڕەکانمان ماون تا دیسان دەست پێ بکەینەوە)).

لەبیرمە جارێك بە ئۆتۆمبێل بە درێژایی بیابانەکەدا دەڕۆیشتن کە یەکێك لەتایەکان پەنچەر بوو. شۆفێرەکە لەبیری چووبوو تایە زیادەکەی چاك بکات. کەواتە بەبێ تایەوە لەوێ گیرمان کرد. من تووڕە بوومو بەگوڕو تینەوە پرسیارم لەعەرەبەکان کرد چی دەکەین؟ ئەوان بە منیان وت ئەم گوڕو تینە هیچ یارمەتیەك نادات و تەنیا مرۆڤ کەم و کورت دێنێت. ئەوان دەیانوت تایەی پەنچەر بوو خواستی خودا بوو، هیچی لەگەڵ نەدەکرا. کەواتە درێژەمان بە ڕێگەکەماندا و لەسەر تایە پەنچەرەکە ڕۆیشتین. بێ گومان ئۆتۆمبێلەکە پتەپتەی کردو وەستا و بەنزینمان پێ نەما. سەرۆك خێڵ تەنیا وتی ((مەکتوب!))و دیسان هەموویان لەجیاتی ئەوەی نەڕەنەڕ بەسەر شۆفێرەکە دابکەن بۆ نەهێنانی بەنزینی تەواو ، ئارام بوونو تاشوێنی مەبەست بەپێ ڕۆیشتینو گۆرانیمان وت. ئەو حەوت ساڵەی لەگەڵ عەرەبەکان بردمەسەر منی قەناعەت پێکرد کە نەخۆشانی دەروونی، شێتو کحول خۆرەکانی ئەمریکاو ئەورووپا هەمووی بەرهەمی ژیانی هەڵپە هەڵپو پڕ ژانە کە لەشارستانیەتە بەناوبانگەکەمان دەیکەین.



 

تـا کاتێـك لـەبیابان بـووم هـیچ نیگەرانیـەکم نـەبوو. لـەوێ،باخی اللـە، قەناعـەتی هێمنانەو تەندروستی جەستەیی کە زۆربەی ئێمە بەبێ هیوایی و گوشاری عەسەبییەوە بەدوایەوەین، بەدەستم هێنا. زۆربەی خەڵك گاڵتەیان بەجەبر گەرایی دەکرد. لەوانەیە حـەق بـەوان بێـت. کـێ دەزانێـت؟ بـەڵام هـەموومان دەبـێ بتـوانین ببینـین کـە چـۆن چارەنووس بۆمـان موقـەدەر بـووە. بـۆ نموونـە ئەگـەر مـن لـەو سـێ خولەکـەی ئـەو دوانیوەڕۆیـەی ئـەو ڕۆژەی ئاگۆسـتی (١٩١٩) قـسەم لەگـەڵ لۆرێنـسی عەرەبـستان نەکردایـە تـەواوی ئـەو سـاڵانەی لـەو کاتـەوە ڕابـووردوە، تـەواو جیـاواز دەبـوو. بەڕوانینێك بۆ ژیانم دەتوانم ببینم کە چۆن زەمان ئەوی بەڕووداوی بەدەر لەتواناو کـۆنترۆڵی مـن دروسـت کـردووە. عەرەبـەکان پێـی دەڵـێن ((چارەنووسـی مـەکتوب))، ((خواستی خودا)). هەرچی دەتانەوێ ناوی بنێن، کاری سەیر دەکات. ئەمڕۆ تـەنیا دەزانم لـەپاش حەڤدە ساڵ کـە بیابـانم بەجێهێـشتووە، هێـشتا لەبەرامبـەری وەزعـی ناچاریدا ڕەزامەندیو تەسلیم هەیەو ئەمە لەعەرەبەکانەوە فێربووم. ئەو فەلسەفەیە زیاتر لەدەواو دەرمانی ئێشبەر یارمەتی ئارامی مێشکی منی داوە.

ئێوەو من پیرەوی موحەممەد نین، هـەروەها نامانـەوێ جـەبر گـەرا بین، بـەڵام کاتێك بـای تونـدو سـوتێنەر بەسـەر ژیـانی ئێمـەدا دەلوورێنێـتو ئێمـە نـاتوانین ڕێگیری بین وەرن ئێمەیش ناچاریی قبووڵ کەینو پاشان خەریك بینو پاشماوەکان کۆبکەینەوە.

## پێنج ڕێگە کە بۆ بەرگرتن لەنیگەرانی بەکارم هێنا

**نووسینی: پرۆفیسۆر ویلیام لیۆن فیلیپس**

بـەختی ئـەوەم هـەبوو دوانیوەڕۆیـەك لەگـەڵ بیلـی فیلیـپس لـەپێش مەرگیـدا بگوزەرێنم. لەژێرەوە ئەو ڕەوشانەی ئەو بۆ بەرگرتن لەنیگەرانی بەکاری دەبرد بەپێی ئەو نووسینانەی من لەدیداریدا هەمبوو.

١- لـە(٢٤) ساڵیدا کوتوپڕ چاوانم لەکار کـەوتن. لـەپاش سـێ یـان چـوار خولەك خوێندنـەوە هەسـتم دەکـرد دەوری چـاوم پـڕە لـەدەرزیو تەنانـەت کـاتێکیش کتێبم نەدەخوێندەوە ئەوەندە هەستیار ببوون کە نەمەتوانی سـەیری پەنجـەرە بکـەم. لەگەڵ باشترین پزیشکانی چاوی نیوهیۆنو نیویۆرك ڕاوێژم کرد. هیچ شتێك یارمەتی نەدام.

لەپاش (٤)ی دوانیوەڕۆوە لەتاریکترین سووچی ژوورەکەمدا دادەنیشتمو چاوەڕوانی کاتی خەو دەبووم. ترسابووم. دەترسام ناچاربم پیشەی مامۆستایی بەجێ بێڵمو بچم بۆ ڕۆژئاواو دەست بکەم بە پیشەی داربڕینەوە. پاشان شتێکی سەیر ڕوویدا کە کاریگەری موعجیزە ئاسای مێشك لەسەر نەخۆشی جەستەیی پیشان ئەدات. کاتێك لەزستانێکی پڕ لەخەمدا چاوەکانم لەخراپترین وەزعدا بوون دەعوەتنامەیەك کە بۆ وتار خوێندنەوە بۆ دەستەیەك لەخوێندکارانی بەکالۆریۆس بۆم هاتبوو، قەبوولم کرد. چراکان ئەوەندە چاوانمیان ئازارئەدا کە کاتێك لەسەر سەکۆکە بووم ناچار بووم سەیری عەرز بکەم. بەم حاڵەوە لەماوەی وتارە سی خولەکیەکەدا هیچ هەستم بە ئێش نەکردو دەمتوانی ڕاستەوخۆ بەبێ چاوترووکاندن سەیری چراکان بکەم. پاشان کاتێك بەرنامەکە تەواو بوو چاوەکانم دیسان دەستیان کردەوە بەئازار.

ئەوکاتە بیرمکردەوە ئەگەر مێشکم بەتەواوی لەسەر شتێك کۆبکەمەوە، نەك بۆ نیو کاتژمێر، بەڵکو بۆ یەك حەفتە، لەوانەیە دەرمانبیم. چونکە بێگومان ئەمە جۆرێکهاندانی مێشك بوو کە بەسەر نەخۆشیەکی جەستەییدا زاڵ دەبوو. ئەجرەبەیەکی هاوشێوەم لەکاتی تێپەڕ بوون لەزەریاییش هەبوو. پشت ئێشەیەکی وەها سەختم گرت کەنەمتوانی بەڕێدا بڕۆم. کاتێك دەمویست ڕاست بوەستم ئێشی زۆرم لەحەممول دەکرد. هەر لەگەڵ ئەوەی دەستم کرد بەقسەکردن تەواوی دەردو ژانی لەشمم لەبیر کردو ڕاست وەستام. بەنەرمی دەجولامەوەو یەك کاتژمێریش قسەم کرد. لەپاش تەواو بوونی وتارەکە بەئاسانیّ چووم بۆ ژوورەکەم. بۆ چرکەیەك بیرم کردەوە چاك بوومەتەوە بەڵام ئەم دەرمانە کاتی بوو. پشت ئێشە دیسان دەستی پێکردەوە.

ئەم ئەزموونانە گرنگی یەکجار زۆری ڕوانگەی مێشکی مرۆڤ دەخاتە ڕوو. ئەمانە چێژی ژیانیان فێری من کرد. کەواتە ئێستا جۆرێك دەژیم دەڵێی هەموو ڕۆژێك یەکەم ڕۆژە کە بینیومەو دوایین ڕۆژێکە کە دەیبینم. من لەبەسەرهاتەکانی هەر ڕۆژێك پڕ شەوق دەبمو هیچ کەس لەم حاڵەتەدا هەر لەخۆوە نیگەران نابێت. من وەکو مامۆستایەك شەیدای کاری ڕۆژانەمم. کتێبێکم بەناوی ((شەوقی مامۆستا بوون)) نووسیوە. وانە وتنەوە هەمیشە بۆ من شتێکی زیاترە لە هونەرێك یان پیشەیەك. ئەشقێکە. هەر وەك نیگار کێشێك حەز دەکات کاری نیگار کێشی بکات یان گۆرانی

بێژێك كه دەیەوێت گۆرانی بڵێت؛ منیش پێم خۆشه وانه بڵێمەوە. پێش ئەوەی لەجێگە بێمە دەرەوە بیر لەچێژی شەوقی یەکەم دەستەی قوتابیەکانم دەکەمەوە. هەمیشە هەستم کردووە یەکێك لەگرنگترین هۆکارەکان بۆ سەرکەوتن لەژیاندا شەوقە.

٢- تێگەیشتووم کەدەتوانم بەخوێندنەوەی کتێبێکی سەرنج ڕاکێش نیگەرانی لە مێشکی خۆم دەرکەم. کاتێك تەمەنم ( ٥٩) ساڵ بوو نارەحەتیەکی عەسەبی درێژخایەن ئازاری ئەدام. لەماوەی ئەو دەورانەدا دەستم کرد بەخوێندنەوەی کتێبی (( ژیانی کارلیل )) لەنووسینی دیڤید ویلسۆن. ئەم کتێبە یارمەتی زۆریدام بۆ باش بوونم، چونکە ئەوەندە نوقمی خوێندنەوەی ببووم کە نیگەرانیەکانم فەرامۆش کرد.

٣- لە زەمانێکی تردا کاتێك یەکجار خەمۆك بووم خۆم ناچار کرد چالاکی جەستەییم هەبێت. هەموو بەیانیەك (٥یان ٦) دەست یاری تێنسم دەکرد، پاشان حەمامێکم دەکرد، نانی نیوەڕۆم دەخواردو دوانیوەڕۆیان (١٨) چاڵ یاری گۆڵفم دەکرد.شەوانی هەینی هەتا کاتژمێر یەکی شەو وەرزشم دەکرد. بڕوام وایە عارەق کردنەوە یارمەتیدەری چاکە. بۆم دەرکەوت نیگەرانی و خەمۆکی بەعارەقەوە لەلەشم دەچێتە دەرەوە.

٤- ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر فێر بووم کە لەترس و پەلە پەل و کاری ژێر گوشار دووری بکەم. هەمیشە هەوڵم ئەدا فەلسەفەی ویلبەر کراس بگرمە بەر. کاتێك فەرمانداری شاری کانکتیکۆس بوو بەمنی وت: ((جاری وایە کە کاری زۆرم هەیە بۆ ئەنجامدان ئارام دادەنیشم، پایپ دەکێشم و هیچ کارێك ئەنجام نادەم.

٥- هەروەها فێر بووم کە سەبرو زەمان ڕێگەیەکە بۆ چارەسەربوونی کێشەکان. کاتێك نیگەرانی شتێکم هەوڵ ئەدەم بەگەشبینی سەیری کێشەکانم بکەم. بەخۆم دەڵێم: ((دوو مانگی تر نیگەرانی ئەم شکستە خراپە نابم، کەواتە ئێستا بۆ نیگەران بم؟ بۆچی ئێستا هەر ئەو ڕوانگەیەم نەبێت کە دوو مانگی تر دەمبێت؟))

بەکورتی، لەژێرەوە پێنج ڕەوش نووسراوە کە پرۆفیسۆر فیلیپس بۆ بەرگرتن لەنیگەرانی ئەنجامیدا:

١- بەشەوقەوە ژیان بکەن: ((من هەر ڕۆژ بەجۆرێك دەژیم دەڵێی یەکەم ڕۆژێکە تا ئێستا بینیومەو دوایین ڕۆژێکیشە دەیبینم.

٢- کتێبێکی سەرنج ڕاکێش بخوێننەوە: ((کاتێك ناڕەحەتیەکی عەسەبی درێژ خایەنم هەبوو دەستم کرد بەخوێندنەوە....ژیانی کارلیلو ئەوەندە لەخوێندنەوەیدا نوقم بووم کە کێشەکانم فەرامۆش کرد)).

٣- یاری بکەن: ((کاتێك زۆر خەمۆك بووم خۆم ناچار کرد چالاکی جەستەیی بکەم)).

٤- کاتێك کار دەکەن ئارام بن: (( ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر فێر بووم خۆم لەهەڵپە هەڵپو نیگەرانی پەلە پەلو کاری ژێر فشار بەدوور بگرم)).

٥- هەوڵ ئەدەم بە گەشبینی سەیری کێشەکانم بکەم. بەخۆم دەڵێم: ((دوو مانگی تر نیگەرانی ئەم کێشەیە نابم ئەی ئێستا بۆ نیگەران بم؟ بۆچی ئێستا ڕوانگەی دوو مانگی ترم نەبێت؟)).

## دوێنێ وەستام، ئەمڕۆیش دەوەستم

نووسینی: دۆرۆتی دیکس

من لە ئەوپەڕی هەژاریو نەخۆشیدا بووم. کاتێك خەڵك پرسیاریان لێدەکردم چۆن ئەم کێشانەم پشت گوێ خستووە دەڵێم: ((دوێنێ وەستامو ئەمڕۆیش دەتوانم بوەستم ڕێگە بەخۆم نادەم بیر لەڕووداوێك بکەمەوە کە بەیانی لەوانەیە ڕوبدات)).

من خواستو هەوڵو نیگەرانیم ناسیوە.هەمیشە زیاتر لەتوانام کارم کردووە. کاتێك سەیری ژیانی ڕابردووم دەکەم وەکو مەیدانێکی شەڕ دەیبینم کە بەخەونی نەهاتەدیو هیوای بێ هیوا بوو لەگەڵ خەیاڵات پڕبووەتەوە. شەڕێك کە من هەمیشە ڕووبەڕووی بوومەتەوە، شەڕێك کەمنی ترساو و بریندارو ئاڵۆز کردووە لەبەرامبەری ڕۆژگاردا.

بەم حاڵەوە دڵم بۆ خۆم ناسوتێت، فرمێسك بۆ داخەکانی ڕابردوو نارێژم. ئیرەیی بەو ژنانە نابەم کە لەکاتی کێشەکانی مندا حەساوە بوون. چونکە من ژیانم کردووە، ئەوان تەنیابوونیان هەبووە. من پەیکی ژیانم تا کۆتایی نۆشیوەو ئەوان تەنیاکەفی سەرەکەیان چەشتووە. من شتانێك دەزانم کە ئەوان هەرگیز نایزانن. من شتانێك دەبینم کە ئەوان لەبەرامبەریدا کوێرن. تەنیا ژنانن کە چاوەکانیان بە فرمێسك شۆراوەو هەموان وەکو خوشکانی دنیا سەیری ئەو چاوانە دەکەن.من لەزانکۆ لێدانی

سەختی فەلسەفەیی فێربووم کە ئەو ژنانەی ژیانی ئاسوودەییان بووە هەرگیز فێری نابن. فێربووم کەهەموو ڕۆژێك بۆ ئەو ڕۆژە بژیمو بەترسان لەبەیانی کێشە بۆخۆم دروست نەکەم. تەنیا هەڕەشەی ناڕوونی وێنەیە کە منی ترسنۆك کردووە. من ئەم ترسە لەخۆمدا دەکوژم، چونکە تەجرەبە فێری منی کردووە کاتێك من زۆر دەترسم هێزو عەقلی ڕوو بەڕوو بوونەوە بە من ئەدرێت. گرفتە بچووکەکانی تر هێزی کاریگەرییان لەسەر من نیە. کاتێك دەبینن کۆشکی شادیتان لەبەرامبەری ئێوەدا دەڕووخێتو لەناو دەچێت، چیتر گرنگی نادەن خزمەتکار لەبیری دەچێ دەسماڵی سفرە بخاتە ژێر دەورییەکان یان شلەکە بڕێژێت.

فێر بووم چاوەڕوانی زۆرم لەخەڵك نەبێت کەواتە دەتوانم لەگەڵ دۆستێکدا کە زۆریش ڕاستەقینە نیە یان ئاشنایەك کە پاشەملە قسەم پێ دەڵێت، شادبم. لەهەمووی زیاتر فێری هەستی گاڵتە بووم چونکە زۆرشت هەبوو کە پێیان پێدەکەنیم یان دەگریامو کاتێك ژنێك بتوانێت بە کێشەکانی پێ بکەنێت چیتر هیچ شتێك ناتوانێت ئازاری بدات. لەبەر ئەو دەورانە سەختەی هەمبوو هەرگیز پەشیمان نیم چونکە بەهۆی بوونی ئەوانەوە ژیانم لەهەر ساتێکدا کە ژیام، هەست پێکردو ئەو نرخەی دەهێنا کەدام.

دوروتی دیکس لەژوورێکی بچکۆلەی ڕۆژانەدا بەسەر نیگەرانیدا زاڵ بوو.

## هیوام بە بینینی بەرەبەیان نەبوو

نووسینی: جی. سی. پەنی

لە (١٤)ی ئاپریلی ساڵی (١٩٠٢)دا گەنجێك بە (٥٠٠)دۆلار پارەوەو خەیاڵی یەك ملیۆن دۆلار سوودەوە فرۆشگایەکی لەشاری کەمەرۆ ویۆمینگ کردەوە. شارێکی کانزایی بچووك بە هەزار کەس دانیشتووەوە کە لەسەر ڕێگەیەکی کۆنی لەپەنای دەستەی نێردراوی لوییس و کلارکدا هەڵکەوتووە. ئەو پیاوە گەنجە لەگەڵ هاوسەرەکەی لەژوورێکی ژێر جەمەلۆندا لەسەر فرۆشگاکەی دەژیانو سوودیان لەسندووقێکی گەورەی شتو مەکی چنینو ڕستن وەکو مێزو چەند سندوقێکی بچووك وەکو کورسی وەردەگرت. ژنەکە بەتانیەکی لەمنداڵەکەی دەپێچاو لەژێر پێشخانەکەدا دەیخەواندو هەر لەوێ دەوەستاو یارمەتی هاوسەرەکەی ئەدا لە



 

بەڕێکردنی موشتەرییەکانیدا. ئەمڕۆ کە گەورەترین زنجیرەی فرۆشگاکانی ڕستن و چنین بەناوی ئەو پیاوە گەنجەوەیە. زیاتر لە (١٦٠٠) فرۆشگا لەفرۆشگاکانی جی سی پەنی لەئەمریکادا هەیە. لەم ماوەدا خواردنی ئێوارەم لەگەڵ بەڕێز پەنی خواردو ئەو پڕ شەوقترین ساتی ژیانی بۆ گێڕامەوە:

چەند ساڵ لەمەوبەرتاقەت پڕووکێن ترین ئەزموونی ژیانم پشت گوێخست سەرنا. بێ هیواو دڵشکاو بووم.ئەڵبەت نیگەرانیەکانی من هیچ پێوەندی بە کۆمپانیای جی. سی. پەنیەوە نەبوو. ئەو کارە بێ ژانە سەرو پڕ داهات بوو.بەڵام لەپێش دابەزینی ئابووری (١٩٢٩)دا چەند گرێبەستێکی ناعاقڵانەم واژۆ کردبوو. وەکو زۆر کەسی تر منیش بەهۆی هەڵو مەرجێك سەر زەنشت کرام کە هیچ بەرپرسیارەتییەکم بە نیسبەتیەوە لەئەستۆدا نەبوو. فشاری نیگەرانیەکان ئەوەندە زۆر بوو کە نەمتوانی بخەوم و دوچاری نەخۆشیەکی زۆر پڕ ئازار بووم بەناوی زۆنا. پەڵەی سوورو زیپکەی سەر پێست. لەگەڵ پزیشکێکدا ڕاوێژم کرد کە دەورانی لاوی لەگەڵ ئەو لەهەمیلتۆن میسۆری دەچووم بۆ قوتابخانە. دوکتۆر ئێلمێر ئەگلستۆن کە لەئاسایشگەی کلاگ لەتەبەل کریك میشیگان یاریدەدەری پزیشك بوو. دوکتۆر ئەگلستۆن منی خەواندو وتی زۆر نەخۆشم. دەورەیەکی دەرمانی زۆر سەختم بۆ دانرا، بەڵام هیچ سوودی نەبوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لاوازتر دەبووم. لەباری عەسەبی و جەستەییەوە زۆر تێك شکابووم و ئەوەندە بێ هیوا بووم کە هیچ ڕووناکیەکم نەدەبینی. هیچم نەبوو لەبەری بژیم. هەستم دەکرد هیچ هاوڕێیەکم لەم دنیایەدا نیە، تەنانەت خێزانەکەم لەدژم هەستابوون. شەوێك دوکتۆر ئەگلستۆن دەرمانێکی ئارامبەخشی پێدام، بەڵام زوو کاریگەرییەکەی ڕەوییەوەو من بە شپرزەیی لەخەو بەئاگابوومەوە، دەتگوت شەوی کۆتایی ژیانم بوو. لەتەختەکەم هەستام و نامەی ماڵاواییم بۆ کوڕو هاوسەرەکەم نووسی و وتم هیچ هیوایەکم بە بینینی کازێوە نیە.

کاتێك بەیانی ڕۆژی دوایی هەستام لەوەی زیندوو بووم سەرم سووڕما بوو. کاتێك دەچوومە نهۆمی خوارەوە لەکلیسایەکی بچووکەوە کە هەموو ڕۆژێك بەیانی ڕێ و ڕەسمی ئایینی تیایدا بەرپا دەبوو، دەنگی گۆرانیەکم بیست.هێشتا ئەو سروودەی دەیانخوێندەوە لەبیرمە: ((خواوەندە ئاگاداری ئێوە دەبێ)). هەروا کە دەچوومە ناو کلیساکە بە دڵی شکاوەوە بۆ سروودەکە گوێم لەدەرسی ئینجیل و پاڕانەوە گرت.کوت و پڕ شتێك ڕوویدا. ناتوانم بیهێنمە سەر زمان، تەنیا دەتوانم بڵێم موعجیزە بوو. هەستم دەکرد کوت و پڕ لەتاریکی کونێکەوە چوومەتە ناو گەرما و ڕووناکی

هەتاوەوە. هەستم دەکرد لەجەهەنەمەوە گوازراومەتەوە بۆ بەهەشت. بەجۆرێك هەستم بەهێزی خودا کرد کە لەوەپێش هیچ هەستم نەکرد. لەو ساتەدا بۆم دەرکەوت خۆم بەتەنیا هۆ کاری هەموو کێشەکانم بووم. دەمزانی کە خودا بە عەشقی خۆیەوە لەوێیە هەتا یارمەتیم بدات. لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا ژیانم بێ نیگەرانی بووە. ئێستا تەمەنم (۷۱) ساڵەو پڕ شەوق ترین‌و پڕ شکۆترین ساتی تەمەنم ئەو بیست خولەکە بوو کە لەو کلیسایەدا ئەو بەیانیە بردمە سەر.((خواوەند ئاگادارت دەبێت)). جی. سی. پەنی فێر بوو کە خێرا بەسەر کێشەکاندا سەر کەوێت، چونکە باشترین ڕێگە چارەی دۆزییەوە.

## یان بۆ بۆکسێن دەچم بۆ یانە یان لەهەوای ئازادا پیادە ڕەوی دەکەم

نووسینی: سەرهەنگ ئێدی ئیگان

پارێزەری دادگای نیویۆرك، بەرپرسی لێکۆڵەرانی ڕۆدن، قارەمانی پێشووی بۆکسێنی کێشی سووك‌و قورسی ئۆڵۆمپی کۆمیسیۆنی وەرزشی ویلایەتی نیویۆرك.

کاتێك نیگەرانم‌و لەباری فیکرییەوە خۆم وەکو وشترێك کە لەمیسر چەرخی ئاو دەسووڕێنێت، گێژو پەشێو دەبینم، وەرزشێکی جەستەیی چاك یارمەتیم ئەدات لەدەستی ئەو نیگەرانیانە هەڵبێم. ئەم وەرزشە دەکرێ هەڵهاتن یان پیادە ڕەوییەکی زۆر بێت لەدەرەوەی شار یان نیو کات ژمێر بۆکس دان لەکیسەی بۆکسێن یان تێنسی ئیسکواش لەیانەیەك. هەرچی بێت وەرزش ڕوانگەی عەقڵیْ من دەکاتەوە. لەکۆتایی حەفتەدا وەرزشی زۆر دەکەم، بۆ نموونە هەڵهاتن بەدەوری گۆڕەپانی گۆڵفدا، یاری تێنس یان خلیسکانێ لەئیدیرۆنداکس. کاتێك لەباری جەستەییەوە ماندوو دەبم مێشکم لەکاروباری یاسایی دوور دەکەوێتەوە، کەواتە کاتێك دیسان دەچمەوە سەریان مێشکم شەوق‌و هێزێکی تازەی هەیە.

لەنیویۆرك ئەو شوێنەی من لێی دەژیام بە کەمی کات بۆ کاتژمێرێك لەیانەی یەل کلاب دەست ئەدات. هیچ کەس لەکاتی خلیسکانێ یان یاری تێنس ئیسکواش نیگەران نیە. ئەوەندە سەرقاڵە کە کاتی بۆ نیگەران بوون نیە.

کێوی زەبەلاحی کێشەو گرفتە فیکرییەکان وەها دەبن بە تەپۆڵکەی بچوك کە فیکرو کردەوەی نوێ بە خێرایی‌و بەنەرمی دێنە خوارەوە.

من باشترین ڕێگـه چارەی نیگەرانیـەکان بـه وەرزش دەزانم. لـەکاتی نیگەرانیـدا ماسـولکەکان زیـاتر بگرنـه کـارو مێـشك کـەمتر. ئـەو کاتـەی لەئاکامەکـەی سـەرتان سووڕدەمێنێت. بۆ من وایە، کاتێك وەرزش دەست پێدەکات نیگەرانی بار دەکات.

## من جەنازەیەکی دڵنیگەران بووم لە زانکۆی ڤەرجینیا

**نووسینی: جیم بیردسال**

حەڤدە ساڵ لەمەوبەر کاتێك لـەکۆلیجی ئەفسەری بلاکس بێرگ لەڤەرجینیا بووم بەناوی ((جـەنازەی دڵنیگـەرانی زانکـۆی ڤـەرجینیا)) دەیانناسیم. ئەوەنـدە نیگـەران بـووم کـە زۆرجـار نـەخۆش دەکـەوتم. لەڕاسـتیدا چـونکە زۆرتـر نیگـەران بـووم لەنەخۆشخانە هەمیشە تەختێکم بۆ دانرابوو. کاتێك پەرەستیار دەیبینی من خەریك بووم دەچووم هەڵدەهات و دەرزییەکی ژێر پێستی لێ ئەدام. من نیگەرانی هەموو شتێك بووم. جاری وابوو تەنانەت لەبیرم ئەچوو نیگەرانی چ شتێکم. نیگەران بووم چونکە دەترسام بەهۆی نمرەی کەمەوە لەزانکۆ دەربکرێم. لەتاقیکردنەوەی فیزیاو وانەکانی تریشدا مابوومەوە. دەمزانی دەبێ نمرەکانم لە (٨٤ بۆ ٧٥) بێت. نیگەرانی تەندروستیم بووم. نیگەرانی بێ خواردنی و بێ خەوی بووم. نیگەرانی باری دارایی بووم. هەستێکی خراپم هەبوو، چونکە دەترسام ئەو کچەی خۆشم دەوێت لەگەڵ یـەکێك لەخوێنـدکارەکانی کـۆلیجی ئەفـسەری هاوسـەرگیری بکـات. دەورانێکـی پـڕ لەکێشەم لەگەڵ دوو دەرزەن کە نیگەرانیەکان دەبردەسەر.

لەبێ هیواییدا کێشەو دەردی سەرییەکانم لەگەڵ پڕۆفیسۆر دۆك بێرد، پڕۆفیسۆری فەرمانگەی بازرگانی لە V.P.T باس کرد. ئەو پانزە خولەکەی لەگەڵ پڕۆفیسۆردا بردمە سەر زیاتر لەو چوار ساڵەی لەزانکۆ بووم بۆ تەندروستی و خۆشی من بەسوود بوو. ئەو وتی: ((جیم، تۆ دەبێ دانیشیت و بەرەو ڕووی ڕاستیەکان ببیتەوە. ئەگەر تەنیا نیو ئەوەندەی بۆ ئەو کاتەی بۆ نیگەران بۆ کێشەکانت بۆ چارەسەریان دابنایە، چیتر هـیچ نیگەرانیـەکت نـەدەبوو. نیگـەرانی تـەنیا عـادەتێکی خراپـە کـە تـۆ فێـری بوویت)).

ئەو سێ یاسای بۆ تێکشکاندنی عادەتی نیگەرانی فێری من کرد:

**یاسای یەکەم:** جوان ئەو کێشەیەی نیگەرانیت بیدۆزەرەوە.

**یاسای دووەم**: هۆکاری کێشەکەت بدۆزەرەوە.

**یاسای سێهەم**: خێرا کردەوەیەکی بنیاتنەر بۆ چارەسەری کێشەکە ئەنجام بدە.

لەپاش ئەو دیدارە تۆزێك بەرنامەی بنیاتنەرم ئەنجامدا. ئێستا لەجیاتی نیگەرانی دەربارەی مانەوە لەتاقیکردنەوەی فیزیادا پرسیارم لەخۆم دەکرد بۆچی دەرنەچووم. دەمزانی بەهۆی لاوازی مێشکەوە نەبوو، چونکە من سەرنووسەری گۆڤاری ئەندازیاری زانکۆی پیشەیی ڤەرجینیا بووم.

بۆم دەرکەوت لەفیزیادا بۆیە ماومەتەوە چونکە هیچ ئارەزوویەکم لێی نەبوو. کۆڵنەدەر نەبووم چونکە نەمدەزانی ئەمە وەکو ئەندازیارێکی پیشەیی لەکارەکانمدا یارمەتیم ئەدات. بەڵام ئێستا ڕوانگەی خۆمم گۆڕیوە. بەخۆمم وت: ((ئەگەر یاسای زانکۆ من بە ناچار لەدەرچوون لەتاقیکردنەوەی فیزیا دەزانێت پێش لەوەی بڕوانامەکەم وەرگرم، خۆ من هەم هەتا زیرەکی ئەوان ڕەت بکەمەوە؟)).

کەواتە دیسان لەفیزیادا ناوم نووسیوە. ئەم جارە دەرچووم، چونکە لەجیاتی بەفیڕۆدانی کاتم بۆ نیگەرانی لەوەی چەند سەختە، بە کۆڵنەدان و خوێندنەوەو هەوڵدانی بەردەوام سەرکەوتم.

نیگەرانی دارایی خۆمم بە گرتنی چەند کارێکی زیادەی وەکو فرۆشتنی پانچ (ساردی ئاوی میوە)و قەرز کردن لەباوکم کە خێرا لەپاش تەواو بونی خوێندن دامەوە، چارەسەر کرد.

نیگەرانی خۆشەویستیم بە پێشنیاری هاوسەر گیری بەو کچەی دەترسام لەگەڵ خوێندکارێکی تر لەکۆلیجی ئەفسەری هاوسەر گیری بکات چارەسەر کرد. ئەو ئێستا خاتوو جیم بیرد ساڵە.

ئێستا کە سەیری ڕابردوو دەکەم، دەبینم کێشەی من جۆرێك سەر لێشێواوی بوو، بێ مەیلی و ڕێ گوم کردنێك لەدۆزینەوەی هۆکاری نیگەرانیەکانم و ڕوو بەڕوو بوونەوەی عاقڵانە بوو لەگەڵ ئەوان.

جیم بیرد ساڵ فێر بوو کە چیتر نیگەران نەبێت، چونکە کێشەکانی خۆی شیکردەوەو هەڵیسەنگاندن لەڕاستیدا ئەو هەر ئەو بنەمایانەی بەکارهێنا کە لەم بەشەدا پێناسە کرابوو: ((چونکە کێشەکانی پێوەندیدار بەنیگەرانی چارەسەرو شیبکەینەوە)).



 

## من لەگەڵ ئەم ڕستەدا ژیانم بەڕێ کردووە

نووسینی: دوکتۆر جۆزیف. ئار. سیندۆ

چەند ساڵ لەمەوبەر لەیەکێك لەڕۆژانی سەر لێشێواوی و شکستدا کاتێك وادەردەکەوت ژیانم کەوتووەتە بەر هێزی بەدەر لەکۆنترۆڵی من، وەکو هەمیشە کتێبی ئینجیلم کردەوەو چاوم بەم ڕستە کەوت: ((ئەو کە منی ناردووە لەگەڵمدایە، باوکم من بەتەنیا بەرەڵا ناکات)). لەو ساتە بەدواوە ژیانم وەکو پێشوو نەبوو. هەموو شتێك بۆ هەمیشە جیاواز بوو. پێموایە ڕۆژێك نەبووبێت کە من ئەو ڕستەیەم دووپات نەکردبێتەوە. بەدرێژایی ئەم ساڵانە کەسانێکی زۆر بۆ ڕاوێژو ڕێنوێنی هاتوون بۆلای من و من هەمیشە ئەوانم بەم ڕستەیە بەڕێ کردووە. لەو کاتەوە چاوم بەم ڕستەیە کەوتووە لەگەڵیدا ژیاوم، هەنگاوم لەگەڵی ناوەو ئۆقرەیی و وزەم تیادۆزیوەتەوە. بەبڕوای من ئەمە جەوهەری ئایینەو لەئاڵتوونی ترین بەشی هەر شتێکدایەو بەهای ژیان بەژیان دەبەخشێت. ئەمە ڕستەی زێڕینی ژیانی منە.

## سەختی زۆرم کێشاو ڕزگار بووم

نووسینی: تێد ئێریکسەن

من خەفەت خۆرێکی ترسناك بووم، بەڵام ئیترنا. لەهاوینی (١٩٤٢)دا ئەزموونێکم بۆ هاتە پێشەوە کە بۆ هەمیشە نیگەرانی لەژیانم دەرکرد. ئەو ئەزموونە بووە هۆی ئەوەی کێشەکانی تریشم بچووك بەرچاو بێن.

چەندین ساڵ بوو کە دەمویست هاوینێك لەبەلەمێکی ماسیگرتندا لەئالاسکا بەرمە سەر. کەواتە ساڵی (١٩٤٢) لەکۆدیاکی ئالاسکا لەبەلەمێکی ماسی گرتنی سی و دوو پێ درێژ کە ماسی ئازادی ڕاو دەکرد ناو نووسم کرد. لەسەر بەلەمێکی بەم درێژییە تەنیا سێ کەس کاری دەکرد. یەکیان کاپتن کە کاری چاودێری دەکرد. پیاوێکی ژمارە(٢) کە یارمەتی کاپتنی ئەداو کرێکارێك کە هەموو کارەکانی ئەنجام ئەداو زۆربەی کات خەڵکی ناوچەی ئەسکەندەناڤی بوو. منیش خەڵکی ئەو ناوچەیەم.

بەهۆی ئەوەی ڕاوی ماسی ئازاد لەکاتی بەرزو نزم بوونەوەی ئاوی دەریادا ئەنجام ئەدرێت من زۆربەی کات (٢٢) کاتژمێر لە(٢٤) کاتژمێری شەوو ڕۆژ کارم دەکرد.

جاریوابوو ئەم بەرنامەیە یەك حەفتە درێژەی هەبوو. من هەر کارێك کە کەس نەیدەویست ئەنجامی بدات، ئەنجامم ئەدا. بەلەمەکەم دەشۆرد. چەرخەکانم ئەملاولا پێ دەکرد. لەسەر چرایەکی دار کە لەژوورێکی بچووکدا گەرماو دووکەڵی مەکینەی بەلەمەکە نەخۆشی دەکردم، چێشتم لێدەنا. قاپەکانم دەشۆرد، بەلەمەکەم تەعمیر ئەکردو ماسیەکانم لەبەلەمەکەی خۆمانەوە دەگواستەوە بۆ واگۆنێك کە دەیبرد بۆ کارگەیەکی دروست کردنی ماسی قوتوو. هەمیشە قاچم لە جزمە چەرمەکانمدا پر لەئاو بوو، بەلاّم کاتی خاڵی کردنیانم نەبوو. بەلاّم تەواوی ئەوانە لەچاو کارە سەرەکیەکەم کە ڕاکێشانی شریتی چێوەی تەڕ بوو وەکو یاری وابوو. ئەم کارە بەم شێوەیە بوو کە قاچم دەخستە دوای بەلەمەکەو چێوە تەڕەکانو شریتی چنراوی تۆڕم بۆ ناو بەلەمەکە ڕادەکێشا. بەلاّم تۆڕەکە ئەوەندە قورس بوو کە کاتێك دەمویست ڕایکێشم بۆ ناو بەلەمەکە هیچ نەدەبزوا. ئەو شتەی لەڕاستیدا ڕووی ئەدا ئەوەبوو کە من لەهەوڵی چێوە تەڕەکەدا بەلەمەکەم ڕادەکێشا. بەتەواوی هێزمەوە ڕامدەکێشا، چونکە تۆڕەکە هەر لەجێی خۆی بوو، نەدەجولاّ. چەند حەفتە ئەم کارەم تاکۆتایی ئەنجامدا. بەڕاستی کۆتایی خودی خۆشم بوو. لەشم زۆر زۆر ئازاری هەبوو. چەند حەفتە ئازارم دەکێشا .کاتیك سەرەنجام مەجالی حەسانەوەم پەیدا کرد لەسەر دۆشەکێکی شێداری ناساف کە لەسەر سندووقی ئازووقەکە کۆ ببووەوە خەوتم. یەکێك لەڕەقاییەکانی دۆشەکەکەمم لەژێر پشتم ئەو شوێنەی ئازاری هەبوو، دادەناو جۆرێك دەخەوتم دەتگوت تلیاکم خواردووە. ئەڵبەت بەو شەکەتیە زۆرەوە گێژیش ببووم.

ئێستا شادمانم کە ناچار بووم ئەم هەموو دەردو سەختیە تەحەممول بکەم، چونکە یارمەتی منیدا چیتر نیگەرانیم نەمێنێت. ئێستا لەگەڵ دروست بوونی کێشە لەجیاتی نیگەرانی سەبارەت بەوە بەخۆم دەڵێم: ((ئێریکس، ئایا ئەمە دەتوانی بەئەندازەی ڕاکێشانی شریتی چێوە تەڕەکە سەخت بێت؟)). هەمیشەیش ئەم وەلاّمە ئەدەمەوە: ((هەرگیز هیچ شتێك ئەوەندە ناخۆش نەبوو)). پاشان بزەیەك دەگرمو بەشەهامەتەوە دەیگرمە ئەستۆ. من لەسەر ئەو باوەڕەم کە جار جار باشە تاقیکردنەوەیەکی پڕ ئازارمان هەبێت. باشترە بزانین کە ئەشکەنجەمان چەشتووەو ڕزگارمان بووە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی تەواوی کێشە ڕۆتینەکانمان سادەو ئاسان بێتە بەر چاومان.

# من یەکێك لەبێ عەقڵترینەکانی دنیا بووم

**نووسینی: پێرسی. ئێچ. وایتینگ**

من زیاتر لەهەر کەسێکی تر چ زیندوو، چ مردوو و چ نیوەگیان بەهۆی نەخۆشی جیاوازەوە مردووم. کوڕە هەر خۆ بەنەخۆشزانێکی ئاساییش نەبووم. باوکی من دەرمانخانەیەکی هەبوو، من لەوێ گەورە بووم. هەموو ڕۆژێك لەگەڵ دوکتۆرەکان و سیستەرەکان قسەم دەکرد. لەئەنجامدا زیاتر لەهەر کەسێکی ئاسایی ناو نیشانەکانی خراپترین نەخۆشیەکانم دەزانی. من خۆ بەنەخۆش زانێکی ئاسایی نەبووم، نیشانەم هەبوو. دەمتوانی یەك یان دوو کاتژمێر نیگەرانی نەخۆشیەکەم بمو پاشان نیشانەکانی ئەو کەسەبگرم کە دووچاری ئەم نەخۆشییە بووە. لەبیرمە جارێك لەگریت برینگتۆنی ویلایەتی ماسا چۆسێت دیفترییەکی سەخت بڵاو بووەوە. لەدەرمان خانەکەی باوکم هەموو ڕۆژێك دەرمانم بە کەسانێك دەفرۆشت کە لەخانووی نەخۆشیەکەوە دەهاتن. پاشان ئەو بەڵایەی لێی دەترسام بەسەرم هات. خۆیشم دیفتریم گرتبوو. ڕای خۆم لەسەر گرتنی بوو. چوومە ناو جێگەو نیگەرانی نیشانەباوەکان بووم. ناردم بەدوای دوکتۆردا. پشکنینی بۆ کردمو وتی: ((بەڵێ، پێرسی تووش بوویت)). ئەم ڕستەیە دوو دڵیمی نەهێشت. هەرگیز لەو نەخۆشیەی هەمبوو نەدەترسام، کەواتە لەجێگەدا سووڕامو خەوم لێکەوت. بەیانی ڕۆژی دوایی تەواو تەندروست بووم.

چەندەها ساڵ خۆم بە جیاواز لەخەڵك دەزانیو وردبینی زۆرم لەسەر نەخۆشی سەیرو سەمەرە پەیدا کرد. چەندین جار لەتاو گزازو هاری مردم. لەو دواییانەدا بەگرتنی نەخۆشی ئاسایی ئۆقرەم گرت، وەکو سیلو شێرپەنجە.

ئێستا پێی پێدەکەنم: بەڵام ئەو کاتە بەڕاستی سەخت بوو بۆم. چەندەها ساڵ لەو ترسەدا ژیانم بردە سەر کە لەسەر لێواری قەبرم. کاتێك بەهار کاتی کڕینی دەستێك جل دەهات پرسیارم لەخۆم دەکرد: ((بۆچی هەر لەخۆوە پارەکەم خەسار کەم، کاتێك دەزانم دەرفەتی لەبەر کردنیانم نابێت؟)).

بەهەر حاڵ خۆشحاڵم کە باس لەپێشرەفتەکانم بکەم. لەماوەی دەساڵی ڕابردوودا تەنانەت یەك جاریش نەمردووم.

چۆن مردنم وەستاند؟ بە پێکەنین بەخۆم بەو دیمانە گاڵتە جاڕانەم. هەر جار کە هەستم دەکرد نیشانەی ترسناك لەحاڵی هاتندان بەخۆم پێدەکەنیم‌و دەموت: ((سەیر کە بەڕێز دایتینگ، بیست ساڵە بەهۆی نەخۆشی کوشندەوە یەك لەدوای یەك دەمری، بەم حاڵەوە ئەمڕۆکە زۆر تەندروستیت. کۆمپانیایەکی بیمە ئەمڕۆ تۆی بۆ بیمەی زیاتر وەرگرت. کاتی ئەوە نیە لەکەنارەوە بوەستی‌و بە نیگەرانیەکان پێبکەنیت؟ زۆر بێ عەقڵی)).

زۆری پێ نەچوو تێگەیشتم ناتوانم لەیەك ساتدا هەم نیگەرانی خۆم بم‌و هەم بەخۆم پێ بکەنم. کەواتە لەوە بەدواوە بەخۆم پێکەنیم.

خاڵی گرنگ لێرەدایە کە خۆتان زۆر جیدی مەگرن. هەوڵ بدەن بەهەندێك لەنیگەرانیە بێ عەقڵانەکانتان پێ بکەنن‌و بزانن ئایا ناتوانن بە پێکەنین لەناوی بەرن.

## هەمیشە هەوڵمداوە ڕێگەی گەڕانەوە بەکراوەیی بهێڵمەوە

نووسینی: گین ئاوتری

خۆشەویسترین‌و بەناوبانگترین گا لەوەڕێنی گۆرانیبێژی جیهان

من پێموابوو زۆربەی نیگەرانیەکانم بەهۆی کێشەو گرفتی خێزانی یان داراییەوەیە. من زۆر بەختەوەر بووم کە لەگەڵ کچێکی خەڵکی شاری بچووکی ئوکلاهاما کە هاوشێوەی خۆم بوو، لەو شتانەی من چێژم وەردەگرت ئەویش چێژی دەبرد، هاوسەر گیریم کرد. هەردووکمان هەوڵمان پێڕەوی لەیاسای زێڕین بکەین، کەواتە کێشەو گرفتە خێزانیەکانمان لەکەمترین حاڵەتدا ڕادەگرت. یەکەم. هەمیشە پێڕەویم لەم یاسایە کردووە کە هەموو شتێك ڕاستگۆیانە بێت. کاتێك پارەیەکم بە قەرز وەردەگرت تا دوا دۆلاریم ئەدایەوە. شتانێکی کەم هەن کە زیاتر لەناڕاستگۆیی نیگەرانی دروست دەکەن. دووەم، کاتێك دەستمان دەکرد بە موعامەلەیەکی مەترسیدار، هەمیشە یەك خاڵی شاراوەم بۆ خۆم ڕادەگرت.

پسپۆڕانی شەڕ دەڵێن یەکەم بنەما لەشەڕدا ئەوەیە کە ڕێگەی گەڕانەوە بەکراوەیی بێڵیتەوە. من پێموایە ئەم بنەمایە لەشەڕی ژیانیشدا بە ئەندازەی شەڕی سەربازی بەکار دێت. بۆ نموونە کاتێك گەنج بووم لەکاتی وشکە ساڵی لەولاتدا هەژاری ڕاستەقینەم لەتەکساس‌و ئوکلاهاما بینی. بەسەختی توانای ژیانم هەبوو. ئەوەندە

دەستەنگ بووین کە باوکم سەرانسەری ولاّتی لەواگۆنێکی سەر داخراودا لەگەڵ ڕیزێك ئەسپ دەگەڕاو موعامەلەی بەئەسپەکان دەکرد هەتا بتوانین خۆمان بژیەنین. من شتێکی دڵنیا بەخشتر لەوەم دەویست. کەواتە لەوێستگەیەکی شەمەندەفەر کارێکم پەیدا کردو لەکاتی بێکاریدا کاری تەلەگرافی فێر بووم. لەدواییدا بۆ یاریدەدەر لەشەمەندەفەری فریسکۆ.

بەملاولادا دەنێردرام هەتا ئەو فەرمانبەرانەی نەخۆش دەکەوتن یان دەچوون بۆ سەفەر یان کاری زیاتریان هەبوو، یارمەتی بدەم. دەرماڵەی ئەم کارە لەمانگدا (١٥٠) دۆلار بوو. لەدواییدا کاتێك لەم کارەدا باشتر بووم هەمیشە بیرم دەکردەوە کاری شەمەندەفەر لەباری ئابوورییەوە تەواو متمانە بەخشە. کەواتە هەمیشە ڕێگەی چوون و هاتنەوە بۆ نا و ئەم کارەم بەکراوەیی دەهێشتەوە. ئەو هێڵی پاشەکەوتی من بوو هەرگیز خۆم لێ دانەبڕاند تا زەمانێك کە لەوەزعێکی باشتردا دادەمەزرام.

بۆ نموونە لەساڵی (١٩٢٨)دا کاتێك وەکو ئۆپەراتۆری یاریدەدەر لە فریسکۆ لەچەلسی ئوکلاهاما دەستم بەکار کرد، غەریبەیەك بۆ ناردنی تەلەگرامێك هاتە ژوورەوە. ئەو دەنگی منی بیست کە گیتارم لێ ئەداو ئاوازی گا لەوەڕێنەکانم دەخوێندەوە. بە منی وت باشترە بچم بۆ نیویۆرك و لەڕادیۆ یان شانۆدا کارێك پەیدا بکەم. دیارە بەشان و باڵی مندا هەڵیئەداو کاتێك ناوەکەیم بینی کە خوارەوەی تێلیگرامەکەدا واژۆی کردبوو هەناسەم بڕا:

*ویل راجەرز.*

لەجیاتی پەلەپەل لەچوون بۆ نیویۆرك، نۆ مانگی تەواو بابەتەکەم تەواو هەڵسەنگاند. سەرەنجام گەیشتمە ئەو بڕیارە کە بە چوون بۆ نیویۆرك و ئاڵوگۆڕێك لەشارێکی بچووکدا هیچم لە کیس ناچێت، بەڵکو هەموو شتێك بەدەست دێنم. بلیتێکی شەمەندەفەرم پێ بوو دەمتوانی بەخۆڕایی بۆ هەر شوێنێك بچم. دەمتوانی لەحاڵێکدا لەسەر کورسیەکەم دانیشتووم، بخەوم و چەند بابۆڵەیەك و کەمێك میوە بۆ خواردن لەگەڵ خۆم بەرم. کەواتە چووم. کاتێك گەیشتمە نیویۆرك، لەژوورێکدا دەخەوتم کە ڕاخراو بوو، مانگی (٥) دۆلارم بۆ کرێکەی ئەدا. لەڕیستۆرانی خۆ خزمەت نانم دەخواردو دە حەفتە لەشەقامەکاندا سووڕامەوەو نەگەیشتمە هیچ کوێ. ئەگەر کارێکم نەبوایە بۆ گەڕانەوە دەبوایە نیگەران بوومایە. پێنج ساڵ کارم بۆ هێڵی

شەمەندەفەر کردبوو، ئەمە بەو مانایە بوو کە مافی فەرمانبەری خاوەن پێشینەم هەبوو، بەلاَم بۆ ڕاگرتنی ئەم مافە نەمەتوانی زیاتر لە(٩٠) ڕۆژ پشوو وەرگرم. تا ئەو کاتە دەیکردە (٧٠) ڕۆژ؛ کەواتە خێرا گەڕامەوە بۆ ئوکلاهاماو هێشتنەوەی مافەکەم دەستم کردەوە بەکار، چەند مانگ کارم کردەوەو بۆ تاقیکردنەوەی دووبارە گەڕامەوە بۆ نیویۆرک. ڕۆژێك لەحالێکدا چاوەڕوانی دیدار بووم لەبەڕێوە بەرایەتی ستۆدیۆیەك، دەستم کرد بە گیتار لێدان و گۆرانیەکم بۆ سکرتێرەی دامەزراندن گوت: ((جینی من لەخەیالی خونچە کردنی گوڵە یاسەکاندام)). کاتێك ئەم گۆرانیەم دەوت ئەو کەسەی شاعیرەکەیەتی واتە نات شیلوکرات، هاتە ژوورەوە. بێ گومان لەوەی من شیعرەکەیم دەوت شادمان بوو. کەواتە نامەیەکی ناساندنی بەمن داو ناردمی بۆ کۆمپانیای تۆمارکردنی ویکتۆر. تۆمارێکیان لێ هەڵگرتم. هیچ باش نەبووم، لەڕادەبەدەر وشك و لەخۆبایی. لەئەنجامدا گوێم لەپەندی بەڕێوەبەری تۆمارگەی ویکتۆر گرت، گەڕامەوە بۆ تۆلساو ڕۆژانە لەهێڵی شەمەندەفەر کارم کردو شەوانە لەبەرنامەیەکی ڕادیۆییدا بەشێوەی هەمیشەیی گۆرانیەکانی گالەوەڕێنانم دەوت: ئەم دووکارە بەلامەوە خۆش بوو. بەو مانایە بوو کەدیسان هێڵی پاشەکەوتەکەم ڕادەگرت، کەواتە هیچ جێی نیگەرانی نەبوو.

بۆ ماوەی (٩) مانگ لەوێستگەی ڕادیۆی KVOO لەتۆلسا گۆرانیم وت: لەوماوەدا من و جیمی لانگ شیعرێکمان بەناوی ((باوکی قژ زیوینی من)) نووسی. بەرەبەرە خۆشەویست دەبووم. ئارتۆر ستەرلی سەرۆکی کۆمپانیای تۆماری ئەمریکان داوای لەمن کرد تۆمارێك هەڵگرم. چەند تۆمارێکم بە (٥٠) دۆلار بۆ ئەوان کردو سەرەنجام لەوێستگەی ڕادیۆی WLS لەشیکاگۆ سەرگەرمی گۆرانی گا لەوەڕێنان بووم. دەرماڵەم (٤٠) دۆلار بوو لەحەفتەدا. لەپاش چوار ساڵ گۆرانی وتن لەوێ دەرماڵەم گەیشتە (٩٠) دۆلار بۆ یەك حەفتەو سێ سەد دۆلاریشم لەگۆرانی وتنی ئازاد کە هەموو شەوێك لەشانۆ هەمبوو وەرگرت.

پاشان لەساڵی (١٩٣٤)دا گۆرانێکی تر ڕوویدا کە ئەگەر زۆری لەبەردەمدا بوو. سەندیکای ئەدەب و هونەر دروست بوو تاکو تەواوی فلیمەکان پاکسازی بکات. کەواتە بەرهەم هێنەرانی هۆلیوودی بڕیاریاندا سوود لە وێنەی گا لەوەڕێنەکانیش وەرگرن؛ بەلاَم جۆرێکی نوێ لەگالەوەڕێن، گالەوەڕێنێك کە دەیتوانی گۆرانی بڵێت. ئەو پیاوەی خاوەنی کۆمپانیای هەڵگرتنەوەی ئەمەریکەن بوو لە (Republic pictures)دابەشی هەبوو. ئەو بەهاوکاران و هاوبەشەکانی وت: ((ئەگەر گا

لەوەڕێنێکی گۆرانی بێژتان دەوێت من یەکێك دەناسم کە تۆمارمان بۆ هەڵگرێت)). بەم جۆرە بوو کە چوومە ناو فیلمەوەو حەفتەی سەد دۆلارم وەردەگرت. زۆر گومانم لەوە بوو لەفیلمەکاندا سەرکەوتوو بم، بەلاّم نیگەران نەبووم چونکە دەمزانی هەمیشە دەتوانم بچمەوە سەر کاری پێشووم. سەر کەوتنی من لەفیلمەکاندا لەچاوەڕوانیە زۆرەکانمان زیاتر بوو. ئێستا سەد هەزار دۆلار لەساڵداو هەروەها نیوەی سوودی فرۆشتنی فیلمەکان وەردەگرم. بەهەر حاڵ ئاگادار بووم کە ئەم بەرنامەیە هەمیشەیی نیە، بەلاّم دیسان نیگەران نیم. دەزانی هەر شتێك ڕوویدات، تەنانەت ئەگەر تەواوی ئەو پارەیەی هەمە لەدەستم بچێت، هەمیشە دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئوکلاهاما و لەهێڵی شەمەندەفەری فریسکۆدا کاربکەم سەرچاوە زەخیرەکەمم ڕاگرتووە.

## دەنگێك کە لەهیندستان بیستم

**نووسینی: ئی. ستەنلی جۆنز**

**یەکێك لەوتار بێژانی چالاکی ئەمریکاو ناودارترین مەوعیزەگەری ئایینی ئەوەی خۆی.**

**هیندستان، بیۆمبای، فۆرت. سندووقی پۆستی (٩٢)، فەرمانگەی ئەنتەرمیش**

چل ساڵ لەژیانم بۆ ناساندنی وتاری ئایینی لەهیندستان تەرخان کردووە. سەرەتا تەحەمولی گەرمای زۆرو فشاری عەسەبی بەهۆی ئەو کارە هەستیارەی لەبەر دەمم بوو، سەخت دەینواند. لەپاش هەشت ساڵ بەهۆی شەکەتی مێشکەوە ئەوەندە ڕەنجم دەکێشا کە نەك یەك جار بەڵکو چەندین جار لەسەر هۆش چووم. فەرمانم پێدرا یەك ساڵ بۆ پشوو بگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا. لەو بەلەمەی بەرەو ئەمریکا دەگەڕایەوە لەکاتی وتار خوێندنەوە لەڕەسمی بەیانی یەك شەممەدا دیسان لەسەر هۆش چووم و دوکتۆری گەشتەکە منی خەواند.

لەپاش یەك ساڵ پشوودان لەئەمریکا گەڕامەوە بۆ هیندستان، بەلاّم لەڕێدا بۆ ئەنجامی کۆبوونەوەی ئایینی لەگەڵ خوێندکاران لەمانیلا وەستام. لەگەرمەی فشاری ئەم کۆبوونەوانەدا چەندین جار لەسەر هۆش چووم. پزیشکەکان هۆشداریان بەمندا ئەگەر بچمەوە بۆ هیندستان دەمرم. سەرەڕای ئەوە درێژەم بە گەشتەکەم بەرەو هیندستان دا بەلاّم هەورێکی چڕ هەمیشە بەسەر سەرمەوە بوو. کاتێك گەیشتمە بۆمبای ئەوەندە شەکەت و تێکشکاو بووم کە ڕاستەوخۆ چووم بۆ سەر یاڵەکان و چەند

مانگ پشووم دا. پاشان گەڕامەوە بۆ دەشتەکان و درێژەم بەکارەکەمدا. سوودی نەبوو، چونکە لەسەر هۆش دەچووم و ناچار بووم بۆ حەسانەوەیەکی درێژخایەن بگەڕێمەوە بۆ سەر پالەکان. دیسان دەگەڕامەوە بۆ دەشتەکان و لەوەی نەمدەتوانی کارەکەم ڕاپەڕێنم سەر سووڕماو و حەیران بووم. لەباری جەستەیی و ڕۆحییەوە یەکجار ماندوو بووم. چیتر هێزم تیا نەمابوو. دەترسام ببمە پەککەوتەیەکی جەستەیی. بیرم دەکردەوە ئەگەر یارمەتی لەشوێنێك وەرنەگرم ناچارم واز لەپیشەی وتار خوێندنەوەی ئایینی بێنم و بگەڕێمەوە بۆ ئەمریکا و لەسەر کێڵگەیەکی کشت وکاڵی کار بکەم هەتا دیسان تەندروستیم بە دەست بێنمەوە. ئەمە یەکێك لەتاریکترین ساتەکانی من بوو. لەو کاتەدا کۆمەڵێك کۆبوونەوەم لەلاکنۆ بەڕێوە دەبرد. شەوێك لەکاتی دۆعاو پارانەوەدا شتێك ڕوویدا کە ژیانی منی تەواو گۆڕی. لەحاڵێکدا هیچ بیرم لەخۆم نەدەکردەوە دەنگێکم هاتە مێشك کە وتی: ((ئایا خۆت بۆ کارێك کە من تۆم بۆ ئەو هەڵبژاردووە ئامادەبیت نیە؟)).

وەڵامم دایەوە: ((نا خودایە، کاری من گەیشتووەتە کۆتایی. گەیشتوومەتە کۆتایی هێز و توانام)). دەنگەکە وەڵامی دایەوە: ((ئەگەر ئەو کارە بسپێری بە من و نیگەرانی نەبی، من ئاگام لەهەموو شتێك دەبێت)).

خێرا وەڵامم دایەوە: ((خودایە، هەر لێرەدا موعامەلەکە تەواو دەکەم)).

ئۆقرەییەکی گەورە دڵمی گرتەوە و تەواوی دەروونمی داگیر کرد. دەمزانی تەواو بووە. ژیان، ژیانی بەرفراوانی منی داگیر کردووە. ئەوەندە شادمان بووم کە ئەو شەوە بەسەختی هەستم بەسەختی جادەی ژێر قاچم لەکاتی ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە دەکرد. هەر بستێکی وڵاتی پیرۆز بوو. چەندەها ڕۆژ دوای ئەوە کەم هەستم دەکرد جەستەیشم هەیە. ڕۆژگارم بردە سەر. ڕۆژانە کارم دەکرد و شەوان تا درەنگانێ سەرقاڵ بووم و کاتێك بۆ خەو دەهاتمە خوارەوە، سەرم لەوە سووڕ دەما بۆچی دەبێ بخەوم کاتێك کەمترین نیشانەی شەکەتی لەمندا نیە. وادەردەکەوت بەژیان و ئۆقرەیی داگیر کرابوو، بەخودی مەسیح.

باسەکە لەوەدا بوو ئایا ئەمە بگێڕمەوە یان نا. ترسم لەم کارە بوو، بەڵام هەستم دەکرد دەبێ ئەم کارە بکەم و کردیشم. لەدوای ئەوە بابەتەکە لەبەرامبەر هەمووانەدا

ئاوای لێهاتبوو: یان مەلە بکە یان نوقم بە. لەوە بەدواوە تاقەت پڕوکێنترین ساڵەکانی ژیانم بردووەتە سەر، بەڵام کێشەی ڕابردوو هەرگیز نەگەڕاوەتەوە. وا دەردەکەوت ژیانی دووبارە ڕوو کردووەتە جەستەو ڕۆح و مێشکم. هەرگیز ئەوەندە تەندروست نەبووم. بەڵام ئەمە زیاتر لەهەستێکی جەستەیی بوو. لەپاش ئەو تاقیکردنەوەیە ژیان بۆ من لەهێڵی بەرزی بەردەوامدا کاری کردووەومن لە وەرگرتنی زیاتر هیچم نەکردووە. بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر کە لەوکاتەوە تێپەڕیوە گەشتم بۆ هەموو دنیا کردووە و جاری وابووە لە ڕۆژدا سێ جار وتاربێژییم کردووەو دەرفەت و هێزی نووسینی کتێبی ((مەسیحی جادەی هیندستان))و پانزە کتێبی ترم پەیدا کرد. بەو حاڵەوە لەناو تەواوی ئەم کارانەدا تەنانەت یەك وادەی دیداریشم لەدەست نەدا یان نەمخستە درەنگ. نیگەرانی و دڵەڕاوکێکانم کە زەمانێك دەورییان گرتبووم، لەوە بەدواوە لەناو چوون و ئێستا لەتەمەنی شەست وسێ ساڵیدا پڕم لەوزەی ژیان و چێژی خزمەت و ژیان کردن بۆ خەڵك.

پێموایە ئەو گۆڕانە ڕۆحی و جەستەییەی من تەجرەبەم کرد دەکرێ لەبواری دەروونناسیەوە ورد بکرێت و شی بکرێتەوە. گرنگ نیە، ژیان گەورەترە لەم ڕەوتانەو ئەوان بچووك پیشان ئەدات.

ئەو یەك شتە ئەزانم کە ژیانی من ئەو شەوە لەلانکۆ، سی ویەك ساڵ لەمەوبەر، بەکاملی گۆڕانی بەسەرهات، کاتێك لەنوقمی لاوازی و بێ هیواییدا دەنگێك بەمنی وت: ((ئەگەر بیخەیتە ئەستۆی من و نیگەران نەبیت من ئاگاداری دەبم))و من وەڵامم دایەوە: ((خودایە هەر لێرەدا موعامەلەکە تەواو دەکەم)).

## کاتێك ئەفسەری پۆلیس لەدەرگای پێشەوە هاتە ناو ماڵەکەم

**نووسینی: هۆمەر کرۆی**

**نووسەری ڕۆمان، شەقامی پاین هێرست (١٥٠)، نیویۆرك**

تاڵترین ساتی ژیانی من ڕۆژێکی ساڵی (١٩٣٣) کاتێك ڕوویدا کە ئەفسەری پۆلیس لەدەرگای پێشەوە هاتە ناو ماڵەکەو من لەدەرگای پشتەوە چوومە دەرەوە.

خانووەکەمم لەدەستدا کە لەلانگ ئایلەند، فارست هیلز، شەقامی (١٠)ی ستەندیش بوو. ئەو خانووە شوێنێك بوو کە منداڵەکانم تیایدا لەدایك ببوون و من و خێزانەکەم (١٨) ساڵ ژیانمان تیا کردبوو .هەرگیز بیرم نەدەکردەوە شتێکی ئاوام لێ ڕووبدات. دوانزە ساڵ لەوە پێش بیرم دەکردەوە لەسەر لووتکەی دنیا مەسکەنم گرتووە. من مافی دروستکردنی فیلمی ڕۆمانی ((ڕۆژئاوای بورجی ئاو))م بە نرخێکی زۆری هۆلیوود فرۆشتبوو. دوو ساڵ لەگەڵ خێزانەکەم لەدەرەوەی وڵات ژیانمان بردە سەر . هاوینمان لەسوتیزر لەندو زستانمان لەفرەنچ ریویرا دەبردە سەر، دروست وەکو دەوڵەمەندە بێکارەکان. شەش مانگمان لەپاریس بردە سەرو ڕۆمانێکم نووسی بەناوی ((ئەوان دەبوایە پاریسیان بدیبایە)). لەفیلمی دروستکراوی ئەم ڕۆمانەدا ویل ڕاجێرز ڕۆڵی دەگێڕا. ئەمە فیلمی دەنگداری ئەو بوو. پێشنیاری وروژێنەرم پێدەکرا کە لەهۆلیوود بمێنمەوەو چەند دانە لەفیلمەکانی ویل ڕاجێرز بنووسم. بەڵام من ئەم کارەم نەکرد. گەڕامەوە بۆ نیویۆرك و کێشەکانم دەستی پێکرد. بەرە بەرە هەستم کرد توانا گەلێکی خەوتوو لەمندا شاراوەیە کە هەرگیز پەروەردەم نەکردوون. کەوتمە خەیاڵ پڵاوی ئەوەی کە بازرگانێکی زیرەکم. یەك کەس بە منی وت جان جەکیب ئیستەر بە سەرمایە گوزاری لەسەر عەرزێکی بەتاڵ لەنیویۆرك ملیۆنەها دۆلار سوودی کردووە. ئیستەر کێ بوو؟ دەستفرۆشێکی گەڕۆك کۆچەری زمان چەوت. ئەگەر ئەو ئەیتوانی وابکات منیش ئەتوانم دەچووم هەتا دەوڵەمەند بم.

دەستم کرد بە خوێندنەوەی گۆڤاری دەریاوانی بە پاپۆڕی ئەهلی. شەهامەتی نەزانیم هەبوو. زانیاری من سەبارەت بەکڕین و فرۆشتنی عەرزەوملك زیاتر لەزانیاری ئیسکیمۆیەك دەربارەی چرای نەوت نەبوو. چۆن دەبوایە پارەی پێویستم بۆ دەستپێکردنی ژیانی داراییە شازەکەم بەدەست بهێنایە؟ ئاسان بوو، خانووەکەم خستە ڕەهن و چەند دانە لەباشترین بیناکانی فارست هیلزم کڕی. دەمویست بیانهێڵمەوە هەتا نرخیان دەچێتە سەرەوەو پاشان بیان فرۆشم و ژیانێکی شاهانە دەست پێبکەم. منێك کە هەرگیز ملکی گەورەتر لەپارچە کلێنسێکیشم نەفرۆشتووە. دڵم بۆ ئەو کەسانە دەسووتا کە لەفەرمانگەکاندا بۆ تۆزێك پارە عەوداڵ بوون. بە خۆمم دەوت خودا بە یەکسانی بۆ هەمووان لە ئاگری خودایی عەقڵی ئابووری نەبەخشیوە.

کوت‌وپڕ خەمێکی گەورە وەکو تۆفانی کونساس بەسەرمدا زاڵ بوو، وەکو گەردەلوولێك کە کولانەیەك دەلەرزێنێت منی بزواند. دەبوایە مانگانە(٢٢٠) دۆلارم لەو پارچە زەوییە بەناو چاکەدا خەرج بکردایە. ئاخ، چەندە ئەو مانگانە زوو دەڕۆیشتن. سەرەڕای ئەوە دەبوایە خەرجی ئەو خانووەیش کە ئێستا لەڕەهندا بوو، بمدایەو خۆراکی منداڵەکانیشم دابین بکردایە.نیگەران بووم. هەوڵمدا بابەتو داستانی گاڵتەجاڕی بۆ گۆڤارەکان بنووسم. هەولی من لەبواری بابەتی گاڵتە جاڕیدا زیاتر هاوشێوەی تەعزیە بوو. نەمدەتوانی هیچ بفرۆشم. ئەو ڕۆمانانەی دەمنووسی تووشی شکست دەبوون. پارەم لێبڕابوو. هیچم نەبوو قەرزی لەسەر وەرگرم لەئامێری تایپەکەم زیاترو ئاڵتوونی ناو ددانەکانم.کۆمپانیای شیر ئیتر شیری پێ نادایِن. کۆمپانیای غازیش غازەکەی بڕیبووین. ناچار بووین دانەیەك لەو تەباخە سەفەرییانە بکڕین کە پڕوپاگەندەیان بۆ دەکردن یەك پەمپی غازی هەیە، بەدەست پەمپی دەکەن‌و گڕێك بەدەنگی شێوە تووڕەوە لێی دێتە دەرەوە.

خەڵووزیشمان تەواو بووبوو، کۆمپانیا سکاڵای لەسەر تۆمار کردین. تەنیا گەرمکەرەوەی ئێمە دانەیەك شۆمینە بوو. شەوانە دەچوومە دەرەوە و لە تەختەو داری زیادی خانووی نوێی دەوڵەمەندەکانم کۆدەکردەوە...منێك کە خەریك بووم دەوڵەمەند دەبووم. ئەوەندە نیگەران بووم کە نەمەتوانی بخەوم. زۆربەی کات نیوە شەو هەڵدەستام‌و ئەوەندە بەڕێدا دەڕۆیشتم هەتا ماندوو ببم‌و بتوانم بخەوم. نەك هەر ئەو پارچە زەوییەی کڕیبووم لەدەستم دابوو بەڵکو تەواوی ئەو سەرمایەیش لەسەری دامنابوولەناو چوو. بانك ئەو ڕەهنەی داخست کە لەسەر خانووەکە دایِنابوو، من‌و خێزانەکەمی فڕێدایە سەر جادە.

بەسەختی توانیم چەند دۆلارێك دەست بخەم‌و پارتمانێکی بچووك بگرین بەکرێ. لەدوایین ڕۆژی ساڵی (١٩٣٣)دا ماڵم گواستەوە. لەسەر کارتۆنێك دانیشتبووم‌و سەیری ئەملاولام دەکرد ئەو ڕستەیەم هاتەوە بیر کە هەمیشە دایکم دەیوت: ((خەمی ئاوی ڕۆیشتوو مەخۆ)). بەڵام ئەوە ئاو نەبوو، هەموو سەرمایەکەی من بوو. لەپاش کەمێك دانیشتن لەوێ بە خۆمم وت: ((باشە، سەختیم چەشتووەو تەحەمولیشم کردووە، هیچ ڕێگەیەکم نیە بێجگە لەوەی بەرەو پێش بڕۆم)).

دەستم کرد بەبیر کردنەوە لەو شتانەی هێشتا ڕەهن لەمنی نەسەندبوو. هێشتا تەندروستی و هاوڕێکانم مابوو. دیسان دەست پێ دەکەمەوە. خەمی ڕابردوو ناخۆم. هەموو ڕۆژێك ئەو وتەیەی دایكم دەربارەی ئاوی ڕۆیشتوو دەڵێمەوە.

ئەو هێزو وزەیەی تەرخانی نیگەرانیم کردبوو دامنا بۆ کارکردن. بەرە بەرە وەزعم باشتر بوو. ئێستا شوکرانە بژێرم کە ناچار بووم ئەو داماوییە تێپەڕێنم، چونکە هێزی سەبرو بڕوا بەخۆبوونی دا بەمن. ئێستا مانای سەختی چەشتن دەزانم. دەزانم کە کوشندە نیە، دەزانم زیاتر لەوەی بیری لێدەکەینەوە توانای خۆ ڕاگریمان هەیە. کاتێك نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بچووکەکان ڕێگریم بۆ دروست دەکەن ئەو ڕستەیەی لەسەر کارتۆنەکە نووسیبووم و وتم ئەوانە لەخۆم دوور دەکەمەوەدێنمەوە یاد: ((سەختیم چەشتووە و تەحەممولیشم کردووە.هیچ ڕێگەیەکم نیە بێجگە لەوەی بەرەو پێش بڕۆم)).

گرنگ هەر ئەمەیە؟ هەوڵ مەدەن خۆڵی بەرمشار ببینن. شتی ناچاری وەرگرن. ئەگەر ناتوانن بەرەو دواوە بگەڕێنەوە، هەوڵ بدەن بەرەو پێشەوە بڕۆن.

## سەرسەختترین ڕکە بەرێك کە تائێستا شەڕم لەگەڵ کردووە نیگەرانی بوو

**نووسینی: جەك دێمپسی**

لەماوەی ئەو دەورانەی لەسەر ڕەینگ بووم بۆم دەرکەوت ئەو نیگەرانیە گەورەیە لەو بوکسێن کارە کێش قورسانەی تا ئێستا من ڕوو بەڕوویان بوومەتەوە، بەهێز ترە. تێگەیشتم دەبێ دەست لەنیگەرانی هەڵگرم ئەگەر نا زیان بە ژیانی من دەگەیەنێت و ڕێگر دەبێت لەبەردەم سەر کەوتنمدا. کەواتە بەرە بەرە بەرنامەیەکم بۆ خۆم داڕشت. لەژێر چەند دانە لەو کارانەی من ئەنجامم داوە هاتووە:-

١- بۆ ئەوەی لەسەر ڕینگ دڵ و شەهامەتم هەبێ، لەکاتی کێبەرکێدا قسەی وزەبەخشم لەگەڵ خۆم دەکرد. بۆ نموونە کاتێك ڕوو بەڕووی فیر پۆ بوومەوە بەردەوام بەخۆمم دەوت: ((هیچ شتێك بەرم پێ ناگرێت. ئەو ئازار بەمن ناگەیەنێت.هەست بە زەربەکانی ناکەم. نابێ ئازار ببینم. هەر شتێك ڕوویدات من درێژەی پێ ئەدەم)). وتنی قسەی پۆزەتیڤ بە خۆم و بیر کردنەوە لەشتی پۆزەتیف یارمەتیدەرێکی گەورە بوو بۆ

من. تەنانەت مێشکی ئەوەندە سەرگەرم ڕادەگرت کە هەستم بەزەربەکان نەدەکرد. لەماوەی ئەم دەورانەدا لێوەکانم لەت بوو، سووچی چاوم هەڵتەقی، ددانەکانم ورد بوو، فیرپۆ بەجۆرێك منی لەبەینی تەنافەکانەوە فرێدایە خوارەوە کە کەوتم بەسەر ئامێری تایپی ڕۆژنامە وانێکداو تێکم شکاند. بەڵام تەنانەت هەستم بەیەك دانە لە لێدانەکانی فیرپۆ نەکرد. شەوێك لیستەر جانسۆن سێ پەراسووەی شکاند. بۆکسی ئەو هەرگیز ئازاری نەدام، بەڵام کاری کردە سەر هەناسەدانم. ڕاستگۆیانە دەڵێم، هەرگیز هیچ زەربەیەکم وەکو ئەوە هەست پێ نەکردبوو.

٢- کارێکی تر کە ئەنجامم دا بیرهێنانەوەی بەردەوامی بێهودەیی و عەبەس بوونی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ بوو. زۆربەی نیگەرانیەکانی من لەپێش کێبەرکێ گرنگەکان و لەکاتی ئەنجامی ڕاهێناندا بوو. زۆربەی شەوەکان بەئاگابووم، لەجێگەکەمدا دەگەڕام و نیگەران بووم و نەمدەتوانی بخەوم. لەوە دەترسام نەوەکا لەڕاوندی یەکەمدادەستم بشکێت یان مەچەکی قاچم لەجێ بچێت یان چاوم بەجۆرێك خراپ هەڵتەقێت و نەتوانم بۆکسەکانم ڕێك بخەم. کاتێك خۆم لەوەهاحاڵەتێکی عەسەبیدا ئەبینیەوە لەجێگەکەم ئەهاتمە دەرەوەو لەئاوێنەدا سەیرێکی خۆمم ئەکردو شتی چاکم بەخۆم دەوت. دەموت: ((چەندە کەری کە نیگەرانی شتێکی کە هێشتا ڕووینەداوەو هەرگیزیش ڕوونادات. ژیان کورتە. تەنیا چەند ساڵێکی ترم بۆ ژیان ماوە، کەواتە دەبێ چێژی لێوەرگرم)).

بەردەوام بەخۆمم دەوت: ((هیچ شتێك لەتەندروستیم گرنگتر نیە. هیچ شتێك لەتەندروستیم گرنگتر نیە)). بیری خۆمم دەهێنایەوە کە بێخەوی و نیگەرانی بۆ تەندروستیم زیانبارە. بۆم دەرکەوت بەوتنی بەردەوامی ئەم شتانە بەخۆم هەر شەو و هەر ساڵێك، سەرەنجام چوونە ژێر پێستم و دەمتوانی نیگەرانیەکانم بشۆمەوەو ڕزگارم بێت.

٣- سێهەمین و باشترین کارێك کە ئەنجامم دا دۆعاو پاڕانەوە بوو. کاتێك خۆم بۆ کێبەرکێیەکی گرنگ ئامادە دەکرد چەندین جار لەڕۆژدا دۆعام دەکرد. کاتێك لەناو ڕینگدا بووم لەپێش لێدانی جەرەسدا بۆ هەر ڕاوندێك دۆعام دەکرد. ئەمە یارمەتی منی دا بە شەهامەت و بڕوا بەخۆ بوونەوە یاری بکەم. هەرگیز بەبێ دۆعا نەخەوتووم و

هەرگیز لەپێش سوپاسگوزاری خوادا نانم نەخواردووە. ئایا وەڵامی دۆعاکانم دراوەتەوە؟ هەزاران جار.

## داوام لەخودا کرد نەچم بۆ هەتیوخانە

نووسینی: کەتلین هاڵتەر.

ژنی ماڵەوە. خەڵکی میسۆری. یونیوەرستی (١٤)، ڕاس (١٠٧٤).

کاتێك منداڵ بووم سەراسەری ژیانم ترس و نیگەرانی بوو. دایکم نەخۆشی دڵی هەبوو. هەموو ڕۆژێك ئەمبینی ئەبووڕایەوەو ئەکەوتە سەر زەوی. هەموومان دەترساین بمرێت و من دەمزانی هەموو ئەو کچانەی دایکیان دەمرێت دەنێردرێن بۆ هەتیوخانەی سەنتراڵ وەسلین کە لەشاری بچووکی وارنتۆن لەویلایەتی میسۆری بوو. ئەو شوێنەی ئێمە لێی دەژیاین. من ترسم لەبیرکردنەوە لەوێ هەبوو، کاتێك شەش ساڵان بووم هەمیشە دۆعام دەکرد: ((خودای من، تکات لێدەکەم بهێڵە دایکم زیندوو بمێنێت هەتا من گەورە دەبم و نەچم بۆ هەتیوخانە)).

بیست ساڵ دوای ئەوە ماینەری برام پێکانێکی سەختی بینی و ئازاری زۆری کێشا و دوو ساڵ دوای ئەوە مرد. نەیدەتوانی خۆی خواردن بخوات یان لەجێگەدا ئەملاولا بکات. بۆ لەبەین بردنی ئازاری ئەو ناچار بووم شەوو ڕۆژ هەرسێ کاتژمێر جارێك دەرزی مۆرفینی لێبدەم. دوو ساڵ ئەم کارەم ئەنجامدا. هەر لەو کاتەدا لەکۆلێجی سەنتراڵ وەسلینی شاری وارنتۆنی ویلایەتی میسۆری وانەی مۆسیقام دەوتەوە. کاتێك دراوسێکان دەنگی ناڵە ناڵی براکەمیان دەبیست تەلەفۆنیان بۆ من دەکردو منیش وانەی مۆسیقام بەجێ دەهێشت و خێرا دەهاتمەوە بۆ ماڵەوەو دەرزییەکەم لێ ئەدا. هەموو شەوێك کاتێك دەمویست بخەوم کاتژمێرەکەم دەخستە سەر جەرەس هەتا سێ کاتژمێری تر جەڕەس لێبدات و خەریکی براکەم بم. لەبیرمە شەوانی زستان شوشە شیرێکم لەپشتی پەنجەرەکەوە دادەنا هەتا ببەستێت و وەکو جۆرێك ئایس کریمی لێدەهات کە من زۆرم حەز لێی بوو. کاتێك جەرەس لێدەدرا ئەم ئایس کرێمە ورەیەکی زیاتری بۆ هەستان ئەدا بە من. لەم ناوەدا دوو کارم ئەنجامدا کە منی لەزیادە ڕەوی لەدڵسووتان بۆ خۆم و نیگەرانی و تاڵکردنی ژیانم گەڕاندەوە.

یەکەم، خۆمم بە ڕۆژی (١٢ تا ١٤) کاتژمێر وانە وتنەوەوە سەر گەرم دەکرد، کەواتە کاتی کەمم بۆ بیرکردنەوە لەسەختیەکان هەبوو. کاتێك بۆ

داخ هەڵکێشان وەسوەسە دەبووم بەخۆمم دەوت: ((گوێ بگرە، تا کاتێك دەتوانی بەڕێدا بڕۆیت و نان بخۆیت و ئازارت نەبێت، دەبێ شادترین کەسی سەر زەوی بیت. هەر شتێك هەیە باڕووبدات، هەرگیز تا کاتێك زیندووی فەرامۆشی مەکە! هەرگیز! هەرگیز!)).

پشت ئەستوور بووم هەرچی لەتوانامدایە بیگرمە بەر تاکو هەمیشە شوکرانە بژێری ئەو نیعمەتانەبم کە هەمە. هەموو بەیانیەك کاتێك لەخەو هەڵدەستام شوکری خودام دەکرد کە دەتوانم لەجێگەکەم هەستم و خۆم ناشتای خۆم بخۆم.. بەسەختی بڕیارمدا بوو بەختەوەرترین کەس بم لە وارنتۆن میسۆری. لەوانەیە لەگەیشتن بەم ئامانجە سەرکەوتوو نەبووبم، بەڵام دەتوانم خۆم بکەم بەشوکرانە بژێرترین ژنی گەنج لەناو شاری لەدایك بوونمداو لەوانەیە ژمارەیەکی کەم لەهاوکارەکانم کەمتر لەمن نیگەرانیان هەبێت.

ئەم مامۆستای مۆسیقایەی میسۆری دوو بنەمای خستەکار کە لەم کتێبەدا هاتبوون: ئەوەندە خۆی سەرقاڵ دەکرد کە دەرفەتی بۆ نیگەرانی نەبوو، شوکرانە بژێری نیعمەتەکانی بوو. هەر ئەم ڕەوشە دەتوانێت یارمەتی دەری ئێوەیش بێت.

## وەکو ژنێکی پڕ شەوق و وزە هەڵس و کەوتم دەکرد

نووسینی: کە مرۆن شیپ

نووسەری گۆڤاری، کالیفۆرنیا، گلەندیلی(٢)، جادەی کۆنس(٧١٥)

چەندین ساڵ بوو بە شەوق و ڕەزامەندییەوە کارم بۆ بەشی پڕوپاگەندەی ستۆدیۆی برایانی وارنەر دەکرد لەکالیفۆرنیا. فەرمانبەری بەش بووم و نووسینی سەروتار. داستان گەلێکم لەئەستێرەکانی برایانی وارنەر دەنووسی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان. لەپڕ پلەم بەرزبووەوە و بوومە جێگری بەرپرسی بەشی پڕوپاگەندە. لەو کاتەدا لەسیاسەتی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەشدا ئاڵوگۆڕێك ڕویداو من نازناوێکی باشم وەرگرت: بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی نووسینگەیەکی زۆر گەورە بەفڕگەی تایبەت و دوو سکرتێرو بەرپرسیاریەتی حەفتاو پێنج نووسەرو فەرمانبەرانی ڕادیۆیان دا بەمن. زۆر کەوتبوومە ژێر کاریگەری. سەرەتا چووم و دەستێك جلی تازەم کڕی. هەوڵم ئەدا بە ئەدەب و هێمنی قسە بکەم ، سیستەمەکانی ئەرشیفم ڕێك دەخست، بڕیاری بەهێزم دەگرت و نانی نیوەڕۆم بەپەلە دەخوارد.

ڕازی ببووم کە هەموو سیاسەت و کاروباری بەشی پەیوەندی برایانی وارنەر لەسەر شانی منە. پێموابوو ژیانی تایبەت و کۆمەڵایەتی کەسانێکی ناوداری وەکو بەس دەیویست، ئەلیولا داهاویلەند، جیمز کەنگی، ئیدوارد جی رابینسۆن، ئەرۆڵ فلین، هامفەری بۆگارت، ئان شریدان، ئالەکسیس سمیت و ئالەن هیلّ بەتەواوی لەدەستی مندایە. لەماوەی کەمتر لەیەك مانگدا تێگەیشتم کە برینی گەدەم هەیە، دوور نیە شێرپەنجەشم هەبێت.

چالاکی شەڕی سەرەکی من لەوکاتەدا سەرۆکایەتی کۆمیتەی چالاکیەکانی شەڕی ئەنجومەنی و تەبێژانی سینەما بوو. ئەنجامدانی ئەم کارەم پێ خۆش بوو. چێژم لەبینینی هاوڕێکانم لەکۆبوونەوەکانی ئەنجوومەن وەردەگرت، بەڵام ئەم کۆبوونەوانە کێشەیان دروست کرد. لەپاش هەر کۆبوونەوەیەك بەسەختی نەخۆش دەکەوتم. زۆر ناچار بووم لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە ئۆتۆمبێلەکەم بوەستێنم و کاتێك تۆزێك هاتمەوە سەر حاڵ، بکەومەوە ڕێ. وامدەزانی کاری زۆرم هەیە بۆ ئەنجامدان و کاتم کەمە. هەمووی زۆر گرنگ بوو، لە توانای مندا نەبوو. ڕاستگۆیانە دەیڵێم، ئەمە پڕ دەردترین نەخۆشی تەواوی تەمەنم بوو. هەمیشە مشتێکی گرێدراو لەئەندامەکانی ژیانمدا هەبوو. کزولاواز کەوتم، دوچاری بێ خەوی ببووم و دەرد بۆ من ببووە هەمشەیی.

کەواتە چووم بۆلای پزیشکێکی پسپۆڕی هەناو. فەرمانبەرێك ناونیشانی پێدابووم. ئەو وتی ئەم پزیشکە نەخۆشی زۆری هەیە کە هەموویان لەکاری پڕوپاگەندەدان. پزیشکە کە زۆر بەکورتی قسەی کرد تەنیا ئەوەندەی بەو بڵێم کوێم ئەیەشێت و وەزعی ژیانم چۆنە. وادەردەکەوت زیاتر ئارەزوومەندی پیشەی منە هەتا نەخۆشیەکەم و زۆر زوو لەمە دڵنیا بووم. ماوەی دوو حەفتە هەموو ڕۆژێك

پشکنینێکی ناسراوم ئەنجام ئەدا. منیان خستەبەر تاقیکردنەوەو وێنەو فلۆر سکۆپ. لەئەنجامدا بەمنیان وت بچمەوە بۆلای دوکتۆر هەتا بڕیاری کۆتایی دەرکات.

لەحاڵێکدا پاڵی دابووەوەو جگەرەیەکی بۆ من هێنا پێشەوە وتی: ((بەڕێز شیپ، ئەم پشکنینە تاقەت پڕوکێنانەمان گەیاندە کۆتایی. سەرەڕای ئەوەی لەپاش پشکنینی سەرەتایی تێگەیشتم کە برینی گەدەت نیە، بەلاّم تەواوی ئەمانە زۆر پێویست بوو. ئەوەم دەزانی لەبەر کەسایەتیەك کە هەتانەو ئەو جۆری کارەی هەتانە تا خۆتان نەیبینن بڕوابە قسەکەم ناکەن. باپیشانتان بدەم. کەواتە خشتەکانو وێنەکانی پیشانی منداو شی کردەوە. پیشانیدا کە هیچ برینی گەدەم نیە. پاشان وتی: ((ئەمە خەرجی زۆری هەیە بۆت، بەلاّم لەبەر خۆت دەیهێنێت. ئەمەیش لەدەواو دەرمان. نیگەران مەبە)). هەر دەستم کرد بەقسەکردن وتەکەی پێ بڕیمو وتی: ((وادیارە ئێستا ناتوانی خێرا سوود لەم پسوڵەیە وەربگریت، کەواتە دار دەستێکت پێ ئەدەم. چەند دانە حەبە، ئەمە حەبی ئاترۆپینە. چەند دانە حەزدەکەیت هەڵگرە. کاتێك ئەمانەت بەکارهێناو تەواو بوو وەرە تا دیسان پێت بدەم. زیانی نیە بۆت، بەلاّم هەمیشە ئارامت ئەکاتەوە. ئەڵبەت لەبیرت نەچێت کە پێویستت بەمانە نیە. تەنیا کارێك کە دەبێ بیکەیت ئەوەیە کە نیگەرانیو دڵەڕاوکێ تەرك بکەیت. ئەگەر دیسان نیگەران بوویت ناچاری بێیتەوە بۆلامو ئەمجارە من پارەی زیاترت لێ وەردەگرم. چۆنە؟)).

خۆزگە دەمتوانی کاریگەری ئەو دەرسە هەر ئەو ڕۆژە بنووسمو ئەوەی کە ئەو ڕۆژە دەبوایە خێرا نیگەرانیم وەلاوە بنایە، بەلاّم ئەم کارەم نەکرد. چەندین حەفتە کاتێك هەستم دەکرد نیگەرانی لەڕێدایە سوودم لەو حەبانە وەردەگرت، زوو کاریگەرییان دادەناو کتوپڕ حاڵم باشتر دەبوو. بەلاّم بەخواردنی ئەو حەبانە هەستم بەکەریەتی دەکرد. من پیاوێکی گەورەم. کەمو زۆر بەلاّم بە ئەندازەی ئابراهام لینکۆڵن و (٢٠٠) پۆند کێشم هەیە. سەرەڕای ئەوە حەبی وردی سپیم دەخوارد هەتا خۆم ئارام بکەمەوە. وەکو ژنێکی هیستریك هەڵسو کەوتم دەکرد. کاتێك هاوڕێکانم هۆکاری خواردنی حەبەکەیان لێ دەپرسیم، شەرمم لەوتنی ڕاستی دەکرد. بەرە بەرە دەستم کرد بە پێکەنین بەحاڵی خۆم. وتم: ((سەیرکە کەمرۆن شیپ، خەریکی وەکو کەر هەڵسو کەوت دەکەیت. خۆتو کارەکانت زۆر بەجیدی دەگری. بەس دەیویست،

جیمز كەنگی وئیدوارد جی-رابینسۆن زۆر پێش لەوەی تۆ كۆنترۆڵی ناوبانگی بەدەستەوە بگری ناو بانگیان هەبووەو ئەگەر تۆ ئەمشەو بمری، برایانی وارنەرو ئەستێرەكانی دەتوانن بەبێ بوونی تۆ درێژە بەكارەكانیان بدەن. سەیری ئایزنهاوەر، ژەنراڵ مارشاڵ، مەك ئارتۆر، جیمی دۆلتیلو ئەدمیراڵ كینگ بكە، ئەوان شەڕ بەبێ خواردنی حەب بەرەو پێش دەبەن. ئەو كاتە تۆ ناتوانی سەرۆكایەتی كۆمیتەی چالاكیەكانی شەڕی ئەنجومەنی وتە بێژانی سینەما بەبێ بەكارهێنانی حەبی سپی بچووك كە بەر لەپێچ و جوولآنی گەدەت دەگرن كە وەكو گەردەلوولی كەنساس وایە، ئەنجام بدەیت)).

بەرە بەرە بەگوزەران بەبێ حەبەكان شانازیم بەخۆمەوە دەكرد. ماوەیەك دوای ئەوە حەبەكانم ڕشتە ناو ئاودەستو هەموو شەوێك لەكاتی خۆیدا دەگەڕامەوە بۆماڵەوە هەتا لەپێش خواردنی ئێوارەدا تۆزێك بخەوم و بەرە بەرە توانیم ژیانی ئاساییم بەرەو پێش بەرم. هەرگیز نەچوومەوە بۆ بینینی ئەو پزیشكە، بەڵام زۆر مەمنوونی ئەوم. زۆر زیاتر لەو پارەیەی لەو كاتەدا دەبوایە بمدایە . ئەو فێری كردم بەخۆم پێبكەنم. بەڵام پێموایە زیرەكانەترین كارێك كە كردی ئەوە بوو كە بەر لەخۆی بگرێت كە بەمن پێبكەنێتو بەمن بڵێت هیچ شتێك بۆ نیگەران كردنی من بوونی نیە . ئەو منی بە جیدی گرتو ئابڕووی منی پاراست. ڕێگەیەكی دەرچوونی لەسندووقێكی بچووكدا پیشانی مندا . بەڵام هەروا كە ئێستا دەزانم ئەویش دەیزانی چارەسەرەكە لەو حەبە بێ مانایانەدا نەبوو، بەڵكو لەگۆڕانێك لەڕوانگەی عەقڵی مندابوو.

ئەنجامی ئەخلاقی ئەم دەرسە ئەوەیە كە زۆرێك لەوكەسانەی ئێستا حەب دەخۆن لەبابەتی دووەم لەبەشی سێهەمی ئەم كتێبە بخوێننەوە، حاڵیانباشتر دەبێ و ئارام دەبنەوە.

## بەسەیر کردنی هاوسەرەکەم لەکاتی قاپ شۆردندا فێربووم ئیتر نیگەران نەبم

**نووسینی: ڕۆرەند ویلیام وود**

**میشیگان، چارلویکس، شەقامی هیرلبۆت (٢٠٤).**

چەند ساڵ لەمەوبەر ئێشێکی زۆر لەگەدەمدا ئازاری ئەدام. هەموو شەوێك دوو یان سێ جار بەهۆی ئازاری زۆرەوە لەخەو هەڵدەستام. من شایەتی ئەوە ببووم کە باوکم بەهۆی شێرپەنجەی گەدەوە مردبوو، دەترسام خۆیشم تووشی شێرپەنجە بووبم یان لانی کەم برینی گەدەم هەبێت. کەواتە بۆ پشکنین چووم بۆ کلینکێك. پزیشکێکی بەناوبانگی گەدە بەفلۆرسکۆب پشکنینی بۆ کردمو وێنەی لەگەدەم هەڵگرت. ئەو چەند دەواو دەرمانێکی پێدام کە بتوانم بخەومو دڵنیای کردمەوە کە برینی گەدە یان شێرپەنجەم نیە. ئەو وتی ئازاری من بەهۆی فشاری سۆزدارییەوەیە. بەهۆی ئەوەی من قەشەم یەکێك لەیەکەم پرسیارەکانی ئەوە بوو کە: ((ئایا لەکلێسا کارتان زۆرە؟)).

ئەوەی دەمزانی پێی وتم من زۆرم کار دەکرد. سەرەڕای مەوعیزەی ڕۆژانی یەك شەممەو لەئەستۆ گرتنی کارە جۆراو جۆرەکانی کلیسا، بەرپرسی خاچی سوورو کیوانیسیش بووم. سەرەڕای ئەوە هەر حەفتەی دوو یان سێ جار ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنم ئەنجام ئەداو چەندین کاری تریشم هەبوو.

من لەژێر فشاری بەردەوامدا کارم دەکرد، هەرگیز حەسانەوەم نەبوو، هەمیشە نیگەران، عەسەبیو بەپەلەبوومو گەیشتمە شوێنێك کە نیگەرانی هەموو شتێك بووم. لەنیگەرانیو دوو دڵیەکی هەمیشەییدا دەژیام. لەوەها ڕەنجێکدا ژیانم دەبردە سەر کە بەشادمانییەوە گوێم بۆ ئامۆژگارییەکانی پزیشك گرت.هەموو حەفتەیەك دوو شەممانم کردبە پشوو، دەستم کرد بەلابردنی چالاکیو بەرپرسیارەتیە جۆراو جۆرەکان. ڕۆژێك لەکاتی خاوێن کردنەوەی مێزی کارەکەمدا فیکرم لەمێشکمدا دروست بوو کە زۆر کاریگەر بوو. سەرگەرمی پیاچوونەوەی هەندێك لەنووسراوەی وتارەکانو نووسراوە تایبەتەکانی خۆم کە ڕۆیشتبوون، بووم. لەپڕ وەستامو بەخۆم وت: ((بیل بۆ چی هەر ئەم کارە لەگەڵ نیگەرانیو قەلەقیەکانت؟ بۆچی نیگەرانیەکی پەیوەندیدار بە کێشەکانی دوێنێ فڕێنادەیتە ناو خۆڵەوە؟)) هەر ئەو فیکرە

ئیلهامێکی لەپڕی لەمندا دروست کرد، هەستم کرد بارێکی گران لەسەر شانم هەڵگیراوە. لەو ڕۆژەبەدواوە یاسایەکم دروست کرد کە تەواوی ئەو کێشانەی ناتوانم کارێکیان بۆ بکەم، فڕێیاندەم.

پاشان کاتێک ڕۆژێ هاوسەرەکەم قاپەکانی دەشۆرد لەکاتی وشک کردنەوەیاندا فیکرێکی تر هاتە مێشکم. هاوسەرەکەم لەکاتی شۆردنی قاپەکاندا گۆرانی دەوت و من بەخۆمم وت: ((سەیرکە بیل، ئەو چەندە شادمانە. هەژدە ساڵە هاوسەرگیریمان کردووەو ئەو تەواوی ئەم ماوەیە قاپەکانی شۆردووە وای دابنێ کاتێک دەمانویست هاوسەرگیری بکەین ئەو سەیری ئەم هەژدە ساڵەی پێش دەمی و هەموو ئەو قاپانەی دەبوایە لەم ساڵانەدا بیشۆردایە، دەکرد. قەڵای ئەو قاپە پیسانە گەورەتر بوو لە عەمبارێکی گەورە. تەنانەت فیکرەکەیشی هەر ژنێك پڕ دەکات لەترس و بێزاری.

کەواتە بەخۆمم وت: ((هۆی ئەوەی هاوسەرەکەم گرنگی نادات بە شۆردنی قاپەکان ئەوەیە کە ئەو تەنیا قاپی یەك ڕۆژ هەموو جارێك دەشوات)).

تێگەیشتم. گرفتی من چیە من هەوڵم ئەدا قاپی ئەمڕۆو دوێنێ و ئەو قاپانەی هێشتا پیس نەبوون بشۆم. تێگەیشتم چەند نا ژیرانە بیرم کردووەتەوە. بەیانیانی یەك شەممە لەسەر مینبەر دەوەستام و بەخەڵکم دەوت چۆن ژیان بکەن، بەو حاڵەوە خۆم ژیانی پڕ لەنیگەرانی و پەلەپەل و فشاری عەسەبیم دەبردە سەر. شەرمم لەخۆم دەکرد.

نیگەرانی و دڵەڕاوکێ چیتر من ئازار نادەن. چیتر ژانی گەدەم نیەو بێ خەوییەکەم ڕەویوەتەوە. ئێستا نیگەرانیەکانی دوێنێ کۆ دەکەمەوەو فڕێی ئەدەم. ئیتر هەوڵ نادەم قاپی پیسی بەیانیش بشۆم.

ئەو ڕستەیەی لەوەپێش لەم کتێبەدا هاتووە لەیادتان ماوە؟ ئەگەر باری بەیانی بخرێتە سەر باری ئەمڕۆو ئەمڕۆ هەڵگیرێت گەورەترین لەرزین دروست دەکات....بۆچی تەنانەت تاقیشی بکەینەوە؟ (بگەڕێینەوە بۆ بابەتی یەکەمی بەشی یەکەم)

## وەلامەکەمم وەرگرتەوە

**نووسینی: دیل هیوز**

**میشیگان، بی سیتی، شەقامی یوکلیدی باشووری (٦٠٧)، حیسابداری حکومی.**

سالی (١٩٤٣) بەسێ پەراسووی شکاوو سیەکی کونەوە لەنەخۆشخانەیەکی بەناوبانگ لە ئەلبۆکرکۆی نیو مەکسیکۆ هاتمە خوارەوە. ئەم ڕووداوە لەکاتی ڕاهێنانی نیشتنەوەی ئانجاکی دەریایی دوور لەدوورگەکانی هاوایی ڕوویدا. لەحاڵی ئامادە بووندا بۆ پەڕین لە ڕووی بەلەمێکەوە بۆ کەنار ئاو بوو کە شەپۆلێکی گەورەهات و بەلەمەکەی هەڵگەڕاندەوەو منی فڕێدا بۆ سەرلمەکان. وەها بە توندی کەوتم کە یەکێك لەپەراسووە شکاوەکانم سی لای ڕاستمی کون کرد.

لەپاش سێ مانگ لەنەخۆشخانە گەورەترین شۆکی ژیانم دروست بوو. پزیشکەکان بە منیان وت هیچ پێشکەوتنێکم دیار نیە. لەپاش بیرکردنەوەیەکی قووڵ بینیم نیگەرانی من لەچاکبوونەوە دەگێڕێتەوە. من ژیانێکی زۆر چالاکم هەبوو، لەماوەی ئەم سێ مانگەدا بیست و چوار کاتژمێری شەوو ڕۆژ لەسەر پشت خەوتبووم و هیچ کارێکم لەبیر کردنەوە زیاتر نەبوو. هەرچی زیاتر بیرم دەکردەوە نیگەرانتر دەبووم. نیگەران لەوەی ئایا دەتوانم دیسان پێگەی خۆم لەدنیادا بگرمەوە. نیگەرانی ئەوە بووم ئایا باقی تەمەنم ئیفلیج دەبم، یان دەتوانم هاوسەر گیری بکەم و ژیانێکی ئاساییم هەبێت. دوکتۆرەکەمم ناچار کرد بمگوێزێتەوە بۆ بەشی سەرەوە کە ناوی ((یانەی وەرزشی سەرگەرمی)) بوو، چونکە نەخۆشەکان ڕێگەیان پێدرابوو هەر کارێك پێیان خۆشە بیکەن.

لەم بەشە((یانەی وەرزشی سەرگەرمی)) ئارەزوومەندی یاری بریج بووم. شەش حەفتەم بۆ فێربوونی یارییەکە تەرخان کردو لەگەڵ هاوڕێیاندا یاریم دەکردو کتێبەکانی کالبرستۆنم دەربارەی بریج دەخوێندەوە. لەپاش شەش حەفتە کەم و زۆر هەموو دوانیوەڕۆیانم لەماوەی مانەوە لەنەخۆشخانە بەیاری دەبردە سەر. هەروەها بوومە ئارەزوومەندی وێنەکاری بەزەیت و هەموو ڕۆژێك لەکاتژمێر(٣وە بۆ٥) لەژێر دەستی مامۆستایەکی شارەزادا فێری ئەم هونەرە بووم. هەندێك لەوێنەکاریەکانم هێندە باش بوون کە ئێوە کەم تا کورتێ دەتانتوانی ناو نیشانی فلانی سەرخەن!

هەروەها هەوڵی فێربوونی هەڵکەندنی سەر دارو سابوونم داو چەندین کتێبم لەم بوارەدا خوێندەوەو سەرنج ڕاکێش هاتە بەرچاوم. ئەوەندە خۆمم سەرقاڵ دەکرد کەکاتم بۆ نیگەران بوون دەربارەی وەزعی جەستەییمەوە نەبوو. تەنانەت چەند کتێبێکیشم دەربارەی دەروونناسی خوێندەوە کە خاچی سوور پێی دابووم. لەکۆتایی سێ مانگدا هەموو کادێرانی پزیشکی هاتن بۆلام و بەهۆی ئەو پێشکەوتنانەی کرد بووم پیرۆزباییان لێکردم. ئەوان خۆشترین وشەگەلێك بوون کە لەکاتی لەدایك بوونمەوە بیستبووم. حەزم ئەکرد لەشەوقدا هاوار بکەم.

خاڵێك کە دەمەوێ بیڵێم ئەمەیە: کاتێ هیچ کارێکم زیاد لەڕاکشان بەپشتداو نیگەران بوون دەربارەی داهاتوو نەبوو هیچ پێشرەفتێکم نەبوو. لەشم بە نیگەرانیو دڵەڕاوکێ ژەهراوی دەکرد. تەنانەت پەراسووە شکاوەکانیشم دەرمان نەدەبوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەی فیکرم بە یاری بریج، وێنەکاریو هەڵکەندنی سەردار ئازاد کرد، پزیشکەکان ڕایانگەیاند پێشکەوتنێکی بەرچاوم بینیوە. ئێستا ژیانێکی تەندروستو ئاساییم هەیەو سیەکانم وەکو سیەکانی ئێوە چاکە.

لەبیرتان بێت جۆرج بەرناردشۆ ووتی چی؟ ((ڕەمزی بەدبەختی ئەوەیە کە کاتی خۆتان تەرخانی ئەوە بکەن کە ئایا بەختەوەرن یان نا؟ چالاکبن، سەرگەرمبن)).

# کات و زەمان زۆربەشت چارەسەر دەکات

نووسینی: لویس تی مۆنتانت و جونیۆر
ڕاهێنەری بازاڕو فرۆشتن. نیویۆرک. شەقامی(٦٤)ی ڕۆژئاوا. (١١٤).

نیگەرانی بووە هۆی ئەوەی دە ساڵ لەژیانم لەکیس بچێت و تاڵ بێت.ئەوە دە ساڵە دەیتوانی پڕ بەهاترین و بەپیت ترین ساڵەکانی ژیانی هەر پیاوێکی گەنج بێت. ساڵانی هەژدە تا(٢٨) ساڵی.

ئێستا دەزانم کە لەدەستدانی ئەو ساڵانە تاوانی کەس نەبوو لەخۆم زیاتر. من نیگەرانی هەموو شتێك بووم، کارەکەم، تەندروستیم ، خێزانەکەم و هەستی خۆ بەکەم زانین. ئەوەندە دەترسام کە بەسەر جادەدا دەڕۆیشتم هەتا ڕوو بەڕووی ئەو کەسانە نەبمەوە کە دەمناسین. کاتێك ناسراوێکم لەبازاڕ ئەبینی زۆربەی جار وایپیشانم ئەدا کە ئاگام لێی نەبووە، چونکە دەترسام کەم بایەخ بکرێم.

زۆر لەدیداری کەسانی نەناسراو دەترسام. ئەوەندە لەلایان دەترسام کە لەماوەی دوو حەفتەدا سێ هەلی کارم تەنیا بەهۆی ئەوەی نەمدەوێرا بە خاوەن کارەکانی داهاتووم بڵێم چی دەزانم، لەدەستچوو.

سەرەنجام هەشت ساڵ لەمەوبەر دوانیوەڕۆیەك بەسەر نیگەرانیدا سەرکەوتم و لەوە بەدواوە بەکەمی نیگەران بووم. ئەو ڕۆژە عەسر لەنووسینگەی پیاوێك بووم کە زۆرتر لەمن کێشەی هەبوو، بەڵام بەو حاڵەیشەوە شادترین و پڕوزەترین پیاوێك بوو کە دەمناسی.لەساڵی (١٩٢٩)دا زۆری دەست کەوتبوو، تادوا دۆلاری لەدەستدابوو. دیسان لەساڵی (١٩٣٣)دا دەوڵەمەند ببوو، دیسان هەموو شتێکی لەدەستدابوو. جارێکی تر سەروەتێکی گەورە لەساڵی (١٩٣٧)و لەدەستدانی. هەروا شکستی زۆری بەسەر هاتبوو، کەوتبووە بەر ئازاری دوژمنان و خاوەن قەرزەکانی. کێشەگەلێك کە هەر پیاوێکی تێکدەشکاندو ئەوی بۆ خۆ کوشتن هاندەدا، وەکو ئاوێك کە مراوییەك دەگرێتەوە دەوری ئەویاندابوو. ئەو ڕۆژە هەشت ساڵ لەمەوبەر هەروا کە لەنوسینگەکەیدا دانیشتبوم، خۆزگەم بۆ حاڵی ئەو دەخواردو ئاواتم دەخواست خودا منیشی وەکو ئەو دروست بکردایە. هەروا کە قسەمان دەکرد نامەیەك کە ئەو بەیانییە وەریگرتبو فڕێیدا بۆ من و وتی: بیخوێنەرەوە. نامەکە بە حاڵەتێکی تورەوە بوو، چەند

پرسـیارێکی ناخۆشـی هێنـابووه پێـشەوە. ئەگـەر مـن نامەیـەکی وەهـام بەدەسـت بگەیشتایە بێگومـان تێـك دەچـووم. وتم: (بیل، چۆن وەلامـی دەدەیتـەوە؟) بیل وتـی: (نهێنییەکی بچوکت پێ دەڵێم. جارێکیتر کە نیگـەرانیت بۆ هاتـە پێشەوە قەڵـەمێك و کاغـەزێك هـەڵگرە، دانیـشەو بـە وردەکـاری تـەواوەوە بینوسـە چ شـتێك تـۆی قەلـەق کـردووە. پاشـان بیخـەرە چـەکمەجەی خـوارووی لای راسـتی مێـزی کارەکـەت. چـەند هەفتە ئارام بگرەو پاشان سـەیری بکە. ئەگـەر ئـەو شتەی نوسیوتە هێشتا بێتاقەتت دەکـات کاتێـك دەیخوێنیتـەوە، دیـسان بیخـەرەوە هـەمان چـەکمەجەی خـوارووی لای راست. با دوو هەفتەیتر لەوێدا بێت. جێگەکەی پارێزراوەو هیچی بەسەر نایەت. بەلام هـەر لـەم مـاوەدا لەوانەیـە زۆر شـت بـۆ ئـەو نیگەرانییـە ڕووبـدات کـە تـۆی نیگـەران کردووە. من بۆم دەرکەوت ئەگەر تەنیا خۆڕاگربم ئەو نیگەرانیەی هەوڵدەدات من ئازار بدات وەکو میزەڵان کون دەبێت و هەڵدەوەشتێت.

هـەر ئـەو پەنـدە کاریگـەریی زۆری لەسـەر مـن دانـا. چـەند سـاڵە ئـەم وتەیـەی بیل دەگرمە کارو لەئەنجامدا بەکەمی نیگەرانی ڕووی تێکردووم.

زەمـان زۆر شـت چارەسـەر دەکـات. زەمـان تەنانـەت دەتوانێـت ئـەو شـتەی ئـەمڕۆ نیگەرانیت، لەناوببات.

## هۆشیارییان پێدام نەك هەر قسەنەکەم بەڵکو تەنانەت پەنجەکانیشم نەجوڵێنم.

**نوسینی: ژۆزێف ئەلرایان**

چەندین ساڵ لەمەوبەر شایەتی کێشەیەکی یاسایی بووم کە فشارێکی عەصەبی و نیگەرانییـەکی زۆری بـۆ دروسـت کـردم. لـەپاش ئـەوەی کێـشەکە تـەواو بـوو، بەشەمەندەفەر دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، لەپڕ لەسەر هۆش چووم. دوچاری نەخۆشـی دڵ بـووم و تەنانـەت هەناسەکێـشانم بـۆ سـەخت بـوو. کاتێـك گەیـشتمە ماڵـەوە دکتـۆر دەرزییەکی لێدام. نەچوبومە نـاو جێگەکـەم، چونکە نەمـدەتوانی لەقەنەفـەی ژووری دانیشتن زیاتر بڕۆم. کاتێك دوبارە سەرخۆکەوتم بینیم کە قەشـەی گەڕەکەکـەمان بۆ داوای لێبـوردەیی کـردن لـەوێبو. خـەمێکی تێکـەڵ بەسـەر سـوڕمانم لەڕوخـساری

ئەندامانی خێزانەکەمدا بینی. دەمزانی ئەجەلم هاتووە. لەپاش ماوەیەك بۆم دەرکەوت دکتۆر هاوسەرەکەمی ئاگادار کردبوو کە لەپاش نیو کاتژمێر دەمرم. دڵم ئەوەندە لاواز بوبو کە هۆشیارییان پێدام هەوڵبدەم قسە نەکەم یان تەنانەت پەنجەیەکیش نەبزوێنم. هەرگیز قەشە نەبووم بەڵام فێر بووبووم دەمەقاڵە لەگەڵ خودا نەکەم. کەواتە چاوم بەستو وتم: (کارت گەیشتە کۆتایی ئەگەر ئێستا کاتی گەیشتبێت کەواتە کارت تەواوە).

لەگەڵ ئەوەی تەسلیمی ئەم فیکرە بووم وامزانی ئارام بوومەوە ترسم لەناوچوو، بە ئارامی پرسیارم لەخۆم کرد: (ئێستا خراپترین شتێك دەشێ ڕووبدات چییە؟) خراپترین شت دەشیا گەڕانەوەی جەڵتەیەکی کتوپڕی تر بێت بە ژانێکی یەکجار زۆرەوەو پاشان کۆتایی بە هەموو شتێك دێت، دەچم بۆ بینینی خوداو زۆر زوو ئۆقرەیی دەگرم. یەك کاتژمێر لەسەر قەنەفەکە ڕاکشامو چاوەڕێ بووم، بەڵام ئازارەکان نەگەڕانەوە. سەرەنجام لەخۆمم پرسی: (ئەگەر ئێستا نەمرم چی لەژیانم دەکەم؟) بڕیارمدا هەموو هەوڵم بخەمەکار هەتا تەندروستیم بەدەست بێنمەوە. ئیتر بەداخو مەراق خۆم ئازار نادەمو هێزم کۆدەکەمەوە.

ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ چوار ساڵ لەمەوبەر. بەجۆرێك هێزم خوڵقاند کە پزیشکەکەم لەبینینی ئەو پێشکەوتنو باشبونی کاردیۆگرامەکەم سەری سوڕمابوو. چیتر نیگەرانیم نەبوو. شەوقێکی نوێم هەیە بۆ ژیان. بەڵام ڕاستگۆیانە بیڵێم ئەگەر ڕوبەڕوی خراپترین شت واتە سەرەمەرگ نەبومایەتەوەو هەوڵم بۆ بەرەنگاربونەوەی نەدایە، پێم وانیە ئێستا لێرە بومایە. ئەگەر خراپترینم وەرنەگرتایە دڵنیام لەتاو ترس گیانم دۆڕاندبو.

بەڕێز ڕایان ئەمڕۆ زیندووە، چونکە سودی لەو بنەمایە وەرگرتبوو کە لەفۆرمولی سیحریدا بوو. ڕوبەڕوی خراپترین شت بەرەوە کە دەشێ ڕوودات (بگەڕێرەوە بۆ بابەتی (٢)و بەشی (٣)).

## من فەرامۆشکەرێکی گەورەم

نوسینی: ئۆردۆی تید

سەرۆکی ئەنجومەنی خوێندنی باڵای نیویۆرک

نیگەرانی خویەکە، خویەك کە ماوەیەك لەمەوبەر تێکم شکاند. خۆ دورخستنەوەی من لەنیگەرانی سێ هۆی هەبوو:

یەکەم: ئەوەندە سەرقاڵم کە کاتم بۆ نیگەرانییە تێکدەرەکان نییە. من سێ چالاکیم هەیە کە هەر کامیان کەم و زۆر پیشەیەکی تەواوە بۆ خۆی. بۆ ژمارەیەکی زۆر لەزانکۆی کۆڵۆمبیا وتاربێژی دەکەم. هەروەها سەرۆکی ئەنجومەنی خوێندنی باڵای شاری نیویۆرکم. هەروەها بەرپرسی کاروباری دارایی بەشی کۆڕەکان کۆمپانیای چاپەمەنی هارپەرو برایانیشم. زۆری ئەم سێ ئەرکە کاتێك بۆ فیکرو ئازارە فیکرییەکان ناهێڵێتەوە.

دووەم: من فەرامۆشکەرێکی گەورەم. کاتێك لەسەر کارێکەوە دەچم بۆ کارێکی تر، تەواوی بیرەکانی پێوەندیدار بە کێشەکانی پێشوو فەرامۆش دەکەم. بەبڕوای من گەڕان لەکارێکەوە بۆ کارێکی تر وزە بەخشە. ئەم کارە ئارامیم پێ دەبەخشێت و فیکرم ئازار دەدات.

سێهەم: ناچار بووم خۆم ڕابێنم کاتێك مێزی کارەکەم کۆدەکەمەوە هەموو کێشەکانم لەمێشکم وەدەرنێم. ئەمانە هەمیشە درێژەی هەیە. هەر کام لەمانە هەمیشە کۆمەڵێك کێشەی چارەسەر نەبووی هەیە کە پێویستی بە سەرنجی منە. ئەگەر هەموو شەوێك ئەم کێشانەم لەگەڵ خۆم ببردایەتەوەو نیگەرانیان بوومایە تەندروستی خۆمم لەناو دەبرد. سەرەڕای ئەوە تەواوی توانای پێویست بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵیانم لەناو دەبرد.

ئۆردۆی تید لەکاردا لەچوار خووی چاکدا شارەزایی هەیە. لەبیرتانە ئەو خووانە کامانەن؟!.

(بگەڕێنەوە بۆ بابەتی(٤)ی بەشی (٧) )

# ئەگەر دەستم لەنیگەرانی هەڵنەگرتایە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر لەگۆڕستان دەبووم

**نووسینی: کانی مەك**

**یاریکەری پێشووتری بەیسباڵ**

ماوەی (٦٣) ساڵ لە یاریی بەیسبالْدا پرۆفشناڵ بووم. کاتێك لەدەیەی (٨٠)دا دەستم پێکرد هیچ دەرماڵەیەکم وەرنەدەگرت. لەگۆڕەپانی چۆڵدا یاریم دەکردو لەسەر قوتوی ماسیو خۆڵ ئەدراین بەعەرزدا. کاتێك یاری تەواو دەبوو لەکلاۆێکدا پارەمان کۆدەکردەوە. ئەڵبەت ئەم پارەیە بۆ من کیفایەت نەبوو. چونکە خەرجی دایکی بێوەژنو براو خوشکە بچووکەکانیشم لەئەستۆ بوو. زۆر جار تیپی براوە دەبوایە خواردنی دروست بکردایە یان خەرجی سەیرانی بدایە هەتا بتوانین درێژە بە کارەکانمان بدەین.

من هۆکاری زۆرم هەبوو بۆ نیگەرانی. من نەك هەر تەنیا ڕاهێنەرێکم کە تا ئێستا بۆ ماوەی (٧) ساڵ بەردەوام لەدوایین شوێندا یاری تەواو کرد. من تەنیا ڕاهێنەرێکم کە لەماوەی (٨) ساڵدا هەشت سەد یاریم دۆڕاندووە.

لەپاش چەند دۆڕانێك دەستم کرد بە نیگەرانیو خەفەت خواردن کەبەسەختی نانم دەخوارد یان دەخەوتم. بەلاّم (٢٥) ساڵ لەمەوبەر دەستم لەنیگەرانی هەڵگرتو ڕاستگۆیانە دەڵێم، ئەگەر ئەم کارەم نەکردایە زۆر لەوە پێش لەگۆڕستان بووم.

کاتێك سەیری ژیانی دوورو درێژی خۆم دەکەم (کاتێك لەدایك بووم کە ئابراهام لینکۆڵن سەرۆك کۆماربوو ) دەبینم کە توانیم بە ئەنجامی ئەم کارانە بەسەر نیگەرانیدا زاڵ بم:

١- دەمبینی چەند بێهوودەیە. دەمبینی نامگەیەنێتە هیچ شوێنێكو هەڕەشەی لەناو چوون لەژیانم دەکا.

٢- دەمبینی کە خەریك بوو تەندروستیمی لەناو دەبرد.

٣- لەداهاتوودا ئەوەندە خۆمم سەرقاڵی بەرنامە داڕشتنو کار بۆ بردنەوە کرد کەکاتم بۆ خەم خواردن لەیارییە دۆڕاوەکان نەبوو.

٤- سەرەنجام یاسایەکم دروست کرد کە هەرگیز یاریکەرێك هەتا (٢٤) کاتژمێر دوای یارییەکە ئاگاداری هەڵەکەی نەکەمەوە.

لەڕۆژانی سەرەتای کارمدا لەگەڵ یاریکەرەکاندا جلم دەگۆڕی. ئەگەر تیپەکەم بیدۆڕاندایە نەمەتوانی بەر بە خۆم بگرمو ڕەخنە لەیاریکەرەکان نەگرمو لەبەر شکستیان بە توندی قسە نەکەم. بۆم دەرکەوت ئەمە تەنیا نیگەرانیم زیاد دەکات. ڕەخنەگرتن لەیاریزانێك لەبەر چاوی کەسانی تردا ئەو ناچار بە هاوکاری ناکات. من بە ڕاستی ئەوم تووڕەو قەڵس دەکرد. کەواتە لەبەر ئەوەی نەمەتوانی دڵنیابم خۆمو زمانم هەر زوو لەپاش شکستەکە کۆنترۆڵ کەم، یاسایەکم دروست کرد کە هەرگیز لەپاش دۆڕان یاریزانەکان نەبینمو هەتا ڕۆژی دوایی سەبارەت بە دۆڕان قسەم لەگەڵ نەدەکردن. تا ئەو کاتە ئارام ببوومەوەو هەڵەکان گەورە نەدەهاتنە بەرچاوو دەمتوانی بە ئارامی قسەیان لەگەڵ بکەمو ئەوانیش هەڵنەدەچوونو هەوڵیان بۆ بەرگریکردن لەخۆیان نەئەدا.

٥- هەوڵم ئەدا لەجیاتی سووك کردن بەتانەو تەشەر ئافەرینیان پێ بڵێم. هەوڵم ئەدا بۆ هەر ڕۆژێك وشەیەکی نوێم هەبێت.

٦- تێگەیشتم کاتێك ماندووم زیاتر نیگەرانم، لەئەنجامدا هەموو شەوێك کاتژمێر (١٠) لەناو جێگەدا بوومو هەموو پاش نیوەڕۆیەکیش وەنەوزێکم ئەدا. تەنانەت وەنەوزێکی (٥) خولەکیش زۆر کاریگەرە.

٧- من لەسەر ئەو بڕوایەم خۆم لەنیگەرانیەکان کەنار گرتووەو بەهەڵسوڕانم تەمەنم زیاد کردووە. ئێستا (٨٥) ساڵم، بەڵام تا کاتێك ئەم داستانانە دیسان لەسەرەتاوە نەگێڕمەوە خانەنشین نابم. کاتێك ئەو کارەم دەستپێکرد دەزانم خەریکە پیردەبم.

کانی مەك هەرگیز هیچ کتێبێکی سەبارەت بە بەرگرتن لەنیگەرانی نەخوێندەوە، کەواتە یاسای بۆ خۆی دروست کرد. بۆچی ئێوە خشتەیەك لەو یاسایانەی لەڕابردوودا کاریگەریەکەیتان دیوە دروست ناکەنو لێرەدا ناینووسن؟

ئەو ڕێگانەی بۆ زاڵ بوون بەسەر نیگەرانیدا دۆزیومەتەوە:

١- ..........................

٢- ..........................

٣- ..........................

٤- ..........................

# من بەگۆڕینی هەر یەکە لە پیشەو بۆ چوونەکانم لەدەستی برینی گەدەو نیگەرانی ڕزگار بووم.

**نووسینی: ئاردەن دابلیو شارپ**

پێنج ساڵ لەمەوبەر نیگەران، خەمۆك و نەخۆش بووم. پزیشکەکان دەیانوت برینی گەدەم هەیە. ڕێژیمیان بۆ دانام. تەنیا شیرم دەخواردەوەو هێلکەم دەخوارد، تا ئەو ڕادەیەی هەر ئەمدین حاڵم تێك دەچوو، بەلاّم چاك نەدەبوومەوە. ڕۆژێك وتارێکم لەسەر شێرپەنجە خوێندەوە. پێموابو تەواوی نیشانەکانیم هەیە. چیتر نیگەران نەبووم، دەترسام. دیارە ئەمە بووە هۆی کزانەوەی چەند ئەوەندەی گەدەم. زەربەی کۆتایی کاتێك بوو کە سوپا لەتەمەنی (٢٤) ساڵیدا بەهۆی کەم ئەندامی جەستەییەوە وەرینەگرتم. بێگومان لەباری جەستەییەوە لە دۆخێکی باشدا نەبووم، کاتێك کە دەبوا زۆر بەهێز بوومایە.

چیتر چەقۆ گەیشتبووە سەر ئێسکم. هیچ ڕووناکیەکم نەئەبینی . لەبێ هیواییدا هەوڵم ئەدا بزانم چۆن خۆم خستووەتە ئەم وەزعە. بەرەبەرە ڕاستم بۆ ڕوون دەبووەوە. ساڵی پێشوو فرۆشیارێکی بەتوانا و شادو تەندروست بووم، بەلاّم کەم و کوڕییەکانی شەڕ ناچاری کردبووم دەست لەپیشەکەم هەڵگرم و لەکارگەیەکدا خەریکی کاربم. نەفرەتم لەکارکردنی نا و کارگە بوو، خراپتر لەوەش بۆ نەگبەتی لەگەڵ کۆمەڵێك لەڕەشبین ترین مرۆڤەکاندا ببومە هاوکار. ئەوان ڕقیان لەهەموو شتێك دەبوەوە. هیچ شتێك ڕاست نەبوو. ئەوان بەردەوام ڕەخنەیان لەپیشەکەیان دەگرت و تانەیان لەدەرماڵەو کاتی کارو بەرپرس و هەموو شتێك ئەدا. بۆم دەردەکەوت بێ ئاگایانە ڕوانگەی ڕقە بەرانەی ئەوانم هەڵگرتووەتەوە. ئێستا تێگەیشتم کە برینی گەدەم بەفیکری نیگەتیڤ و هەستی تاڵی خۆم دروست بووە. کەواتە بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ئەو پیشەی خۆم حەزم لێیە، بۆ فرۆشیاری و هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکانێك بکەم کە پۆزەتیڤ بیردەکەنەوەو بیرو بۆچونی بنیاتنەریان هەیەو ئەم بڕیارە منی ڕزگار کرد. زۆر لێزانانە چووم بەدوای هاوکارو هاوڕێیانێکدا کە کەسانێکی سەر کەوتوو بوون. مرۆڤ گەلێکی شادمان، گەشبین و دوور لەنیگەرانی و برینی گەدە. لەگەڵ ئەوەی هەستم گۆڕی وەزعی گەدەیشم گۆڕا. لەماوەیەکی کەمدا هەر لەبیریشم چووەوە برینی

گەدەم بووە. زوو بۆم دەرکەوت مرۆڤ دەتوانێت هەر بەو ئاسانیەی نیگەرانی و تاڵی و شکست وەرگرێت، دەیشتوانێت تەندروستی، شادی و سەرکەوتن وەرگرێت. ئەمە گرنگترین دەرسێك بوو تا ئێستا وەرمگرتووە. دەبوایە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر فێری بوومایە. چەندەها جار دەربارەی بیستبووم و خوێندبوومەوە، بەڵام لەڕێگەیەکی سەختترەوە فێری دەبووم. ئێستا دەزانم مەبەستی مەسیح لەم وتەیە چی بوو: ((هەر مرۆڤێك بەو جۆرەیە کە بیر دەکاتەوە)).

## ئێستا بەدوای ڕووناکی سەوزەوەم

نووسینی: جۆزێف کارتەر

لەکاتێکەوە منداڵ بووم، لەتەواوی دەورانی گەنجیم و قەیرەییدا هەمیشە نیگەرانێکی پرۆفشناڵ بووم. نیگەرانیەکانی من زۆرو جۆراو جۆر بوون. هەندێکیان ڕاست بوون و زیاتریان خەیاڵی. بێجگە لەچەند جارێکی زۆر کەم کە هیچم بۆ نیگەرانی بوون نەبوو. کەواتە نیگەرانی ئەوە دەبووم لەوانەیە چاوەڕێی شتێك بم.

دوو ساڵ لەمەوبەر ژیانێکی نوێم دەستپێکرد. ئەمە پێویستی بەشی کردنەوەیەك لەسەرهەڵەکانم و کەمێك فەزیلەت و ئەدەب بوو. دۆزینەوەیەکی مەعنەوی بێ ترس و پرسیارگەرانە لەسەر خۆم. ئەمە هۆکاری ئەم نیگەرانیەی ڕوون کردەوە.

ڕاستی ئەوە بوو کە من نەمدەتوانی تەنیا بۆ ئەمڕۆ بژیم. هەمیشە بێ تاقەتی هەڵەکانی دوێنێ و بەیانی بووم.

هەمیشە پێیان دەوتم: ((ئەمڕۆ ئەو بەیانییەیە کە دوێنێ نیگەرانی بووم))، بەڵام ئەم کارە بۆ من کارساز نەبوو. بەمنیان دەوت لەسەر بەرنامەیەکی (٢٤) کاتژمێری ژیان بکەم. بەمنیان دەوت ئەمڕۆ تەنیا ڕۆژێکە کۆنترۆڵم بەسەریدا هەیەو دەبێ بەباشترین شێوە سوود لە دەرفەتەکانی هەر ڕۆژ وەرگرم. دەیانوت ئەگەر وابکەم ئەوەندە سەرگەرم دەبم کەکاتم بۆ نیگەران بوون بۆ ڕۆژانی تر نابێت، چ ڕابردوو و چ داهاتوو. ئەمە ئامۆژگارییەکی عاقڵانە بوو، بەڵام من ئەوەندە سەخت نەمبینی کە ئەم فیکرە پێك گرێدراوانە بەکەڵکی من بێن.. پاشان وەکو تیرێك لەدڵی تاریکیدا وەڵامەکەم دۆزییەوە. پێتان وایە لەکوێ؟ لەسەر سەکۆی هێڵی شەمەندەفەری باکووری ڕۆژئاوا کاتژمێر (٧)ی ئێوارە لە (٣١ ی مانگی مەی ساڵی ١٩٤٥). ساتێکی گرنگ بوو بۆ من.

هەر بەو هۆیەوەیە بەو وردییە لەبیرم ماوە. چەند دانە لەهاوڕێیانمان دەبرد بۆ وێستگەی شەمەندەفەر. دەچوون بۆ شاری لۆس ئەنجلۆس. هێشتا شەڕ بوو، ئەو ساڵە خەڵك زۆر بوو. لەجیاتی سوار بوون لەگەڵ هاوسەرەکەمدا دەچووم بۆ لای پێشەوەی شەمەندەفەرەکە. بۆ ماوەی خولەکێك وەستامو چاوم بڕییە مەکینە گەورە دەوشاوەکەی شەمەندەفەرەکە. سەیری هێڵی شیشەکانم کردو چرایەکی نیشاندانی کەرەم بینی. ڕووناکیەکی زەردی کارەبایی دەبینرا. لەچرکەیەکدا ئەو ڕووناکیە بوو بەڕەنگی سەوز. هەر ئەو چرکەیە کەسێك هۆڕینەکەی ڕاکێشا. ڕستەی ئاشنای ((هەمووان سوارین))م بیستو لەیەك چاو ترووکاندا ئەو شەمەندەفەرە زەبەلاحە بۆ سەفەرێکی (٢٣٠٠) میلی بەڕێکەوت.

گێژ ببووم. شتێك خەریك بوو واتایەکی بۆ دروست دەکردم. لەحاڵی تەجرەبە کردنی موعجیزەیەکدا بووم. کوتوپڕ پەیم بەشتێك برد. کابرای شۆفێری شەمەندەفەر ئەو وەڵامەی بەشوێنیەوە بووم دامیەوە. ئەو گەشتە دوورو درێژەی بەیەك چرای سەوز دەستپێکرد. ئەگەر من لەجیاتی ئەو بوومایە حەزم دەکرد ئەو چرا سەوزە بۆ هەموو گەشتیارەکان ببینم. ئەڵبەت شتی وا گونجاو نەبوو، بەو حاڵەوە ئەمە کوتومت ئەو کارە بوو کە من دەمویست لەژیانی خۆمی بکەم. لەوێستگەیەك دانیشتمو نەچم بۆ هیچ شوێنێك، چونکە زۆر هەوڵم ئەدا ئەوشتە ببینم کە ڕێگیربوو لەبەر دەممدا.

فیکر بەرەو مێشکم خلۆر دەبووەوە. ئەو شۆفێرە نیگەرانی ئەو کێشانە نەبوو کە لەوانە بوو لەپاش چەند میلێکی تر بێتە پێشەوە. لەوانەیە چەند پەککەوتنو هێواش کردنەوەیەك، بەڵام ئایا ئەمە بەو هۆیەوە نەبوو کە ئەوان سیستەمی نیشانە دانیان هەبوو؟ چرا زەردەکان واتە خێراییت کەم کەرەوەو زۆر گوێ مەدە. چرای سوور، مەترسی گەورە لەسەر ڕێیە، ڕاوەستە. ئەمەبوو کە گەشت کردن بە شەمەندەفەری دڵنیا بەخشتر دەکرد. سیستەمێکی نیشاندانی چاك. پرسیارم لەخۆم کرد بۆچی سیستەمێکی نیشانەدەری چاکم بۆ ژیان نیە. وەڵام ئەمە بوو: هەمبوو، خودا ئەوەی دابوو بەمن. ئەو کۆنترۆڵی لەدەستدایە، کەواتە شیاوی هەڵەنیە. دەستم کرد بە گەڕان بەدوای چرای سەوزدا. لەکوێ بۆم پەیدادەبوو. ئەگەر خوا چرای سەوزی دروست کردوە بۆچی لەخۆی نەپرسین؟ منیش هەر ئەم کارەم کرد.

ئێستا هەموو ڕۆژێك بەیانیان بەدۆعاو پاڕانەوە چرای سەوزی ئەو ڕۆژە وەردەگرم. جار جار چرایەکی زەرد وەردەگرم کە خێراییم کەم دەکاتەوە. جاری وایشە چرای سوور وەردەگرم کە لەپێش ئەوەی تێك بشکێم دەموەستێنێت. لەدوو ساڵ لەمەوبەرەوە کە ئەم نهێنیەم دۆزیوەتەوە هیچ نیگەرانیەکم نەبووە. لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا زیاتر لە (٧٠٠) چرای سەوزم پیشاندراوەو سەفەر بۆ ناو ژیانی نیگەرانی ئەوەی ڕەنگی چرای داهاتووە چی دەبێت زۆر ئاسانتر بووە. چیتر گرنگ نیە چ ڕەنگێك بێت، من دەزانم چی دەکەم.

## جان دی ڕاکفلێر چۆن (٤٥) ساڵی بەزەمانی قەرز بەڕێکرد.

جان دی ڕاکفلێر یەکەم یەك ملیۆن دۆلاری (٣٣) ساڵیدا کۆکردەوە. لەچل و سێ ساڵیدا گەورەترین کۆمپانیای تایبەتی جیهانی دروست کرد: کۆمپانیای نەوتی ستاندارد. بەڵام لەپەنجاو سێ ساڵیدا لەکوێ بوو؟ نیگەرانی بەرۆکی گرتبوو. نیگەرانی و فشاری عەسەبی زۆر تەندروستی لەناو بردبوو. جان کی وینکلەر یەکێك لەژیان نامە نووسانی ئەو دەڵێت: ((لە ٥٣ ساڵیدا ئەو وەکو مۆمیایی وابوو)).

ڕاکفلێر لە ٥٣ ساڵیدا دوچاری نەخۆشیەکی هەرسی سەرسوڕهێنەر بوو کە هەموو مووەکانی وەراند. تەنانەت برژانگەکانیشی و تەنیا تۆزێك بڕۆی تەنکی پێوە هێشت. وینکلەر دەڵێت: ((ئەوەندە وەزعەکەی خراپ و جیدی بوو کە بۆ ماوەیەك ناچار بوو تەنیا شیری ژن بخوات)). بەپێی وتەی پزیشکەکان ئەو تووشی نەخۆشی ئەلۆپسیا بووبوو کە جۆرێك کاسبوونە زۆربەی کات بەحاڵی عەسەبی زۆر توند دەست پێدەکات. ئەو بەو سەرە تاسەیەوە ئەوەندە ترسناك دەهاتە بەرچاو کەناچار بوو هەمیشە عارەقچنێك بکاتە سەری. لەدوایدا کڵاوی گیسی (٥٠٠) دۆلارییان بۆ دروست کردو باقی تەمەنی ئەم کڵاو گیسە زیوانەی دەکردە سەری.

ڕاکفلێر خۆی ئەندامێکی پتەوی هەبوو. بەهۆی ئەوەی لەکێڵگەدا گەورە ببوو زەمانێك قۆڵ و بازووی ئەستووری هەبوو، هەنگاوی بەهێزی پڕشکۆی دادەنا. بەم

حاڵەوە لەتەمەنی ٥٣ ساڵیدا کاتێک ڕێک و جوانی زۆربەی پیاوانە، شانەکانی داکەوتبوون و لەکاتی ڕێکردندا قاچی بەسەر زەویدا ڕادەکێشا. جان. تی. فلین یەکێکی تر لەژیاننووسانی ئەو دەڵێت: ((کاتێک لەئاوێنەدا سەیری خۆی دەکرد پیرە پیاوێکی ئەبینی. کاری بێ وچان، نیگەرانی بێ کۆتایی، تووڕەیی، شەوانی بێخەوی و کەمی وەرزش و حەسانەوە کاری خۆی کردبوو، ئەوی لەپێ خستبوو. ئێستا ئەو دەوڵەمەنترین پیاوی دنیا بوو بەڵام ناچار بوو بەپێی ڕێژیمێک نان بخوات کە فەقیرێکیش خۆی لێ لائەدا. داهاتی ئەو حەفتەی یەک ملیۆن دۆلار بوو، بەڵام تەنیا دوو دۆلار بۆ ئەو خواردنەی ئەو دەیخوارد بەس بوو. شیری ترش و چەند دانە بسکیت هەموو ئەو شتە بوو کە پزیشکەکان ڕێگەیان دابوو بیخوات. پێستی لەشی ڕەنگی خۆی نەمابوو وەکو کاغەزی پێستی لێهاتبوو کە بە سەختی بەدەوری ئێسکیدا کێشرابوو هیچ شتێک بێجگە لە دەرمانی پزیشکی لە ٥٣ ساڵیدا نەگێڕایەوە.

چی ڕوویدا؟ نیگەرانی، شۆک، ژیانی پڕ زەحمەتی عەسەبی. ئەو خۆی بردبووە لێواری گۆڕ. بەجۆرێک کە ناسراو خزمەکانی دەیانوت تەنانەت ئەو لە ٢٣ ساڵیدا هەروا بە ئیرادەی پتەوەوە بەدوای ئامانجەکەیەوە بوو، کاتێک سوودێکی زۆری دەست دەکەوت هەموو کەس و کاری دەیانزانی. کاتێک قازانجێکی باشی دەست دەکەوت کڵاوەکەی هەڵئەدایە سەر زەوی و دەستی دەکرد بەسەما کردن، بەڵام ئەگەر پارەیەکی لەدەست ئەدا نەخۆش دەکەوت. جارێک بایی (٤٠٠٠٠) دۆلار دەغڵ و دانی لەڕێگەی دەریاچەی گەورەوە بەڕێ کردبوو، بەبێ بیمە کردن، چونکە (١٥٠) دۆلاری تێدەچوو، لەڕوانگەی ئەوەوە زۆر زۆر بوو. ئەو شەوە تۆفانێکی سەخت لەدەریاچەی ئەری ڕوویدا. ڕاکفلێر ئەوەندە نیگەرانی بارەکەی بوو کە کاتێک جۆرج گاردنەری هاوبەشی بەیانیەکەی هات بۆ نووسینگە، بینی لەژوورەکەدا پیاسە دەکات.

ئەو بەدەنگێکی لەرزۆک وتی: ((پەلە بکە. بابڕۆین هەر ئێستا بارەکە بیمە بکەین. ئەگەر زۆر درەنگ نەبوبێت)). گارنەر خێرا ڕۆیشت و بیمەنامەکەی وەرگرت، بەڵام

کاتێك گەڕایەوە ڕاکفلێری لەوەزعێکی عەسەبی خراپتردا بینی. هەر لەو کاتانەدا تەلەگرام هاتبوو کە بارەکە بە سەلامەتی خاڵی کراوە. ئێستا نەخۆشتر بوو چونکە (١٥٠) دۆلارەکەی خەسار بوو. لەڕاستیدا لەتاو ئەم ڕووداوە ئەوەندە حاڵی خراپ بوو کەناچار بوو بڕواتەوە بۆ ماڵەوەو پشوویەك بدات. لەو دەورانەدا کۆمپانیای ئەو ساڵانە (٥٠٠٠٠٠) دۆلار داهاتی هەبوو، بەوحاڵەیشەوە خۆی لەبەر (١٥٠) دۆلار ئەوەندە نەخۆش خستبوو کە دەبوایە بچوایەتە ناو جێگە.

ئەو هیچ کاتێکی بۆ یاریو سەرگەرمیو هیچ شتێك لەپارە دەرکردنو وانەوتنەوەی ڕۆژانی یەك شەممە نەبوو. کاتێك هاوبەشەکەی جۆرج گاردنەر لەگەڵ سێ کەسی تردا بەلەمێکی سیاحیان بە (٢٠٠٠) دۆلار کڕیبوو ڕاکفلێر حەپەساو سواری بەلەمەکە نەبوو. دوانیوەڕۆی ڕۆژێکی شەممە گارنەر ئەوی لەحاڵی کار لەنووسینگەکەیدا بینیو تکای لێکرد: ((زووکە وەرە بابڕۆین بۆ ڕاوە ماسی. بۆ تۆ زۆر چاکە. کارکردن فەرامۆش کەو کەمێکیش ڕابوێرە)). ڕاکفلێر بە ڕقەوە سەیرێکی کردو هۆشیاری پێدا: ((جۆرج گارنەر، تۆ هەڵە خەرجترین پیاوێکی تا ئێستا بینیومە. تۆ زەربە لەمتمانەی خۆتو من لەبانك ئەدەی. یەکەم شت کە دەیزانی ئەوەیە کە هەردووکمان لەناو بەری. من هەرگیز سواری بەلەمەکەی تۆ نابم. تەنانەت نامەوێ بیشیبینم)). و تەواوی ئەو دوانیوەڕۆی شەممەی لەنووسینگەکەیدا کاری کرد.

هەر ئەو نەبوونی هەستی گاڵتەیە، هەر ئەو کەمی هیوایە تایبەتمەندییەکانی ڕاکفلێر بوو لە هەموو دەورانی کاری ژیانیدا. ئەم ساڵانەی دوایی دەیوت: ((هەرگیز شەوێك سەرم نەنایە سەر سەرین بێ ئەوەی بیری خۆمی بێنمەوە کە لەوانەیە سەر کەوتنی من کاتی بێت)). بە ملیۆنەها دۆلار سەروەتەوە هەرگیز سەری بەبێ نیگەرانی لە لەدەست چوونی سەرمایەکەی نەئەنایە سەر سەرین. بێگومان نیگەرانی تەندوستی ئەوی لەناو بردبوو. ئەو هیچ دەرفەتی بۆ خۆشیو سەرگەرمی نەبوو. هەرگیز نەدەچوو بۆ سینەما، هەرگیز یاری کارتی نەدەکردو هەرگیز نەدەچوو بۆ میوانی.

بەپێی وتەی ((مارك هانا)) ئەم پیاوە شێتی پارە بوو. ((لەهەموو شتێکدا عاقڵ بوو، بەڵام شێتی پارە بوو)).

جارێك ڕاکفلێر لەلای یەکێك لەدراوسێکانی لەکلیوڵەند دانی پیا نابوو کە ((دەیەوێ خۆشیان بوێت)). بەم حاڵەیشەوە ئەوەندە وشكو بەگومان بوو کە کەسانێکی زۆر کەم خۆشیان دەویست. جارێك مۆرگان خۆی لەکارکردن لەگەڵی کەنار گرتبوو، هاواری کردبوو: ((من هیچ ئەم پیاوەم خۆش ناوێتو نامەوێت هیچ موعامەلەیەکی لەگەڵ بکەم)). تەنانەت براکەی ئەوەندە نەفرەتی لێی بوو کە جەنازەی منداڵەکانی لەگۆڕستانی بنەماڵەکەی هێنایە دەرەوە. ئەو وتی : ((هیچکەس لەخوێنی من هەرگیز لە زەوییەکدا ناخەوێت کە ڕاکفلێر خاوەنیەتی)) فەرمانبەرانو هاوکارانی راکفلێر زۆر لێی دەترسانو بەشی سەیری باسەکە لێرەدایە کە : ((ئەو لەوان دەترسا. دەترسا لەدەرەوەی فەرمانگە قسەبکەنو نهێنیەکان بدرکێنن)). ئەو ئەوەندە سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ بێ بڕوا بوو کە جارێك کاتی گرێبەستێکی دە ساڵەی لەگەڵ پالاوگەرێکی سەر بەخۆدا واژۆ دەکرد ئەوی ناچار کرد بەهیچ کەس تەنانەت بە هاوسەرەکەیشی نەڵێت. دروشمی ئەو ئەمە بوو: (( دەمت ببەستەو کارەکەت بکە)).

پاشان لەلووتکەی مەزنیو سەرمایەدا کە زێڕ وەکو بورکانی تواوە بەرەو سندووقەکانی دەهاتە خوارەوە، ژیانی تایبەتی ئەو تێك شکا. کتێبەکانو وتارەکان شەڕیان لەدژی نەجیب زادەی دزی کۆمپانیای نەوتی ستاندارد ڕاگەیاند. بڵاو بوونەوەی هەمان ڕاستیو هێرشی بێ بەزەییانەی هەمان ڕکەبەران. لەزەوییە نەوتیەکانی پانسلڤانیادا ڕاکفلێر جێی نەفرەت ترین کەسی دنیا بوو. پەیکەری ئەو بەدەستی کەسانێك کە ستەمیان لێکرابوو لەدار درا. زۆرێك لەوان ئاواتیان دەخواست تەنافەکە بخەنە ملی چرچی خۆیەوەو لەچڵی دار سێوێکەوە هەڵیەواسن. نامەی هەڕەشە ئامێز هات بۆ نووسینگەکەی. ئەو چەند کەسێکی بۆ پاراستنی خۆی دامەزراند هەتا ڕێگە لەکوشتنی بەدەستی دوژمنەکانی بگرێت. هەوڵیدا ئەم تۆفانی

نەفرەتە چاوپۆشی لێبکات. جارێك بەشێوەی تەشەراوی وتی: ((ئێوە دەتوانن شەقم تێهەڵدەن و ئازارم بدەن، بەو مەرجەی بێڵن من ڕەوشی

خۆمم هەبێت)). بەلام بۆی دەرکەوت کە بەهەر حاڵ ئەویش مرۆڤە نەیدەتوانی نەفرەت و نیگەرانی وەربگرێت و تەندروستی بەرەو خراپبوون چوو. نەخۆشی، ئەم دوژمنە تازەیە گێژو حەیرانی کردبوو کە لەدەروونەوە هێرشی بۆ ئەو دەکرد. سەرەتا هەوڵیدا نەخۆشیەکەی داشارێت و هەوڵیدا ئەم نەخۆشیە لەمێشکی پاك بکاتەوە، بەلام بێ خەوی، هەرسی خراپی خۆراك و وەرینی موو ئەو هەموو نیشانە جەستەییەی نیگەرانی و بێ حاڵی نکوڵی لێنەدەکرا. سەرەنجام پزیشکان ڕاستیەکی حەپەسێنەریان پێ ڕاگەیاند. دەیتوانی هەڵبژێرێت: پارەو نیگەرانیەکانی یان ژیانی. ئەوان هۆشیارییان پێدا دەبێ یان خانەنشین بێت یان بمرێت. بەلام لەپیش خانەنشینیدا نیگەرانی و ترس و تەماع تەندروستی ئەویان لەناو بردبوو. کاتێك ((ئیدا تاربێل)) ناودارترین نووسەری بیۆگرافی ژنی ئەمریکا ئەوی بینی حەپەسا. ئەو نووسی: ((پیرییەکی ترسناك لەڕوخساریدا بوو. ئەو پیرترین پیاوێك بوو تا ئێستا بینیبووم)). پیر؟ بۆچی؟ ڕاکفلێر چەندین ساڵ لەژەنراڵ مەك ئارتۆر کاتێك فلیپینی داگیر کرد گەنجتر بوو. بەلام لەباری جەستەییەوە بەجۆرێك تێك شکابوو کە ((ئیدا تاربێل)) بەزەیی پیایدا دەهات. لەوکاتەدا ئەو کاری لەسەر بەهێزترین بەرهەمی خۆی دەکرد کە نەوتی ستانداردی تاوانبار دەکرد. بێ گومان هیچ هۆیەکی بۆ خۆش ویستنی پیاوێك کە ئەم ئۆختاپوسەی خوڵقاندبوو، نەبوو. بەم حاڵەشەوە کاتێك ڕاکفلێری لەکاتی وانە وتنەوەی ڕۆژی یەك شەممەدا بینی کە بەشەوقەوە لەڕوخساری کەسانی دەوروبەری دەڕوانێت، بینی، وتی: ((هەستێکم هەبوو کە چاوەڕوانی نەبووم. هەستێك کە کات بەهێز ترو توندتری دەکرد. بەداخەوە بووم بۆی و هیچ هاوڕێیەك خراپتر لەترس ناناسم)).

کاتێک پزیشکەکان وەریانگرت کە ژیانی ڕاکفلێر ڕزگار بکەن سێ یاسایان بەو ڕاگەیاند. یاسا گەلێک کە ئەو هەتا کۆتایی تەمەنی بەڕێوەی بردن. ئەو سێ یاسایە ئەمانە بوون:

١- خۆت لەنیگەرانی بپارێزە. لەهیچ وەزعێکدا نیگەرانی مەخە دەروونت.

٢- ئارام بەو وەرزشی سووکو زۆر بکە لەهەوای ئازادا.

٣- ئاگاداری ڕێژیمی خۆراکت بە. هەمیشە کاتێک هێشتا تۆزێک برسیت، دەست لەخواردن هەڵگرە.

ڕاکفلێر پێڕەوی لەو یاسایانە کردو ئەوان ژیانیان ڕزگار کرد. ئەو خانەنشین بوو. فێر بوو یاریی گۆڵف بکات، حەزی سەبارەت بە باخەوانی پەیدا کرد. لەگەڵ دراوسێکانیدا کاتی بەڕێ دەکرد. یاری دەکردو گۆرانی دەوت. بەڵام یەک کاری تریشی دەکرد. وینکلەر دەڵێت: (( بەدرێژایی ڕۆژانی پڕ ئەشکەنجەو شەوانی بێ خەوی ڕاکفلێر کاتی بۆ بیرکردنەوە هەبوو)). ئەو دەستی کرد بە بیرکردنەوە لەخەڵک. بۆ یەکجاریش ئەگەر بووبێت بیری لەوە نەکردەوە دەتوانێ چەندە پارە بەدەست بێنێتو لەجیاتی ئەوە بیری کردەوە ئەو پارەیە دەتوانێ چەن شادمانی بۆ مرۆڤ بگێڕێتەوە.

بەکورتی ڕاکفلێر دەستی کرد بە بەخششی پارەکانی. زۆر جار ئاسان نەبوو. کاتێک پارەیەکی بە دیاری ئەدا بەکلیسایەک، قەشەکانی سەرانسەری وڵات بەتوورەییەوە هاواریان دەکرد: (( پارەی حەرام))، بەڵام ئەو درێژەی بەکاری خۆی ئەدا. ئەو ئاگاداری زانکۆیەکی بێ پارە بووەوە لەکەناری دەریاچەی میشیگان کە لەبەر ڕەهن لەحاڵی داخستندا بوو. ڕزگاری کردو ملیۆنەها دۆلاری تیا خەرج کردو زانکۆی ناوداری شیکاگۆی دروست کرد. هەوڵیدا یارمەتی ڕەش پێستەکان بدات. ئەو پارەی دا بە زانکۆی ڕەش پێستەکان بۆ نموونە ((تاسکی گی کالێج)) کە پێویستی بەپارە بوو بۆ درێژەی کاری جۆرج واشینگتۆن. یارمەتی بەرەنگار بوونەوەی کرمی

قولاپـداری دا. کاتێـك دوکتـۆر چـارلز دەبلیـۆ سـتایلز، سـەرۆکی بەشـی بـەرەنگار بوونـەوەی کرمـی قولاپـدار وتـی : ((دەرمانێك بەنرخی ٥٠ سەنت ئەو کەسە نەجات دەکات کە بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە ڕەنج دەکێشێت، بەڵام چ کەسێك ئامادە دەبێت ئەم ٥٠ سەنتە بدات؟ ڕاکفلێر دای. ئەو ملیۆنەها دۆلاری خەرج کرد هەتا کرمی قولاپدار کە گەورەترین بەڵایەك بوو کە خەڵکی باشووری لەکار خستبوو، بنبڕ بکات. دیسان زیاتریشی کرد، ئەو دەزگا گەلێکی نێونەتەوەیی گەورەی دروست کرد. دەزگای ڕاکفلێر کە بەرەنگاری نەخۆشیو بێ ئاگایی دەبووەوە لەسەرانسەری جیهاندا.

من بەشەوقەوە باس لەم کارە دەکەم چونکە خۆم ژیانم منەتباری ڕێکخراوی ڕاکفلێرم. باش لەبیرمە کاتێك سالی (١٩٣٩) لەچین بووم کۆلێرا هەموو پەکینی گرتبووەوە. جووتیارانی چینی وەکو مەلومۆر دەمردن، بەو حاڵەوە لەناو ئەو هەموو ترسو نیگەرانیەدا دەمانتوانی بچین بۆ کۆلیجی پزیشکی ڕاکفلێرو خۆمان بکوتین. هەم چینیەکانو هەم بیانیەکان وەکو یەك دەیانتوانی ئەم کارە بکەنو ئەو کاتە بوو کە بۆ یەکەم جار تێگەیشتم پارەی ڕاکفلێر چی بۆ دنیا دەکات.

هەرگیز لەدنیادا شتێکی هاوشێوەی ڕێکخراوی ڕاکفلێر نەبووە. شتێکی بێ هاوتایە. ڕاکفلێر دەیزانی لەهەموو دنیادا کارگەلێکی چاك بەدەستی کەسانی عاقڵ ئەنجام ئەدرێت. لێکۆڵینەوە دەکرێتو زانکۆکان دادەمەزرێنو پزیشکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی نەخۆشیەك هەوڵ ئەدەن بەلام زۆربەی ئەم کارانە بەهۆی کەمی بودجەوە ناگەنە کۆتایی.

ئەو بڕیاریدا یارمەتی ئەو پێشڕەوانەی مرۆڤایەتی بدات نەك ئەوەی پێشیان بکەوێت، بەڵکو پارەیان بداتو یارمەتیان بدات کە یارمەتی خۆیان بدەن. ئەمڕۆکە منو تۆ دەتوانین سوپاسی ڕاکفلێر بکەین بەهۆی موعجیزەی پەنسلینو دۆزینەوە گەلێکی تر کە پارەی ئەو پشتگیری کردووە. دەتوانن سوپاسی بکەن کە چیتر منداڵەکانتان بەهۆی مەنەنژیتی بڕبڕەوە گیان لەدەست نادەن، نەخۆشیەك کە چوار

کەس لەهەر پێنج هەزار کەسی دەکوشت. دەتوانین سوپاسی ئەو بکەین بەهۆی ئەو ڕۆڵەی لەپێشکەوتنی بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ مەلاریا، سیل، ئەنفلۆنزا، دیفتری و زۆر نەخۆشی تر کەدنیای بەگیر هێنابوو،هەیبوو.

ئەی خودی ڕاکفلێر؟ کاتێك پارەکەی بەخشی ئایا ئۆقرەیی گرت؟ بەڵێ، سەرەنجام قەناعەتی کرد. ئاڵەن نۆنیز دەڵێت: ((ئەگەر خەڵك لەپاش (١٩٠٠) ئەو بەهۆی نیگەرانی لە سەر نەوتی ستاندارد وەبیر دێننەوە لەهەڵەدان)).

ڕاکفلێر شادمان بوو. ئەو بەتەواوی گۆڕابوو، چیتر نیگەران نەبوو. لەڕاستیدا ئەو ناچار بوو گەورەترین شکستی ژیانی وەربگرێت خۆی لەنەخەوتنی یەك شەویش بەرکەنار دەگرت.

ئەو شکستە کاتێك بوو ئەو کۆمپانیایەی ئەو دروستی کردبوو واتە نەوتی ستاندارد، ناچار بوو قورسترین غەرامەی مێژوو بدات. بەپێی یاسای ئەمریکا نەوتی ستاندارد مافێکی کەرتی تایبەت بوو کە تەواو لەگەڵ یاساکانی سەندیکاکانی پیشەسازییە گەورەکان جیاوازی هەبوو. ئەم شەڕە پێنج ساڵی خایاند. باشترین مێشکە یاساییەکان لەبەر شتێك کە تا ئەو دەورانە درێژترین شەڕی دادگایی مێژوو بوو، شەڕیان کرد. بەڵام نەوتی ستاندارد دۆڕاندی .

کاتێك دادگەر کۆنسامۆنتین لەندیس بڕیاری خۆیداو پێشکەشی کرد پارێزەرەکان دەترسان ڕاکفلێر ئەمە بە سەخت وەربگرێت، بەڵام نەیاندەزانی ئەو چەندە گۆڕاوە. ئەو شەوە یەکێك لەپارێزەرەکان بەتەلەفون قسەی لەگەڵ ڕاکفلێردا کرد. ئەو دەربارەی ڕای دادگا بە ئارامی قسەی کردو پاشان بە نیگەرانیەوە وتی: (( هیوادارم ئەم ڕایە ئێوە بێ تاقەت نەکات بەڕێز ڕاکفلێر. هیوادارم باش بخەون)).

ڕاکفلێر چی وت؟ لەو دیوەوە دەنگی تەقەتەقێك هات و وتی : (( نیگەران مەبە جانسۆن، هەوڵئەدەم باش بخەوم و مەهێڵە ئەم مەسەلەیە تۆیش بێتاقەت بکات. شەو باش)). وەها شتێك لەپیاوێك کە یەك شەو لەبەر لەدەستدانی (١٥٠) دۆلار نەخەوتبوو بەدوور بوو! بەڵێ، ماوەیەکی زۆری پێچوو هەتا ڕاکفلێر بەسەر نیگەرانیدا زاڵ بوو. لە(٥٣) ساڵیدا لە حاڵەتی مەرگدا بوو، بەڵام هەتا (٩٨) ساڵی ژیا!

# خوێندنەوەی کتێبێك دەربارەی پێوەندی ژنومێردایەتی هاوسەرگیری منی نەجات دا.

نووسینی: بی. ئار. دابلیو

حەزناکەم ئەم داستانە بێ ناو نیشان بێت بەڵام چونکە نهێنیە ناتوانم ناوم بڵێم. بەهەرحاڵ دیل کارنگی ڕاستی ئەم داستانە زەمانەت دەکات. یەکەم جار دوانزە ساڵ لەمەوبەر بەوم وت. لەپاش تەواو بوونی زانکۆ کارێکم لەدەزگایەکی پیشەسازی گەورەدا دۆزییەوەو پێنج ساڵ دوای ئەوە ئەم کۆمپانیایە منی وەکو نوێنەری خۆی لەڕۆژهەلاتی دوور نارد بۆ ئەو پەڕی دەریا. یەك حەفتە لەپێش بەجێ هێشتنی ئەمریکا لەگەڵ خۆشویسترین ژنێك کە دەمناسی هاوسەرگیریم کرد بەڵام مانگی هەنگوینی ئێمە کارەساتێکی هیوا کوژ بوو کە ئەگەر شەرمەزاری ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هاوڕێکانی لەبەر شکست لەپڕ شەوق ترین ڕووداوی ژیانی نەبوایە، دەگەڕایەوە بۆ ئەمریکا.

دوو ساڵی پڕ ڕەنجمان لەڕۆژهەلات بردە سەر. جاری وابوو ئەوەندە بێتاقەت بووم کە دەکەوتمە بیری خۆ کوشتن ڕۆژێك کتێبێکم بینی کە هەموو شتێکی منی گۆڕی. من هەمیشە عاشقی کتێب بوومو شەوێك کە چووم بۆ دیداری هاوڕێیەکی ئەمریکایی لەڕۆژهەلات لەحاڵی سەیر کردنی کتێبخانە گەورەکەی ئەودابووم کە کتوپڕ چاوم بەکتێبی ((هاوسەر گیری ئایدیال)) لەنووسینی دوکتۆر ڤان دیڤلد کەوت. بەناوەکەیدا وادیار بوو بابەتی پەند ئامێزو سەرنج ڕاکێشی تیا بێت. لەڕووی هەستی پرسیارانەوە کردمەوە. بینیم کە کەموزۆر هەموو کتێبەکە لە بەشی جووتبوونی هاوسەرێتیدایەو بێ پەردە بەبێ هیچ هەرزەیی و ناخۆشیەك باسی لە بارەوە دەکرد. ئەگەر کەسێك بەمنی بوتایە کتێبێك دەربارەی جووتبوون بخوێنمەوە بێ گومان نارەحەت دەبووم. تەنانەت دانەیەك! پێموابوە خۆم دەتوانم دانەیەك بنووسم، بەڵام هاوسەرگیری من وەها بەرەوڕووی شکست بووەوە کە ڕازی بووم بەهەر حاڵ سەیرێکی بکەم.

کەواتە ترسم شکاندو داوام لەهاوڕێکەم کرد بەقەرز پێم بدات. بەڕاستی دەتوانم بڵێم خوێندنەوەی ئەم کتێبە یەکێك لەگرنگترین ڕووداوەکانی ژیانی من بوو. هاوسەرەکەیشم خوێندییەوە. ئەو کتێبی هاوسەرگیرییەکی پڕ ژانی کرد بە هاوڕێیەتیەکی شادو بەختەوەرانە. ئەگەر ملیۆنەها دۆلارم هەبوایە مافی چاپی ئەم کتێبەم وەردەگرت و بەبەلاش ئەمدا بەهەزاران تازە بووك و زاوا. جارێك خوێندمەوە کە دوکتۆر بی.واتسۆن دەروونناسێکی پایە بەرزە دەڵێت: ((جووتبوون بێ گومان بابەتێکی گرنگە لەژیاندا. شتێکە کە بەڕاستی وێرانەکانی ژیانی ژن و پیاو دروست دەکات)).

ئەگەر دوکتۆر واتسۆن ڕاست بکات و منیش قەناعەتم کرد کە وتەکەی کەم و زۆر دروستە کەواتە شارستانیەت بۆچی ڕێگە ئەدات هەزاران کەس کە ئاگاداری گرنگی جووتبوون نین هەموو ساڵێك هاوسەرگیری بکەن و بەختەوەری و هاوسەرگیری لەناو بەرن؟ ئەگەر بمانەوێ بزانین کێشەی هاوسەرگیری چیە دەبێ کتێبی ((کێشەی هاوسەرگیری چیە؟)) لە نووسینی دوکتۆر جی ڤی هەمیلتۆن و کەنەس مەك گۆن بخوێنینەوە. دوکتۆر هەمیلتۆن پێش لەوەی ئەم کتێبە بنووسێت چوار ساڵی بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەی هاوسەرگیری تەرخان کرد. ئەو دەڵێت: ((تەنیا دەروونناسێکی نەزان دەڵێت کە زۆربەی کێشەکانی هاوسەرێتی لەناسازییە سێکسیەکان سەرچاوە ناگرێت. لەهەر حاڵدا ناکۆکیەکانی تر کەلەکێشەکانی ترەوە سەرچاوە دەگرن لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەگەر پێوەندی سێکسی خۆش بێت دەکەونە بەر چاوپۆشی)).

من دەزانم ئەمە وتەیەکی دروستە چونکە خۆم ئەزموونێکی تاڵم بووە. کتێبێك کە هاوسەرگیری منی لە لەناوچوون ڕزگار کرد کتێبی ((هاوسەرگیری ئایدیال))ی دوکتۆر ڤان دیڤلد لە گەورەترین کتێبخانە میللیەکاندا دەست دەکەوێت. پێتان ناڵێم بیکڕن چونکە زۆر گرانە، حەوت دۆلارو پەنجا سەنت. بەو حاڵەوە ئەگەر ئەتانەوێ دیارییەك بەتازە بووك و زاوایەك بدەن شتێکی جوانکاری کراوی قاپ و قاچاخی پێمەدەن. بەرگێك لە ((هاوسەرگیری ئایدیال))* ی پێ بدەن. ئەم کتێبە زۆر زیاتر لەهەموو سایتەکانی ئەمریکا ئەوان بەختەوەر دەکات. ئەگەر نەتانتوانی ئەم کتێبە کە کتێبخانەی ناوچەکەتان دەست بخەن ئەگەر ویستتان دەتوانن داوا لەهەر کتێب فرۆشێك یان خانەی بڵاو کردنەوەکەی بکەن. ڕەندۆم هاوس، شەقامی میدیسۆن

* هاوسەرگیری ئایدیال: هاوسەرگیری نموونەیی.

(٤٥٧)، نیویۆرک. تێبینیەک لەلایەن دیل کارنگیەوە: ئەگەر حەوت دۆلارو پەنجا سەنت فشار زۆر دەخاتە سەر بوودجەتان من کتێبێکی ترتان پێ دەناسێنم: ((ڕێنمای هاوسەرگیری)) نووسینی دوکتۆر هاناو ئابراهام ئیلستۆن، چاپی سیمۆن و چۆستەر، شەقامی (١٢٣٠) ئامریکا، نیویۆرک. بایی سێ دۆلارو پەنجا سەنتە. بۆ وەرگرتنی خشتەی خۆڕایی کتێب و بابەتەکانی سەبارەت بەهاوسەرگیری نامە بنووسن بۆ دوکتۆر پاول نیئۆ، سەر نووسەر، ڕێکخراوە پێوەندییە خێزانیەکانی ئامریکایی، شەقامی سانست (٥٢٨٧)لۆس ئەنجلۆس، کالیفۆرنیا.

## چونکە نەمدەزانی چۆن پشوو بدەم بەرەبەرە خۆمم بەکوشت ئەدا.

نووسینی: پاوڵ سپەمسۆن

هەتا شەش مانگ لەمەوبەر ژیانێکی خێرام هەبوو. هەمیشە عەسەبی بووم و هەرگیز ئۆقرەییم نەبوو. هەموو شەوێک نیگەران و شەکەت لەسەرکار دەگەڕامەوە. بۆچی؟ چونکە هیچ کەس هەرگیز بەمنی نەوت: ((پاوڵ، خەریکی خۆت دەکوژی. بۆچی ئەوەندە بە پەلە دەڕۆی؟ بۆچی پشوویەک نادەیت؟))

بە پەلە لەخەو هەڵدەستام، بە پەلە ناشتام دەخوارد، بە پەلە ڕیشم دەتاشی و بە پەلە جلم لەبەر دەکردو ئەوەندە بە پەلە بەرەو شوێنی کاردەکەم شۆفێریم دەکرد کە دەتگوت سوکانەکە لەپەنجەرەوە هەڵدێت ئەگەر توند نەیگرم. بە پەلە دەهاتمەوە بۆ ماڵەوەو هەوڵم ئەدا بە پەلە بخەوم.

لەوەها وەزعێکی خراپدا بووم کە بۆ بینینی پزیشکێکی پسپۆڕی مێشکی بەناوبانگ چووم بۆ دیترۆیت. ئەو بەمنی وت ئارام بم (لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو شتانەی لەبابەتی دووەم لەبەشی ٧ی کتێبەکەدا هاتبوو بەمنی وت)). ئەو بەمنی وت هەمیشە بیر لەئارامی بکەمەوە. کاتێک کار دەکەم، کاتێک شۆفێری دەکەم، نان دەخۆم و دەمەوێ بخەوم. ئەو بەمنی وت خەریکە خۆم دەکوژم چونکە نازانم چۆن ئۆقرەیی بگرم. لەو کاتە بەدواوە کەوتمە ڕاهێنانی حەسانەوەو ئۆقرەیی. کاتێک شەوانە دەچمە ناو جێگە تا کاتێک خۆ ویستانە هەموو لەشم ئارام نەکردووەتەوەو هەناسەدانم ڕێک نەخستووە هەوڵ نادەم بخەوم. ئێستا بەیانیان بەئارامی لەخەو هەڵدەستم. کارێکی گەورەیە چونکە لەوە پێش شەکەت و عەسەبی لەخەو هەڵدەستام. ئێستا کاتێک

ئۆتۆمبێل لێدەخورم‌و نان دەخۆم ئارامم. ئێستا لەکاتی شۆفێریدا هۆشیارم چونکە بە مێشکم شۆفێری دەکەم نەك بە عەسابم. گرنگترین شوێنێك ئۆقرەیی تیا دەگرم شوێنی کارەکەمە. لەڕۆژدا چەندین جار دەست لەکارەکەم هەڵدەگرم‌و دەکەومە گەڕان لەدەروونمدا هەتا بزانم ئۆقرەییم هەیە یان نا. کاتێك تەلەفون لێدەدرێت چیتر بە پەلە هەڵیناگرم‌و کاتێك قسە لەگەڵ کەسێك دەکەم بەئەندازەی مناڵێك کە دەخەوێت ئارامم.

ئەنجام؟ ژیان خۆشترەو من تەواو لەدەستی شەکەتی‌و فشاری عەسەبی ڕزگار بووم.

## موعجیزەیەکی ڕاستەقینە ڕوویدا بۆ من

**نووسینی: خاتوو جان بێرگێر**

نیگەرانی بەسەر مندا زاڵ ببوو. مێشکم هێندە گێژوو سەر لێشێواو بوو کە هیچ چێژێکم لەژیان نەدەبینی. مێشکم هێندە لەژێر فشاردا بوو کە نەشەوانە دەمتوانی بخەوم‌و نە ڕۆژ ئۆقرەییم هەبوو سێ منداڵەکەم تەواو جیا بوونەوەو لەگەڵ خزم‌و کەسدا دەژیان. مێردەکەم کە تازە بە تازە لەسەربازی گەڕابووەوە لەشارێکی تر خەریکی کاری یاسایی بوو. تەواوی نائەمنی‌و نادڵنیاییەکانی دەورانی بەشێوەی پاش شەڕم هەست پێدەکرد.

کولەمەرگی هەرەشەی لەوەزعی مێردەکەم دەکرد‌و منداڵەکانمی لەهەبوونی نیعمەتی ژیانێکی چاك‌و شادی خێزانی‌و ژیانی خۆیشمی گرتبووە بەر هەڕەشە. مێردەکەم خانووی دەست نەدەکەوت‌و تەنیا ڕێگە چارە ئەوە بوو کە خانوو دروست کەین. هەموو شتێك پەیوەندی بە چاك بوونەوەی من بوو. هەرچی زیاتر ئاگاداری ئەم وەزعە دەبووم‌و زیاتر هەوڵم ئەدا ترسم لەشکست زیاتر دەبوو. هەستم دەکرد ئیتر ناتوانم بڕوابکەم. هەستم دەکرد دۆڕانێکی تەواوم هەبووە. کاتێك هەموو شتێك تاریك بوو، هیچ یارمەتیەك نەدەبینرا دایکم کارێکی بۆ ئونجام دام کە هەرگیز فەرامۆشی ناکەم‌و هەمیشە سوپاس گوزاری دەبم. منی بە شەڕو بەرەنگار بوونەوە ڕاچڵەکاند. ئەو منی بەهۆی تەسلیم بوون‌و لەدەستدانی کۆنترۆڵی مێشکم سەر زەنشت کرد. ئەو منی ناچار کرد لەجێگەوبان بێمە دەرو هەرچی لەتوانامدا بوو شەڕ بکەم. ئەو وتی

منی تەسلیمی وەزعەکە بووم‌و لەجیاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی لێی ترساوم‌و لەجیاتی ژیان کردن لەدەستی هەڵهاتووم.

کەواتە ئەو ڕۆژە دەستم کرد بە شەڕ. هەر ئەو کۆتایی حەفتەیە بەدایکم‌و باوکم وت دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان، چونکە خۆم دەرەقەتی وەزعەکە دێم‌و کارێکم کرد کە ئەستەم دەهاتەپێش چاو. لەماڵەوە بەتەنیا مامەوە هەتا ئاگاداری لەدوو منداڵە بچووکترەکانم بکەم. باش خەوتم‌و دەستم کرد بە باش نان خواردن‌و ورەم بەرەو باشبوون چوو. یەك حەفتە دوای ئەوە کە هاتن بۆ دیدەنیم، بینیان کە لەکاتی ئوتو کردندا خەریکی گۆرانی وتنم . هەستێکی باشم هەبوو، چونکە دەستم کردبوو بە شەڕ کردن‌و خەریك بووم سەردەکەوتم. هەرگیز ئەم دەرسە فەرامۆش ناکەم کە ئەگەر وەزعێك ئەستەم هاتە پێش چاو بەرەو ڕووی ببنەوە! خەبات بکەن! خۆ بەدەستەوە مەدەن! لەو کاتە بەدواوە خۆم ناچار بە کارکردن دەکردو لەکاردا نوقم دەبووم. سەرەنجام منداڵەکانم کۆکردەوەو لەخانووە نوێکەمان پەیوەستی مێردەکەم بووینەوە. بۆم دەرکەوت دەبێ ئەوەندە چاکبم کە دایکێکی بەهێزو خۆشەویست ببەخشم بەخێزانەکەم. خۆم لەسەر بەرنامەکانی ماڵەوە کۆکردەوە، بەرنامەی منداڵەکانم، هاوسەرەکەم، هەموو شتێك بێجگە لەخۆم. ئەوەندە سەر گەرم بووم کە کاتی بیرکردنەوە لەخۆمم نەبوو. ئەو کاتە بوو کە موعجیزەی ڕاستەقینە ڕوویدا. بەهێزو بەهێز تر بووم‌و چێژ تەندروست بوون، چێژ بەرنامە داڕشتن بۆ ڕۆژی داهاتوو و چێژی ژیان کردن لەخەو هەڵدەستام. سەرەڕای ئەوەی بە ڕۆژانی خەمۆکی جار جار دەهاتەوە یادم بەتایبەت کاتێك ماندوو دەبووم، بەخۆمم دەوت بیر لەوانە مەکەرەوەو هەولم ئەدا بیر لەو ڕۆژانە نەکەمەوەو بەرەبەرە ئەم وەزعە باشترو باشتر بوو تا ڕۆژێك کە تەواو کۆتایی پێهات.

ئێستا لەپاش یەك ساڵ هاوسەرێکی زۆر شادو سەرکەوتوو، خانوویەکی جوانم هەیە کە لەڕۆژدا (١٦) کاتژمێر کاری تیا دەکەم‌و سێ منداڵی شادو تەندروست بۆ خۆیشم ئۆقرەیی مێشکم هەیە.



 

# چۆن بینجامین فرانکلین بەسەر نیگەرانیدا زاڵ بوو؟

نامەیەک لەبینجامین فرانکلین بۆ جۆزێف پریستلی. کەسی دووەم بۆ فەرمانبەری کتێبخانەی ئێرل شێلبۆرن بانگهێشت کراو داوای ڕێنوێنی لەفرانکلین خواست. فرانکلین لەنامەکەیدا شێوەکانی چارەسەری کێشە بەبێ نیگەرانی باس دەکات.

*لیئۆن، ١٩ی سپتەمبەری ١٧٧٢*

بەڕێز: سەرەڕای هەموو ئەو گرنگیەی بە ئێوەی ئەدەم لەبەر پرسینی ڕای من، ناتوانم بەتۆ بڵێم چ بڕیارێك بدەیت، بەڵام ئەگەر پێت خۆشە پێت دەڵێم چۆن. کاتێك ئەم کێشانە دروست دەبن ئەوان سەختو دژوارن، تەنیا بەو هۆیەی ئێمە گرنگیان پێ ئەدەینو تەواوی خاڵە لاوازو بەهێزەکان لەو کاتەدا لەمێشکی ئێمەدا نین بەڵام جاری وا هەیە هەندێك هۆکار خۆیان پیشان ئەدەنو جاری وا هەیە هۆکاری تر خۆیان دەنوێنن کاتێك هۆکارەکانی یەکەم نابینرێن. بەو هۆیەوە جاری وا هەیە هۆکارو حەزی جۆراوجۆر زاڵ دەبنو نەبوونی دڵنیایی ئێمە گێژو سەر لێ شێواو دەکات.

بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە شێوازی من بەم جۆرەیە. کاغەزێك بەهێڵێك دەکەم بە دوو بەشەوە. لەسەرووی یەکیانەوە خاڵە لاوازەکانو ئەوی تر خاڵە بەهێزەکان دەنووسم. پاشان لەماوەی سێ چوار ڕۆژدا لەژێر هەر کامیاندا چەند حاڵەت کە لەکاتە جۆراوجۆرەکاندا ڕوویان داوە دەینووسم. کاتێك هەموویانم کۆکردەوە هەوڵ ئەدەم هاوسەنگیان هەڵبسەنگێنمو هەر شوێنێك دوودانەی یەکسانم بینی (یەکێك لەهەر دوو لایاندا) ئەیانسڕمەوە. ئەگەر لەشوێنێك یەك هۆکاری ئەکتیڤم بەرامبەر دوو خاڵی نیگەتیڤ بینی هەر سێکیان خەت لێ ئەدەم. ئەگەر دوو هۆکاری دژ لەگەڵ (٣) هۆکاری هاوڕا پێکەوە هەڵبسەنگێنم هەر پێنجیان دەسڕمەوەو هەروا کە دەچمە پێشەوە هاوسەنگی دەبینمو ئەگەر لەپاش یەك دوو ڕۆژ هیچ شتێکی گرنگ ڕوونەدات

بڕیار ئەدەمو بەهۆی ئەوەوە کە قورسایی هۆکارەکان بە پێودانگی جەبری هەڵدەسەنگێندرێت بەو حاڵەوە کاتێك هەر کامیان بەجیا هەڵبسەنگێنین پێموایە باشتر بتوانین حوکم بدەینو هەنگاوێکی خێرا هەڵگرین. لەڕاستیدا من لەو یەکسانیە کە ((جەبری ئەخلاقی یان هەڵواسراو بە پارێز)) ناو دەبرێت سوودی زۆرم بینیوە.

هیوادارم باشترین بڕیار وەرگریت هاوڕێی من. هەمیشە ئامادەم بۆ خزمەت

*بینجامین فرانکلین*

## هێندە نیگەران بووم کە هەژدە ڕۆژ خواردنم نەخوارد

**نووسینی: کیترین هول کەمب فارمەر**

سێ مانگ لەمەوبەر هێندە نیگەران بووم کە چوار شەوو ڕۆژ نەخەوتمو هەژدە ڕۆژ هیچم نەخوارد. تەنانەت بۆنی خواردن تێکی ئەدام. ناتوانم ئەو ڕەنجە مێشکیەی کێشام بیهێنمە سەر زمان. نازانم ئایا لەدۆزەخیش ئەشکەنجەیەك لەوە خراپتر هەیە کە من بینیم یان نا؟ هەستم دەکرد یان شێت دەبم یان دەمرم. دەمزانی کە ئاوا ناتوانم درێژە بە ژیان بدەم. خاڵی وەرچەرخانی ژیانی من ڕۆژێك بوو کە دانەیەك لەم کتێبەیان دابەمن. لەماوەی سێ مانگی ڕابردوودا من بەکردەوە لەگەڵ ئەم کتێبەدا ژیامو بێ هیوایانە هەوڵم بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەك بۆژیانم داوە. گۆڕانێك کە لەڕوانگەی مێشکیو پایەداری سۆز لەمندا بەجۆرێك ڕوویدا کە لەوانەیە بڕوام پێنەکەن. ئێستا دەتوانم کێشەکانی ڕۆژانە تەحەممول بکەم. ئێستا دەزانم کە لەڕابردوودا نەك لەبەر کێشەکانی ئەمڕۆ، بەڵکو بەو تاڵیو نیگەرانیەی لەبەرشتێك کە دوێنێ ڕوویداوە یان لەوانەیە بەیانی ڕووبدات نیوە شێت دەبووم.

بەڵام ئێستا هەر کە دەبینم نیگەرانیم بۆ هەر شتێك دەست پێدەکات خێرا یەکێك لەو بنەمایانە دەگرمە بەر کە لەم کتێبەوە فێر بووم. ئەگەر بۆ کارێك کە دەبێ ئەمڕۆ ئەنجام بدرێت عەسەبی دەبم خێرا ئەوە ئەنجام ئەدەمو مێشکمی لێ پاك دەکەمەوە. کاتێك ڕووبەڕووی کێشەیەك دەبمەوە کە من شێت دەکات بەئارامی یەکێك لەو سێ

هەنگاوەی لەبابەتی دووەمی بەشی یەکەمدا هاتووە بەکار دەهێنم. سەرەتا پرسیار لەخۆم دەکەم خراپترین شتێك کە لەوانەیە ڕووبدات چیە؟ دووەم، بە مێشکم وەری دەگرم. سێیەم، مێشکم لەسەر کێشەکە کۆدەکەمەوەو دەبینم کە چۆن دەتوانم ئەم وەزعە خراپە وەربگرم، کە ناچارم باشتری بکەم. کاتێك نیگەرانی شتێك دەبم کە ناتوانم بیگۆڕمو نامەوێ وەریبگرم، ئەم دۆعا کورتە لەبەر خۆمەوە دەڵێمەوە:

((خودا سەبری بەمندا هەتا شتانێك کە ناتوانم بیگۆڕم وەریبگرم. هێزی پێ دام هەتا شتانێك کە دەتوانم، بیگۆڕم. عەقڵیشی پێدام بۆ دیاری کردنی چاکەو خراپە)).

لەکاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە ژیانێکی پڕ شکۆو نوێم گوزەراندووە. چیتر شادمانیو تەندروستیم بە نیگەرانی لەناو نابەم. ئێستا شەوانە (٩) کاتژمێر دەخەومو چێژ لەخواردن وەردەگرم. دەمامکێك لەسەر ڕوخسارم لاچووەو دەرگایەك بە ڕوومدا کراوەتەوە. ئێستا دەتوانم جوانیو چێژی دنیایەك کە دەورمی گرتووە ببینم. سوپاس گوزاری خوداو نیعمەتی ژیانم لەوەها دنیایەکی سەر سوورهێنەردا.

بە ئێوەش دەڵێم ئەم کتێبە بخوێننەوەو لەپەنای جێگەو بانەکەتاندا هەڵیگرنو هێڵێك بە ژێر ئەو حاڵەتانەدا بێنن کە ئێوەش هەتانە. بیخوێننەوەو پەیڕەوی بکەن. چونکە ئەمە تەنیا کتێبێك بۆ خوێندنەوە نیە بەڵکو کتێبێکی ڕێنمایە بۆ دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ.

کۆتایی











## خوێنەری هێژا

من بڕوام هەیەو هەست دەکەم بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە هێزێکی نوێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی گرفتەکانی ژیان لە خۆتاندا هەست پێدەکەن‌و ژیان بەتەواوی نیشانەکانییەوە بەشێوەیەکی نوێ بەرچاوتان دەکەوێت.

ئێوە بەرەو باروەدۆخێك هان ئەدات کە دەڵێی تازە لە دایك بوون‌و توانای ئەوەتان هەیە بە نیگەرانی بڵێن: بووەستەو! چێژی ژیان هەست پێبکەن. کەواتە تا دەتوانن ئەم کتێبە بە وردی بخوێننەوە، لەوانەیە تەواو بۆتان نەیەتە پێش، بەڵام بە سوود دەبێت‌و پێشنیار دەکەم بۆ کەسانی تریشی بکەنە دیاری.

دیل کارنگی



لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (6000) دینار